# دیموکراسیی ڕاوێژگەری



لە فەلسەفەی سیاسیی

یورگن هابرماس دا

ئیدریس شێخ شەرەفی

# دیموكراسیی راوێژگەری
# لە فەلسەفەی سیاسیی (یۆرگن هابرماس)دا

ئیدریس شێخ شەرەف




## خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

- **دیموکراسیی راوێژگەری لە فەلسەفەی سیاسیی (یۆرگن هابرماس)دا**
- **نووسینی: ئیدریس شێخ شەرەفی**
- **وەرگێڕانی:** گۆران جەمال رواندزی
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال رواندزی
- **بەرگ:** نادر خەیاتی
- **نرخ:** ٣٥٠٠ دینار
- **چاپی یەکەم ٢٠١٣**
- **تیراژ:** ١٠٠٠ دانە
- **چاپخانە:** موکریانی (هەولێر)
- **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی(٦١٠)ی ساڵی (٢٠١٢) پێدراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٧١٠)**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# پێشەکی

دیموکراسی وەك چەمکێکی فەلسەفەی سیاسی و سیستەمێکی حوکمڕانی، پاش هەرەس هێنانی ئایدۆلۆژیا گەورە و هزرە تۆتالیتێرەکان کە وەك حەتمیەتی مێژوویی مژدەی رزگاری مرۆڤایەتیان دەدا، جارێکی تر لەسەردەمی بەجیهانی بوون دا گرنگی وبایەخی خۆی بەدەست دێنێتەوە. ئەمڕۆ، کەم سیستەمی سیاسی هەیە کە وەك پێوەرێك بۆ شەرعیەتی خۆی یان مەشروعیەتی بڕیار و سیاسەتەکانی لانیکەم ئەگەر لەڕووی شکلیشەوە بوو بێت، بانگەشەی دیموکراتی بوون نەکات. دیموکراسی بەبەراورد لەگەڵ سیستەمە سیاسی و کلتورییەکانی تر توانیویەتی گرفتێکی جەوهەریی ژیانی مرۆڤایەتی واتە پەیوەندی نێوان دەسەلاٚتدار و ژێردەستە و شێوازی دابەشکردنەوەی سامان لە لایەك و بایەخدان بە بەها سەرەکیەکانی مرۆڤبوون، واتە کەرامەت و ماف و ئازادی و لەوێشەوە یەکسانی و دادپەروەری، وەك کۆمەڵێك ئایدیا بکات بە حەقیقەت و لەسەر ئەرزی واقع و لە شوێنکاتی جودا، تاڕادیەکی بەرچاو پیادەیان بکات، کە مرۆڤ لە رەوتی مێژوودا ویستویەتی بە بەکارهێنای میتۆدی جیاواز بەدیان بێنێت.

کلتوری دیموکراسی کە خۆی لە هـزری ناتوندوتیـژی و لێبـووردەیی وئـازادی و قبـوڵ کردنی جیاوازی دا دەبینێتەوە، وای کردووە رێگا چـارەی گونجـاو بـۆ کێشـەی سـەرەکی مرۆڤایەتی واتـە "کێشـەی دەسـەلآت" بدۆزێتـەوە، ئـالۆوێری ئاشـتیانەی دەسـەلآت و پاراستنی تاك لە هەموو هێزێکی ناچارکار بۆتە بەشێك لە رووکاری دیموکراسـی، بـەلآم ئەمە بەو مانایە نییە کە فەلسەفەی ئـەم بیرۆکـە و میکانیزمـە و بەتایبـەتی مـۆدێلی بالآدەستی لیبرال دیموکراسی بەدەرە لە کەموکوڕی.

هەربۆیە لەدرێژەی هەوڵدان بۆ ریفۆرم لەدیموکراسی و رزگاربوون لە هەنـدێ کێشـەی قوڵ کە بەرۆکی بەشێکی زۆری کۆمەڵگا پێشکەوتووەکانی گرتووە، ئاراستەیەکی نوێ لە هزری سیاسی سەری هەڵدا کە "***بەدیموکراسی راوێژگەری***"[1] ناوزەد دەکرێت و لەم نێوە دا فەیلەسوفی ئەڵمانی (***یورگن هابرماس***)[2] بە گەورەترین تیۆریسیەن دادەنرێت. لە روانگەی هابرماسەوە، مۆدێلی کارپێکراو و هەنووکەیی دیموکراسـی لیـبراڵ زیـاتر فۆرمالیەتـەی دیموکراسیە و پێویستە لە زۆر رووەوە ریفۆرمی سەرەکی تێدا ئەنجام بـدرێت، بەتایبـەتی سەبارەت بە پرسی دروست بوونی را و ئیرادەی هاوولآتیان و جـۆر و رادەی بەشـداری لـە پرۆسسی سیاسی دا. بۆ ئەوەی تاکەکان تەنیا رۆڵی چەپڵەلێدان و هەڵهەلەیان پێ نەبرێت، دەبێت خۆیان رۆڵی ئەکتیڤیان هەبێت لە دارشتنی یاسا بۆخۆیان و ئەمـەش لـە رێگـای کۆمەڵێك میتۆد و رێکاری (الأجراءات) پێشنیار کـراو کـە دەتوانێـت دیموکراسـی لـەم تەنگژەیە رزگار بکات. کەواتە بە شێوەیەکی سەرەکی دیموکراسی راوێژگـەرا لـە رێگـای راستکردنەوەی هـەردوو مـۆدێلی پاراسـتنگەرایی و گەشـەگەرایی کـە خۆیـان بنـەمای دیموکراسی لیبرالی و کۆمارییێن و بە پشت بەستن بە فەلسەفەی نێوانخـودی و عەقلآنیـەتی پەیوەندیکاری و تیۆری رەخنەیی و پانتایی گشتی هابرماس و لەوێشەوە ئەخلاقی گفتوگۆ

---

١ . زاراوەی (راوێژگەری) مان لەجیاتی Deliberative ئینگلیزی و "التشاورية" و هەندێ جار "التداولية"عەرەبی بەکار هێناوە کە جیاوازە لە راوێژکاری کە لەرووی ناوەرۆك و فەلسەفەوە تەواو پێچەوانەی یەکترن.

٢ . Jürgen Habermas لە زمانی عەرەبی دا بە یورجین هابرماس، یورغن هابرماس، یورجن هبرماس و یورغن هابرماز دەنوسرێت، و لە زمانی فارسی و کوردیش دا یورگن هابرماس یان هابەرماس بەکاردێت.

و ڕێکاری یاسایی دێتە ئارا. بەم چەشنە دیموکراسی ڕاوێژگەری لە ناو کۆمەڵگای مەدەنی و پانتایی گشتی دا وەك بوارێکی ڕەخنەیی- عەقلانی و بەشێکی سەربەخۆ لە دەوڵەت، دەرفەت بە هەموو تاکە ئازاد و یەکسانەکان دەدات کە دەکەونە ژێر کاریگەری بڕیار و سیاسەتەکانەوە ئەوا دەنگ و ئیرادەیان کاریگەری هەبێت. لە دیدی هابرماسەوە لەم پرۆسەی ڕاوێژ و ڕاگۆڕینەوەیە دا، تەنیا پێوەر بو دروستی بانگەشەی نۆرم یان بەهایەك ***باشترین ئەرگۆمێنتە*** و هەر ئەمە دەبێتە یەکێك لە بنچینەکانی دروست کردنی دەوڵەتی ماف و یاسای دیموکراتی کە هابرماس وەك بەشێك لە پرۆژەی فەلسەفی سیاسی خۆی داکۆکی لێدەکات، ئەمەش دەشێت جڤاکێکی خاڵی لە هەموو جۆرە توندتیژی و زۆرەملێیەکی لێ بکەوێتەوە، بە پشت بەستن بەتیۆری ***ئەخلاقیەتی گفتوگۆ*** وەك بەشێك لە ئەخلاقی سیاسەتی ڕاوێژگەری کە پێویستە ڕۆڵی هەبێت لە هێنانەئارای ڕەوشی ئایدیالی قسە کە دۆخێکە بێ هیچ هەژموونێکی دەسەلات و شێواندنێك گفتوگۆکاران دەتوانن بەهۆی کارلێك و پەیوەندیکارییەوە بیروڕا بگۆڕنەوە.

کەواتە دیموکراسی ڕاوێژگەری وێنای کۆمەڵگایەك دەکات کە کردەی پەیوەندیکاری بە جیاواز لە مۆدێلەکانی تری کردەوە وەك، کردە ستراتیژی ئامانجدار کە تەنیا مەبەستی سەرکەوتنە یان کردەی نمایشی یان کردەی ڕێکخستنی نۆرماتیڤ، فۆرمێکی دیموکراتیانەی پەیوەندیکاری دەخاتەڕوو کە لە هەڵی لێك تێگەیشتن و دەرك کردنی یەکتر و کۆدەنگی دایە و تاك لە ڕێگای کارلێك و داننان بە ئەویتر، ڕێز لە ماف و ئازادییەکانی بەرانبەر دەگرێت و ئەمە پرۆسێکی تەواوکارییە لە پێناو دروست کردنی شوناسێکی ئەوتۆی جڤاکی کە دوور بێت لە دەمارگرژی ئەتنی و ئایینی و کلتوری و خزمەت بە یەکانگیری (الأندماج) وسۆلیدارێتی کۆمەلایەتی بکات و لە چوارچێوەی یاساکان دا ڕەنگ بداتەوە. هابرماس سەبارەت بەدەوڵەتی نەتەوە کە فۆرمی دەوڵەتی مۆدێرنە، پێیوایە ئەم مۆدێلە بەرەو لاوازی چووە و کۆمەڵێك کێشە سیاسی و کۆمەلایەتی و ئەخلاقی ئێستا لە ئارادایە کە سنووری ئەم یەکە سیاسی و کارگێڕییە دەبڕێت و ڕەهەندێکی گەردوونی وەرگرتووە، هەربۆیە پێشنیاری ئەفراندنی ئەخلاقیاتێکی یونیڤێرساڵ دەکات کە بێ ئەوەی بخزێتە ناو چوارچێوەی میتافیزیکی، بتوانێ خاوەن مسداقیەتێکی

گشتگیر بێت، ئەمەش تەنیا لە ڕێگای گفتوگۆیەکی کراو و بەردەوام دەبێت کە باشترین بەڵگەکان بۆ چارەسەر بخرێنەڕوو، کە دواجار گوزارشت بێت لە ئەخلاقێکی گەردوونی کە بەرژەوەندی هەموو مرۆڤەکانی تێدا پارێزراو بێت. لە رووی سیاسیشەوە داوای دروست کردنی فۆرمێکی بان نەتەوەیی دەکات کە بەشێك لە شەرعیەتی خۆی لە پرەنسیپە گەردوونیەکانی مافی مرۆڤ وەربگرێت و لە ئاستی هەرێمایەتی یان جیهانی دا خاوەن سەلاحیاتی کردەیی بێت.

# باسی یەکەم
# چاوگ و چەمکی دیموکراسی

لە ناو ئایدیا و فۆرمە جیاوازەکانی حوکمڕانی دا، ئەگەر رای خەڵك و بەشداری و رەزامەندی زۆرینەی هاووڵاتیان یان ئەوانەی دەکەونە ژێر کاریگەری پرۆسسی سیاسیەوە ئامانج و پێوەری فەرمانڕەوایی بێت، پێدەچێت دیموکراسی* شیاوترین و گونجاوترین فۆرمی حوکمڕانی بێت. بەڵام ئایا دەتوانین ئەرگۆمێنت و پاساوی عەقلانی بۆ شەرعیەتی سیستەمی دیموکراتی بێنینەوە و «بەپشت بەستن بە بنەمای عەقلانی ئەوە بسەلمێنین کە فۆرمی حکومەتی دیموکراتی لە فۆرمەکانی تری حوکمڕانی باشترە؟»[3] دەتوانین بڵێین دیموکراسی دەریخستوە کە بە پێچەوانەی شێوازەکانی تری حوکمڕانی، یەکێکە لە سیستەمە سیاسییە کاریگەرەکان کە بێ توندوتیژی و بێ ئەوەی "نەزم" تێك بچێت و "سیستەم" بڕوخێت، دەتوانێ لە رێگای دەنگ و ئیرادەوە گۆڕانکاری هەنگاو بە هەنگاو بێنێتەئارا.

وەك فۆرمێکی سیاسی هەر لەسەرەتای سەرهەڵدانی ئەم مۆدێلەی حوکمڕانییەوە، لە لایەن هەندێ لە تەوژم و فەیلوسەفەکان دژایەتی کراوە و رەخنە لە بونیاد و ئەرك و بەرەنجامەکانی گیراوە، هەڵبەتە بەشێکیان بە پشت بەستن بە رەخنەی لۆژیکی و ئەرگۆمێنت و بەشێکیشیان بەمەبەستی پاساوهێنانەوە بۆ سیستەمە تۆتالیتار و دەسەڵاتخوازەکان. بەڕای (دەیڤید هیڵد) ئەمڕۆ دیموکراسی تەنیا رەگی لە رۆژئاوا دانەکوتاوە، بەڵکو بووە بە فۆرمێکی جیهانی و وەك

---

* دیموکراسی demokratia زاراوەیەکی یۆنانییە و لە دوو بەشی دیمۆس demos (گەل) و کراتۆس kratos (حوکمڕانی) پێك هاتووە، کەواتە لە بنەڕەت دا بەمانای سیستەمێکی سیاسیە کە تێیدا گەل حوکمڕانی دەکات، نەك پاشا و ئەرستۆکراتەکان. آنتونی گیدنز، جامعەشناسی ، ت: منوچهر صبوری، نشر نی ، چ ١٦، تهران، ١٣٨٥(٢٠٠٦)، ل٣٤٢.

٣ . جون ر. بورر و میلتون جولدینجر (جمعها)، الفلسفة و قضایا العصر، ت: د.احمد حمدی محمود، الجزءالثاني،الهیئة المصریة العامة للکتاب، القاهرة، ١٩٩٠، ل٨.

مۆدێلێکی گونجاو بـۆ حـوکمڕانی و پێـوەرێکی سـەرەکی بـۆ مەشـروعیەتی سیاسـی سـەیر دەکرێت.[٤] کەواتە دەتوانیین بڵێین بەشی هەرەزۆری وڵاتانی جیهان بەبێ وەبەرچاوگرتنی روانگە سیاسی و ئابووری و ئایینیەکان بانگەشـەی دیموکراسـی دەکـەن. لـەم وڵاتانـە دا دیموکراسـی فەزایەکی ئەوتۆی لە شەرعیەت دروست کردووە کە دەتوانن هـەموو سیاسـەت و بڕیارەکـانی خۆیان بە دادپەروەرانە و رەوا لەقەڵـەم بـدەن.[٥] بـەم جـۆرە ئێسـتا دیموکراسـی وەك شـێوازی حوکمڕانی و کلتووری سیاسی و کۆمەڵایەتی، مـۆدێلێکی ئەوتۆیـە کـە تەنانـەت حکومەتـە دیکتاتۆرەکانیش ئەگەر لە رووی شکلیشەوە بێت خۆیانی پێدەناسێنن و لە راسـتی دا ئەمـە «پەیوەندی بەجازبیەتی سروشتی ئایدیا دیموکراتیەکانەوە هەیە کە مژدەی دەرچوون لە هەموو کۆتوبەندێکی دەسەڵاتی ستەمکارانە دەدات»[٦] و فاکتەرێکە بۆ یـەکانگیری و یەکیـەتی نـاو کۆمەڵگا پلۆرالەکان و لە چوارچێوی سیستەمی سیاسی دا بنەمایەك بۆ رەزامەندی زۆرینـەی دانیشتوان و رێزگرتن لە کەمینە دێتەئارا. دەتوانین بڵێین ناوەرۆك وبایەخی بیرۆکەی دیموکراسی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە هەموو بڕیارێکی سیاسی کە پەیوەندی بە چارەنووسی هەموو تاکێکی کۆمەڵگاوە هەیە دەخرێتە بەردەم تاکەکان، سیستەمی دیموکراتی زیانەکانی سیاسەتی هەڵە و تاکڕەوی کەم دەکاتەوە و بوار بۆ زۆرتـرین بۆچـوون دەڕەخسـێنێت لـە چوارچـێوەی دەرفـەتی یەکسان و یاسای دادپەروەرانە و بەشدارییەکی ئازاد دا و لە بنەڕەت دا فرەیـی وەك سـامانی نەتەوەیی و دەوڵەمەندی کلتوریی و ژیاریی لێك دەداتەوە. (ئالان تۆرین) پێیوایە «دیموکراسی سەرکەوتنی بەدەست هێناوە و ئەمڕۆ وا خۆی دەسـەپێنێ کـە شـکلی سروشـتی رێکخسـتنی سیاسیە و سیمای سیاسی مۆدێرنیتەیە کە ئابووری بازاڕ فۆرمـە ئابووریەکـەی و عەلمانیـەت تەعبیرە کلتورییەکەیەتی».[٧] وەك دیـارە لـە جیهـانی ئـەمڕۆ دا دیموکراسـی وێـڕای هەنـدێ چەمکی تری وەك مافـەکانی مـرۆڤ و دادپـەروەری و یەکسـانی و ئـازادی کـە ئـەوانیش بـە

٤. دیفید هیلد، نماذج الدیموقراطیة، جزءان، ت: فاضل جتکر، معهد الدراسات الاستراتیجیة،بیروت-بغداد، ٢٠٠٦،ل٥.

٥. نصرالدین نانسی و حسین هرسیج، پوپر و دموکراسی، انتشارات مهر قائم، اصفهان، ١٣٨٤(٢٠٠٥)،ص٢٥.

٦. آنتونی گیدنز، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٤٥.

٧. آلان تورین، ماالدیمقراطیة ؟، ت: عبود کاسوحة، منشورات وزارة الثقافة، دمشق، ٢٠٠٠، ل ١١.

جەوهەری دیموکراسی دادەنرێن، بووە بە پێداویستیەکی گەردوونی، بەڵاّم سەرەتا بە پێویستی دەزانین ئاورێك لە مێژووی دێرینی ئەم چەمکە بدەینەوە کە بێگومان یۆنان زێدەکەیەتی.

**تەوەری یەکەم: سەرهەڵدانی دیموکراسی**

بە پێی ژێدەرەکانی مێژوو و هزری سیاسی هەندێ لە سیاسەتمەدارە دیارەکانی ئەسینا رۆڵی گەورەیان هەبووە لە قوڵ کردنەوەی رۆحی یەکسانیخوازی و دادپەروەری کە لە سیستەمی دیموکراتی دا دەردەکەوێت و لەم نێوە دا (سۆلۆن) و(کلایزتنس) و(پرکلیس) و (دیموکراتیوس) و(سوکرات) بەرچاوترینیان بوون کە (کارل پۆپەر) بە ***"ئەوەی مەزن"*** [8] ناوزەدیان دەکات.

ئەرستۆ ئاماژە بەوە دەکات کە پاش ئەوەی ریفۆرمەکانی (سۆلۆن)* لەساڵی ٥٩٤ پێش زایین بووە هۆی سەقامگیر کردنی دەزگا دیموکراتیەکانی دەوڵەت-شاری ئەسینا، سیستەمێکی حوکمڕانی نوێی داڕشت و هەندێ یاسای دانا و خەڵکی شار *citoyen* ی بەسەر چوار چین دا دابەش کرد و بڕیاری دا هەموو فەرمانڕەواکان لە رێگای تیروپشکەوە هەڵبژێردرێن وکۆیلایەتی هەڵوەشاندەوە و رێگای دا بە کرێکار و کۆیلەکان بەشداری لە کۆبوونەوەی گشتی (ئاسامبلێ) و دادگا گەورەکان(تریبونالەکان) بکەن، یاسایەکیشی دژی ئەو کەسانە دانا کە هەوڵی رووخاندنی دیموکراسی دەدەن.[9] پاش هەوڵەکانی سۆلۆن کە فۆڕمێکی بەرچاوی شارنشینیە، چاکسازییەکانی سیاسەتمەدارێکی وەك کلایزتنس* وای کرد پانتایی دەسەلاّتی سیاسی

---

٨. کارل پوپر، جامعه باز و دشمنان آن، ت: عزت الله فولادوند، انتشارات خوارزمی، چ٢، تهران،١٣٧٧(١٩٩٨) ، ل٦٧٥.

* . Solon(640پ.ز- ٥٦١پ.ز) یەکێك بووە لە حەکیمە گەورەکانی ئەسینا و لە ساڵی ٥٩٤پ.ز وەك داوەر Archon لە شەڕی نێوان ئەرستۆکرات و گوندنشینەکان لەسەر سامان، رۆڵی ناوبژیوانی گێڕاوە. منوچهر صالحی، دمکراسی و جامعه مدنی، انتشارات پژوهش ، هامبورگ،٢٠١٠، ل ٤٢١.

٩. ارسطو، اصول حکومت آتن، ٧-٢و ٣، ت:باستانی پاریزی، نشر علم، چ٤، تهران، ١٣٨٣(٢٠٠٤)،ل ٢٢تا٣٤.

* . kleisthenes ( ؟-؟ ) توانی لە ساڵی ٥١٠پ.ز هیپیاس بروخێنێ و لە ساڵی ٥٠٧پ.ز نەزمی فولۆن phylenordurung هێنایە ئارا کە بوو بە بناغەی دیموکراسی ئەسینای، هۆز بنەمای نەزمی فولون بوو کە بە پێی ئەمە هەموو هۆزێك دەبوایە خاوەن هەندێ مافی دیاریکراو بێت. منوچهر صالحی ، سەرچاوەی پێشوو،ل٤١٨.

ئەرستۆکراتەکان کەم بکرێتەوە کە سەرچاوەکەی بۆ سنووربەندی ڕەچەڵەك دەگەڕایەوە و بەم جۆرە بواری بۆ بەشداری ڕاستەوخۆی هاووڵاتیان لە ژیانی سیاسی دەوڵەت-شار دا فەراهەم کرد.[10] لە ریفۆرمەکەی سۆلۆن دا بازنەی بەشداری بەرفراوان کرایەوە و هەوڵی دا لەسەر بنەمای سیستەمێکی دیاریکراو مافەکان دیاری بکات، دیارە هەبوونی بڕی سامان و دارایی چینەکانی لە یەکتر جیا کردۆتەوە، بەڵام خاڵی گرنگ و بەرچاو ئەوەیە کە ئەمە بەیاسا ڕێکخراوە. ئەمانە زەمینەیەکی لەباریان رەخساند تا لە سەردەمی پرکلیس*دا دیموکراسی ڕاستەوخۆ دەستی پێکرد، کە پشتی بە رای زۆرینە و سەروەری یاسا دەبەست. پرکلیس بۆ داکۆکی لە دیموکراسی دەڵێت:

**حکومەتی ئێمە لایەنگری گشتە نەك ژمارەکی کەم هەر بۆیە بە *دیموکراسی* ناوزەد دەکرێت... سەبارەت بە سکاڵا تایبەتیەکان یاساکان هەموومان وەکیەك لە دادپەروەریەکی یەکسان بەهرەمەند دەکەن ... هەرچەندە رەنگە ژمارەیەکی کەم داهێنەری سیاسەتێك بن بەڵام ئێمە هەموومان دەتوانین حوکمی لەسەر بدەین.**[11]

بەم جۆرە سەرەتای یەکسان بوون لەبەردەم یاسایەك دا کە حکومەتی هەمووان دایدەڕێژێت و بەرفراوان کردنی چوارچێوەی بەشداری بە جۆرێك کە سنووری ڕەچەڵەك ببڕێت و حوکمدان و قسەکردن لەمەڕ سیاسەتی گشتی لە گرنگترین ریفۆرمەکانی پرکلیس بووە. بەرای (موشە فینلیٚ) لە دیموکراسی ئەسینی دا چەمکی ئیزیگۆریا *Isegoria* واتە مافی قسەکردن بۆ هەموو هاووڵاتیان، پارێزراو بووە و لەم دیموکراسیە ڕاستەوخۆ و بیٚ نوێنەرایەتیە دا هەموو هاووڵاتیەك ئازاد بووە بەشداری لە کۆبوونەوەی گشتی دا بکات، ئیزیگۆریا هاوواتای دیموکراسی بووە.[12]

---

١٠. هەمان سەرچاوە، ل ١١٧- ١١٩.

* Perikles (500 .پ.ز -٤٢٩ پ.ز) سەرکردەی باڵی دیموکراتی رادیکاڵ بووە و بۆ دابین کردنی مافە کۆمەڵایەتیەکانی توێژە دەستکورتەکان خەباتی کردووە و سەرەنجام توانیویەتی ١٤ ساڵ سەرکردایەتی سیاسی ئەسینا بەدەستەوە بگرێت. هەمان سەرچاوە، ل ٤١٨.

١١ . کارل پوپر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٩٨-٣٩٩.

١٢. وەرگیراوە لە پەراوێزی: ژان ژاك روسو، قرارداد اجتماعی- متن و در زمینە متن ، ژرار شومین، اندره سنیك، کلود مورالی، ژوزه مدینا، ت: مرتضی کلانتریان، مؤسسة انتشارات آگه، چ ٤، تهران، ١٣٨٥(٢٠٠٦)،ل ٣٧٨.

هەروەك ئاشكرایە لەم كۆبوونەوە گشتیانەی مەیدانی شار یان ئاگۆرا *Agora* دا هەموو بابەتیك دەخرایەڕوو، بەلاّم خالّی سەرەكی لە كۆی هەموو گفتوگۆ و راویّـژەكان "چـاكە یـان بەرژەوەنـدی گشتی" بوو، هەربۆیە (هیلّد) پیّیوایە «دیموكراسی ئەسینی نەخشیّنرابوو بە جۆریّك لـە پابەنـدی (التزام) گشتی بۆ پرەنسیپی مەدەنی یان ئەهلی: وەلائی بۆ شارە دەولّـەتی كۆمـاری و ملكـەچ كردنی ژیانی تایبەتی بۆ پیّداویستیەكانی كاروباری گشتی و چـاكەی هاوبـەش». [١٣] بـەم جـۆرە سەرەڕای ئازادی و لیّبووردەییی لە ژیانی تایبەتی دا و لە بـواری گشـتی دا شـانازی كـردن بـە یاساكان وا دەكات كە بەردەوام ژیانی گشتی شار ئەفزەلیەتی بەسەر ژیانی تایبـەتی دا هـەبیّت. بەلاّم بیّگومان دیموكراسی چ وەك بیرۆكە و چ وەك سیتەم لە رەخنەی توند بەدوور نەبووە، لیّرە دا بە كورتی ئاماژە بە روانگەی هەر دوو فەیلەسوفی گەورە (ئەفلاتون) و (ئەرسـتۆ) دەكـەین كـە هەولیّان داوە ئەم چەمكە بە بەراورد لەگەلّ مۆدیّلی ئایدیالی خۆیان هەلّبسەنگیّنن.

## تەوەری دووەم: دیموكراسی لەژیّر تیشكی رەخنەی ئەفلاتون و ئەرستۆ دا

### ١. ئەفلاتون *Plato*

ئەفلاتون بە یەكیّك لە نەیارەكانی دیموكراسی دادەنریّت، چونكە پیّیوایـە ئـەم سیسـتەمە رەسەنایەتی ناهیّلیّت و ئازادی دەكاتە بەهایەكی سەرەكی و وا لە تاكەكان دەكات خۆیـان لـە بەرپرسیاریّتی و یاسا بنەڕەتیەكان بەدوور بگرن و ئـەم سیسـتەمە لـە داڕوخـانی سیسـتەمی ئۆلیگاریشیەوە سەرهەلّدەدات و لەناو ئازادی رەها دا بەرەوە سـتەمكاری دەچیّت، لای ئـەو یەكەمین تایبەمەندی دیموكراسی ئەوەیە كە لە ژیّر سایەی دا هەموو خەلّك ئـازادن. دەولّـەت ئازادی كار و ئازادی گوفتـار بـۆ هـەمووان دابـین دەكـات و هـەموو كەسـیّك مـافی هەیـە هەرچییەكی دەویّت ئەنجامی بدات. ئەفلاتون لە كتیّبی (كۆمار) دا بـە توانجـەوە دیموكراسـی پەیوەست دەكات بە فرە حەزی و سەلیقەییەوە و هەربۆیە دەلّیّت: [١٤]

**<u>یەكەم</u> خسلّەتی دیموكراسی ئەوەیە كە جوانترین سیستەمی سیاسیە چونكە وەك جلی رەنگاوڕەنگ پڕە لە  نەخش و نیگار كـە هـەموو  خووخدەیـەكی**

---

١٣. دیفید هیلد، سەرچاوەی پیّشوو،ل ٣٣.

١٤. افلاطون، دوره اثار افلاطون، جمهوری، كتاب پنجم، ٥٥٧-٥٥٨، ت: محمد حسن لطفی، جلد ٢، شركت سهامی انتشارات خوارزمی،چ٣، تهران،١٣٨٠(٢٠٠١)، ل ١١١٣ تا ١١١٥.

**مرۆیی تێدا بەرچاو دەکەوێ. _دووەمین_ تایبەتمەندی دیموکراسی ئەوەیە کە هەموو کەسێك بۆ هەموو کاری[٧] ئازادی رەهای هەیە و هەموو جۆرە حکومەتەکانی تێدا کۆکراوەتەوە. سێیەمین خەسڵەتی دیموکراسی، بەرەڵایی رەهایە، چونکە هیچ کەس ناچار نییە ئەرکی سیاسی بەئەستۆوە بگرێت و _دوایین_ سیفەتی دیموکراسی ئازادگەراییە لە پەروەردە دا، کە گوێ بە پرنسیپە سەرەکییەکان نادات و بۆ پلە دەوڵەتیەکان بایەخ بە بژاردەکان نادەن و هەر ئەوەندە بەسە کە بانگەشەی ئەوە بکەن کە دۆستی جەماوەری خەڵکن.**

لە روانگەی ئەفلاتونەوە لە سیستەمی دیموکراتی دا تاك هەوڵ دەدات بەدوای حەزەکانی دا بڕوات و هیچ بنەمایەك بۆ دامەزراندنی سیستەمێکی عەقلانی بۆ ژیان بوونی نییە.[١٥]کەواتە لە دیدی ئەفلاتونەوە «دیموکراسی حکومەتێکە دڵگیر و ئەنارشی و رەنگاوڕەنگ کە یەکسانی هەم لە نێوان ئەوانەی کە یەکسانن و هەم لەنێوان ئەو کەسانەی کە یەکسان نین دەچەسپێنێ».[١٦] ئەفلاتون حکومەتی دیموکراسی لە ئەنارشیزم نزیك دەکاتەوە و پێیوایە تاکی دیموکرات نە لە دروونی دا هیچ نەزمێك فەرمانڕەوایە و نە لە ژیان دا پەیڕەوەی هیچ زەرورەتێك دەکات، واتە ناتوانێت جیاوازی بکات لە نێوان دۆخ و حاڵەتە گرنگ و بایەخدارەکان و شتە ناپێویستەکان. بە بڕوای ئەفلاتون «دیموکراسی بەهۆی زێدەرۆیی لەو شتەی کە لای خۆی بەنرخترین بەهای هەیە، واتە "ئازادی" بەرەو ستەمکاری و نەمان دەچێت».[١٧] کەواتە لە دیدی ئەفلاتونەوە گرفتی سەرەکی ئەم ئازادییە رەخساندنی یەکسانی رەهایە کە تاکەکانی کۆمەڵگا هیچ کۆتوبەندێك قبوڵ ناکەن و ملکەچی هیچ نەزمێك *Order* نابن و ئەمەش زەمینە گۆڕان بەرەو ستەمکاری دەڕەخسێنێت، چونکە هەموو کەسێك بێ جیاوازی ئازادە و بانگەشەی ئازادبوون دەکات و لەم نێوەش دا یاخیبوون لە یاسا وەك شتێکی شیاو و پەسند دەردەکەوێ.

---

١٥. ستيفن ديلو، التفکير السياسی و النظرية و المجتمع المدني ، ت: ربيع وهبة، مراجعة: علاء ابو زيد، المجلس الأعلى للثقافة، القاهرة، ٢٠٠٣، ل ١١٧.

١٦. افلاطون، جمهوری، کتاب هشتم، ٥٥٨، سەرچاوەی پێشوو، ل ١١١٥.

١٧. هەمان سەرچاوە، ٥٦٢، ل ١١٢١.

## ٢. ئەرستۆ *Aristoteles*

بە بەراورد لەگەڵ ئەفلاتون، ئەرستۆ کە حەقیقەتی لـە مامۆسـتاکەی خۆشـتر دەویسـت، روانگەی بۆ دیموکراسی جیاوازە، هەروەك ئاماژەی بۆ کرا لە تێڕوانینی ئەفلاتون سـەرهەڵدانی دیموکراسی لە ئەسڵ و چاوگێکی خراپەوە دێتـە ئـارا واتـە لـە ئۆلیگاریشـییەوە، بـەڵام لای ئەرستۆ ئەسڵ و بنەچەی دیموکراسی واتە حکومەتی کۆماری سەرچاوەیەکی رەسەن و دروستی حکومەت و مۆدێلی ئایدیالی ئەرستۆیە چونکە دەڵێت: «ئەو حکومەتەی کـە خێـر وچـاکەی هەمووانی دەوێت و بە دەستی زۆرینەوە بەڕێوە دەبرێت، خـاوەن ئـەو ناوەیـە کـە ناونیشـانی هاوبەشی هەموو جۆرە حکومەتەکان، واتە پۆلیتی (کۆماری)یە ».[١٨]

لای ئەرستۆ حکومەتی پاشایەتی و ئەریستۆکراسی و کۆماری چاکەی گشتییان لەبەر چاوە هەربۆیە دەکەونە ریزی سێ جۆری راستی حکومەتەوە. ئەم سێ جۆرە حکومەتە هەندێ جار لە سەر رێگای راسـت دەردەچـن و بـە لاڕێ دا دەڕۆن. حکومـەتی پاشـایەتی بـۆ سـتەمکاری *tyranny* ، ئەرستۆکراسی بۆ ئۆلیگاریشی و کۆماری بۆ دیموکراسـی دەگۆڕێـت. حکومـەتی تیرانی ئەوەیە کە بەرەو دابین کردنی بەرژەوەندی فەرمانڕواکان پەلکێش بکرێت، ئۆلیگاریشـی ئەوەیە کە تەنیا لە قازانجی دەوڵەمەندەکانە و دیموکراسی حکومەتێکـە کـە تـەنیا چـاوی لـە بەرژەوەندی هەژارەکانە و لەهیچ کام لەم جۆرە حکومەتانە دا هەوڵ نادرێت بـۆ دابـین کردنـی بەرژەوەندی گشتی.[١٩] بەم جۆرە ئەرستۆ پێنج جۆر دیموکراسی دەست نیشان دەکات:[٢٠]

> **یەکەم جۆری دیموکراسی بەناچار ئەوەیە کە لە هەموو جۆرەکانی دیکـە زیاتر لە [پرەنسیپی] یەکسانی نزیك بێت. لەم جۆرە دیموکراسـیە دا، یاسـا ئەفزەڵیەت ناداتە هەژارەکان بەسەر دەوڵەمەندەکان دا و هیچ کامێکیان بەسەر ئەویتریان دا بالادەست نییە، بەڵکو هەموویان بە یەکسان و هاوتـا لەقەڵـەم دەدات...لە دیموکراسی جۆری دووەم دا، مەرجی هەبوونی رادەیـەکی دیـاری کراو لە سامان بۆ وەرگرتنی پلە وپایە لە ئارادایە... لە جـۆری سـێیەم دا،**

١٨. ارسطو، سیاست ، کتاب سوم ٣:٥، ١٢٧٩ب، ت: د. حمید عنایت، شرکت سهامی کتابهای جیبی، چ٣، تهران، ١٣٥٨(١٩٧٩)،ل ١١٩.

١٩. سەرچاوەی پێشوو، کتاب سوم١٢٧٩،٥:٤ب، ل ١٢٠.

٢٠. هەمان سەرچاوە، کتاب چهارم٢:٤و٣و٤،(١٢٩٢٤) أ، ل ١٦٥-١٦٦.

**هەموو ئەوانەی کە ناتوانرێت عەیب لە رەچەڵەکیان بگیرێت، دەتوانن بگەنە حکومەت، بەلاّم یاسا بەرزترین داوەرە. لە جۆری *چوارەم* دا هەر کەسێك هاوولاّتی بێت مافی وەرگرتنی پلەوپایەی هەیە، بەلاّم دیسان یاسا بەسەر هەموو کارەکان دا بالاّدەستە. لە جۆری *پێنجەم* دا، هەمان رێوشوێنەکانی [جۆری چوارەم] مسداقیەتی هەیە، بەلاّم لە جیاتی یاسا، عەوام فەرمانڕەوایە و ئەمە لەو حکومەتانە دایە کە بڕیارەکانی ئەنجوومەنی نەتەوەیی، یاساکان هەڵبوەشێنێتەوە. گوناهی ئەم دۆخە لە ملی دیماگۆجەکانە، بەلاّم لە دیموکراسی ملکەچی یاسا دا دیماگۆجەکان لە هیچ شوێنێ دیار نین، چونکە لەوێ تەنیا باشترین هاوولاّتی ئەفزەڵیەتی بەسەر خەڵکانی تر دا هەیە.**

بەم جۆرە سەیر دەکەین ئەرستۆ لە توێژینەوە قوڵەکەی خۆیدا توانیویەتی پۆلێن کردنێك بۆ دیموکراسی بکات کە تا ئێستاش بەشی هەرەزۆری مسداقیەتی هەیە و لە سیستەمە جیاوازە دیموکراتیەکان دا دەبینرێت، کە یان یەکسانیەکی تەواو بوونی هەیە لە نێوان هەموان دا بە سیفەتی هاوولاّتی بوون یان سیستەم دان بەوە دا دەنێت کە دەرفەت لەبەر دەم هەموو تاکەکان دا وەکیەکە، بەلاّم رەنگە هێزی سامان و رەچەڵەك یەکلاکەرەوە بێت. سەرەڕای ئەمانە گرفتی سەرەکی ئەرستۆ لەگەڵ دیموکراسی دا هەڵخەڵەتاندن و بەکارهێنانی جەماوەرە وەك هێزێکی گەورە لە لایەن کەسانی دیماگۆجەوە و پێیوایە یەکێك لە هۆکارەکانی لەناوچوونی دیموکراسی ئەسینی «رۆڵی دیماگۆجەکان بوو لە رەفتار و میتۆدی سیاسی کە بووە هۆی پشێوی لە نەزمی گشتی دا».[21] لای ئەرستۆ دیموکراسی حکومەتێکە کە تێیدا پیاوە ئازاد و هەژارەکان فەرمانڕەوان.[22] بەلاّم بە بۆچوونی ئەو دەرفەتی راستکردنەوەی دیموکراسی وەك حکومەتێك کە تێیدا یاسا بالاّدەستە و باشترین هاوولاّتی واتە تاکێك کە هەوڵ دەدات بۆ دابین کردنی بەرژەوەندی گشتی لە ئارادایە و رەهەندێکی ئابووری بەم پرسە دەبەخشێت، هەربۆیە پێیوایە «هەموو رۆڵەکانی گەڵ مافی ژیانیان هەیە و پێویستە بەرهەمی زەوی بۆ هەموان خەرج بکرێت و ئەمەش لە سەر بنەمای رێککەوتن و لێك تێگەیشتنی نێوانیان

---

٢١. ارسطو، اصول حکومت آتن ، ٢٦-١، سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٣.

٢٢. ارسطو، سیاست، کتاب چهارم١٢٩٠،٣:٤ب، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٦١-١٦٢.

دەبێت»[23]. ئەرستۆ باس لە باشکردنی دیموکراسی دەکات لـە ڕێگـای «دابەشـکردنی زێـدەی سامان بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی خۆشبژیویٚ (الرخاء) هەژارەکان چـونکە بـەڕای ئـەو عـەیبی دیموکراسی هەژاریە»[24]. دواجار ئەرسـتو داکۆکیـەکی مەرجـدار لـە حکومـەتی دیموکراسـی دەکات و پێیوایە ئـەو بیرۆکەیـە کـە حکومـەتی جـەماوەری خـەڵك باشـترە لـە حکومـەتی دەستەیەکی بچووك لەخاون فەزیلّەتەکان، پێدەچێت شیاوی پاساو و تەنانـەت راسـتیش بێـت. چونکە جەماوەری خەڵك ئەگەرچی تاکە تاکە لە فەزیلّەت بێبەشـن، بـەلاّم ئەگـەر لـە دەوری یەکتر کۆ ببنەوە، ئەوا بەیەکەوە لەو دەستەیە زیاتر دەبنە خاوەن فەزیلّەت.[25] سەرەڕای ئەوەی ئەرستۆ بە راشکاوی ئاماژە بە سیستەمی حوکمڕانی ئایدیالی لە دەولّـەت دا ناکـات، بـەلاّم وەك دیـارە سیسـتەمی کۆمـاری یـان دیموکراسـی دروسـت کـە هـەموو هاوولاّتیـان لـە حوکمڕانیەکەی دا بەشدارن و لەسەر بنەمای فەزیلەت دامەزراوە، سیستەمێکی ئایدیالیە لای ئەو. بەم جۆرە ئەرستۆ بڕوای بـە جۆرێـك لـە راوێـژ و رای زۆرینـە هەیـە بەمەبەسـتی لێـك تێگەیشتن و پێیوایە دەبیٚ لە سیستەمی دیمـوکراتی دا «زۆرینـە بـەرەنجامی شـتەکان دیـاری بکات چونکە روانگەکەیان "گوزارشت لە دادپەروەری" دەکات و بڕیاری زۆرینـە لـە پرۆسسـی راوێژی گشتی دا دەردەکەوێت»[26] و دادپەروەری لەسـەر بنـەمای مامەڵـەی یەکسـان لەگـەڵ هاوتاکان دادەمەزرێت و کۆلەگەکانی حکومەت تەنیا لەسەر دادپەروەری سەقامگیر دەبێت.[27] بەم جۆرە پێیوایە کۆ باشتر لە تاك حوکم دەدات، بەلاّم دیـارە بێگومـان لای ئـەو ئـەم کۆیـە سنووردارە بەو کەسانەی کە بەسروشت یەکسان و ئازادن و بە هاوولاّتی لەقەلّەم دەدرێـن نـەك هەموو تاکێکی کۆمەلّگا، هەربۆیە بە رای هۆبز هەلّەی سەرەکی ئەرستۆ ئەوەیـە نـەیتوانیوە جیـاوازی بکـات لـە نێـوان دۆخـی سروشـتی و دۆخـی کۆمەلاّیـەتی و ئەمـەش سەرچـاوەی هەلّەکەیـەتی سـەبارەت بـە نایەکسـانی، چـونکە لای ئەرسـتۆ خـەڵك لـەرووی سروشـتیەوە

---

٢٣. ماجد فخري، ارسطوطاليس المعلم الأول، المطبعة الكاثوليكية، بيروت، ١٩٥٨، ل١٣٥.

٢٤. ستیفن دیلو، سەرچاوەی پێشوو،ل ١٥٧.

٢٥. ارسطو ، كتاب سوم٤:٦، ١٢٨١ب، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٧.

٢٦. ستیفن دیلو ، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٥٦.

٢٧. ماجد فخري ، سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٦.

نایەکسانن، بەلاّم هۆبز پێیوایە یاسا مەدەنییەکان نایەکسانی هەنووکەییان خولّقاندووە.[٢٨] بەم جۆرە سەرەتایەکی گرنگ بۆ داکۆکی کردن لە دیموکراسی لــە لایــەن یــەکێك لــە فەیلەســووفە رەخنەگرەکانەوە دەردەکەوێت کە پێی وایە رای زۆرینە فەزیلەتی تێدایە و ئەمــەش بەرهــەمی کۆبوونەوەی تاکە ئازاد و هاوتاکانە کە سەرچاوەی دادپەروەریشە.

٢٨. بیتر فرانسوا مورو، هوبس- فلسفة، علم ، دین ( فەلسەفە، زانست ، ئایین)، ت: اسامة حاج، المؤسسة الجامعیة للدراسات و النشر و التوزیع، بیروت، ١٩٩٣، ل ٤١-٤٢.

## باسی دووەم

## دیموکراسی لیبراڵ و بیرۆکەی ئازادی و یەکسانی

دیموکراسی لیبراڵ سەرەڕای خاڵە چونیەکەکانی وەك جیهانبینیەکی گشتگیر، بەلاَم لە رووی روانینی بۆ ئەرکی دەوڵەت سەبارەت بە هاوولاَتی و چەمکەکانی وەك ئازادی و یەکسانی و دادپەروەری و رۆڵی تاك لە پرۆسسی سیاسی و رادەی بەشداری، جیاوازی لە نێو ئاراستەکانی دا بوونی هەیە و لەم نێو دا دوو رەوتی وەك "گەشەگەرایی *Evolutionism*"و "پاراستنگەرایی *Protectionism*" بەرچاوترین ئاڕاستەن.

### تەوەری یەکەم: گەشەگەرایی و هاوولاَتی چالاك

بەشێوەیەکی گشتی لیبرال دیموکراسی گەشەگەرا جەخت لەسەر ئەم بیرۆکەیە دەکاتەوە کە هاوولاَتی وەك ئەندامی کۆمەڵگا دەبێ لە لایەن دەوڵەتەوە بایەخی پێ بدرێت بۆ ئەوەی توانا و بەهرەکانی گەشە بسێنێت و لە رووی سیاسی و کۆمەلاَیەتی و ئابووری و کلتووریەوە پەرەی پێ بدرێت و ئەمە لە ئەخلاق و عەقلیەتیش دا رەنگ بداتەوە، لە دیدی ئەم رەوتەدا گەشەپێدان، دادپەروەری و یەکسانی زیاتر و ئازادی بۆ هەموو تاکەکان وەك کۆیەکی یەکگرتوو دابین دەکات، ئەمە بە پلەی یەکەم لە رێگا بەشدارییەکی کاریگەرەوە دەبێت، بەم جۆرە «دیموکراسی گەشەگەرا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە بەشداری سیاسی لە خودی خۆیدا ئامانجە و ئامرازی (ئەگەر نەڵێین تاکە ئامرازی) سەرەکی پێویستە بۆ پەرەپێدانی کوتلەیەك لە دانیشتوی چالاك و هوشیار وبەشدار».[٢٩]

جان جاك رۆسۆ بە یەکێك لە لایەنگرانی دیموکراسی گەشەگەرا دادەنرێت چونکە لای ئەو کۆمەڵگای سیاسی و سیستەمی دیموکراتی کە خۆی لە ئیرادەی گشتی دا بەیان دەکات، لەسەر بنەمای یەکسانی بۆ هەموان لە ناو کۆیەکی ئازاد دامەزراوە و ئاماژە بەوە دەکات کە:

**هەموو تاکیك خۆی و هەموو مافەکانی بە گشت کۆمەڵگا دەسپێرێت، بە وەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە هەموو تاکێك بەتەواوی خۆی بە ئەوانیتردەسپێرێ،**

---

٢٩ .دیفید هیلد، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣٨.

**ڕەوشەکە بۆ هەمووان یەکسان دەبێت، بە ڕەچاوکردنی یەکسان بوونی ڕەوش بۆ هەمووان، هیچ کەسێك بەرژەوەندی لەوەدا نییە ئەم ڕەوشە لەسەر ئەوانیتر دژوار بکات... هەموو تاکێك کەسی خۆی و هەموو مافەکانی خۆی بە هاوبەشی دەخاتە ژێر ڕێنمایی باڵای ئیرادەی گشتی و هەموو ئەندامێك وەك بەشێکی جیانەبۆوەی گشت لە شکلی کۆمەڵایەتی دا وەردەگیرێت.**[30]

تاك و گشت تێکەڵ دەبێت بۆ خوڵقاندنی (موجود) هەبوویەکی نوێ و ئەم پرۆسسەش لە کاتی دەست هەڵگرتن لە "خود" و "ماف" ڕوودەدات. بەم جۆرە هەمەکێك دێتە ئاراوە کە هەم گوزارشتە لە تاك وەك هەندەکێکی کۆمەڵایەتی و هەم بریتییە لە گشتێکی یەکگرتووی سیاسی خاوەن یەك ئیرادە. ئەم وێناکردنەی ویست (ئیرادە) وەك یەکەیەکی بێگەردی پێکهێنەری خودی تاك کە بریتییە لە توانای پەتی ئەنجامدانی کردەوەیەك لە چوارچێوەی کۆمەڵگا دا، هەروەك هیگڵ دایڕشتۆتەوە دواجار بە دیوە سیاسییەکەی دەکرێت بە بنەمای دروست کردنی دەوڵەت و پێیوایە "عەقڵ" و "ئیرادەی گشتی" بناغەی دەوڵەتە و عەقڵیش بەو سیفەتەی ئیرادەیە، لە ژیانی کۆمەڵگا دا خۆی دەنوێنێت.[31] بەبڕوای ڕۆسۆ دیموکراسی ئەو سیستەمەیە کە ئازادی و یەکسانی تێیدا بەدی دێت، وەك دوو چەمکی تەواوکەری یەکتر، یەکسانی واتە یەکسان بوونی ئازادی و واتە یەکسانی "ئوتۆنۆمی" تاك و دروست کردنی کۆمەڵگایەك لەسەر بنەمای "ئازادی ئۆتۆنۆمی" ی هەمووان نەك تاك.[32]بەم جۆرە ئەم سەربەخۆییە دەبەستێتەوە بە سوود وەرگرتن لە ئازادی بۆ دروست کردنی ئیرادەی گشتی کە بریتیە کە کۆی تاك تاکی ئیرادەی هەموو تاکەکان و ئەمە شتێکی نوێ دروست دەکات کە «

٣٠. ژان ژاك روسو، سەرچاوەی پێشوو،ل ١٠٣-١٠٤.

٣١. وەرگیراوە لە: میشل میتاس، هیجل و الدیموقراطیة، ت: د. امام عبدالفتاح امام، التنویر للطباعة و النشر و التوزیع، بیروت، ٢٠١٠، ل٤٢.

٣٢. د. منذر الشاوي، الدولة الدیموقراطیة في الفلسفة السیاسیة و القانونیة ،شرکة المطبوعات للتوزیع و النشر،بیروت، ٢٠٠٠،ل١٥٦.

ناگوێزرێتەوە و بەش بەش ناکرێت)).[٣٣] لە روانگەی رۆسۆوە یەکسانی بەمانای ئازادییەکی وەکیەك دێت بۆ دروست کردنی ویستێك کە لە یەك کات دا هەم گوزارشتە لە تاك بەو سیفەتەی پێکهێنەریەتی و هەم تەعبیرە لە گشت چونکە بەرەنجامیەتی.

هیگڵ کۆکە لەگەڵ رۆسۆ کە بنەمای سەرەکی دەوڵەت نە غەریزەی کۆبوونەوەیە نە دەسەلاتی دەستەیەك، بەڵکو ئیرادەی گشتی گەلە و ئەم ئیرادەیەش وەك بناغەیەکی عەقڵی هەمەکی سەیری دەکرێت.[٣٤] واتە بنچینەی دەوڵەت پەیوەندی بە زەرورەتێکی رۆحییەوە هەیە کە لە فۆرمێکی هەمەکی دا خۆی دەنوێنێ وەك ژیانێکی ئەخلاقی کە دواجار لە کۆمەڵگای مەدەنی دا دەردەکەوێت، دەوڵەت وەك رۆحێکی زیندووی هەمەکێکی رێکخراوە کە دەزگاکان جومگەکانی دروست دەکەن. یەکسانی لە جوانترین فۆرمی خۆیدا لە ناو ئەو سیستەمانە دا دەردەکەوێ کە دەرفەت بە تاکەکان دەدات بەشداری بکەن لە چالاکی بەردەوامی ژیانی کۆمەلایەتی و حکومەتی خۆجێیی و دارشتنی ئامانج و مەبەستی جڤاك و حکومەتی خۆجێیی دا.[٣٥] کەواتە لە روانگە گەشەگەرایی بەشداری سیاسی لە پێناو بەهێزکردنی میکانیزمەکانی وەرگرتنی بڕیار و گەشەپێدانی کۆی هاوولاتیان گرنگی تایبەتی هەیە و ئەمەش مافی رادەربڕین و ئازادی ویژدان دەگرێتەوە، بەلاّم تاك ئەگەر لە رووی عەقڵیەوە گەشەی پێ نەدرێت، ئەوا دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی ناتوانێ بەرەو پێش بچێت و بگاتە ئاستێکی بەرز لە یەکسانی و ئازادی، هەربۆیە بەڕای سپینۆزا (( ئازادترین دەوڵەت ئەو دەوڵەتەیە کە یاساکانی پشت بە عەقڵی ساخلەم ببەستێ، لەم دەوڵەتە دا هەموو تاکێك-ئەگەر بیەوێت-دەتوانێت ئازاد بێت و بە پێی عەقڵ بە سەربەستی خۆی بژی)).[٣٦]

٣٣. عبدالرحمن العالم، بنیادهای علم سیاست ، تهران، ١٣٧٣(١٩٩٤)، ل٢٠١.

٣٤. میشل متیاس، سەرچاوەی پێشوو،ل ٦٦.

٣٥. ئەلێکسی دو تۆکڤیل، دیموکراسی لە ئەمریکا، بڕوانە: ستیفن دیلو، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥١٥.

٣٦. سپینوزا، رسالة في اللاهوت والسیاسة ، ت: د.حسن حنفي، مراجعة: د. فؤاد زکریا، دار الطلیعة، ط٤، بیروت،١٩٩٧، ل ٣٨٤.

رۆسـۆ سـەبارەت بـە داگـیر کردنـی دەسـەلاّت لـە لایـەن فـەرمانڕەواکان و حالّەتـە زیانبەخشەکان* وەك پاساوێك بۆ مانەوە لەسەر دەسەلاّت دەلّێت:

**لەبەر ئەوەی بۆ حکومـەت کـارێکی زۆر ئاسـانە وا بنـوێنێ کـە مافـە یاساییەکانی خۆی پیادە دەکات و لە ژێر ناوی چاکە و بەرژەوەندی گشتی دا ببێتە رێگر لەبەر دەم کۆڕو کۆبوونەوەکان کە ئامانجیان چەسـپاندنی نـەزمی گشتی سەقامگیرە، لەم حالّەتە دایە کە حکومەت بە پشت بەستن بە بێدەنگی کە خۆیّ پێشی شکاندنی دەگرێت و پشێوییەك کە بە فـەرمانی ئـەو ئـەنجام دەدرێت ، ترسی ئەوانەی بیدەنگن وەك لایەنگری لە خۆی لێـك دەداتـەوە و ئەوانەش سزا دەدات کە ئازایەتی قسەکردنیان هەیە.** [٣٧]

کەواتە حکومەت یان دەسەلاّتی سیاسی کە بەرجەستەبووی بەکردەوەی ئیرادەی گشـتییە، ناشێت بە ناوی بەرژەوەندی گشتیەوە ئەم ئیرادەیە داگیر بکات و لە مانا ناوەکییـەکانی خـۆی بەتالّی بکاتەوە و ئیرادەی ئازاد بگۆڕێت بۆ ستەم، و بێدەنگی بۆ ڕەزامەندی. بەم جۆرە ئازادی لە تێڕوانینی گەشەگەرایی وەك ئۆتۆنۆمی یـان خـود-دیاریکـەری عـەقلانّی *rationa self-determination* دەرك دەکرێت. مرۆڤ بەو رادەیە کە لە ژێر عەقلّی کردەیی دایە ئـازادە، و نا ئازادە ئەگەر بە جۆرێکی تر خۆی دیاری بکات. بەلاّم لای لیبرالّـەکان مـرۆڤ ئـازادە (یـان نائازادە) کە کارێك ئەنجام بدات (یان ئەنجامی نەدات) هەر بۆیە لای لیبرالیزم ئـازادی بریتیـە لە بەرتەسك نەکردنەوە و دەسوەرنەدانی زۆرەملیّ و توندوتیژانە.[٣٨] چونکە دەسوەردان، گۆڕینی ئیرادەی تاکە و دیاری کردنی خیاراتە بۆ کۆمەلّگا و تاك، بـەبیّ بـوونی ئـیرادەی سـەربەخۆ و ناچارکردن و بەکارهێنانی توندوتیژی دژی تاکەکان زەمینەی ئازادی لە بەشـداری و پرۆسـسـی سیاسی لەناو دەبات و ئەمەش زەمینەی هەرەسهێنانی سیاسـی و کۆمەلاّیـەتی دێنێتـە ئـارا

---

* Odieux (دزێو) لە حالّەتێك دا بەکار دێت کە پیادەکردنی ماف بە شتێکی مەترسیدار لەقەلّەم بدرێت و پشتی بەم رێسا رۆمانییە دەبەست: تا ئەو جیگایەی دەگونجێت دەبێت سنووری ئەو مافانەی زیانبەخشن بۆ ئەوانیتر بەرتەسك بکرێت و بە پێچەوانەوە تا ئەو شوێنەی دەگونجێت دەبیّ بازنەی مافە مەشروعەکان بەرفراوان بکرێت. روسو، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٠٠.

٣٧. ژان ژاك روسو، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٠٠.

٣٨. اندرو لوین، سەرچاوەی پێشوو،ل ٤٢-٤٣.

چونکه هەروەك (سینکا)[39] دەڵێت هیچ کەسێك ناتوانێ بۆ ماوەیەکی درێژ لە ڕێگای توندوتیژییەوە حوکم بکات، جگە لەم خاڵانەی لەسەرەوە ئاماژەمان بۆ کرد لای سپینۆزا بە شێوەیەکی تایبەتی ترس لە بڕیاری دژ و پێچەوانە لە سیستەمی حوکمی دیموکراتی دا کەمترە لەبەر دوو هۆکار: **یەکەم**، لەوانەیە ئەستەم بێت کە زۆرینەی خەڵك لەناو کۆمەڵگایەکی گەورە دا لەسەر شتێکی ڕێپێنەدراو[پێچەوانەی عەقڵ] ڕێك بکەون و **دووەم**، ئەوەی ئامانج و پرەنسیپی دیموکراسی لەسەر دامەزراوە بریتیە لە ڕزگارکردنی خەڵك لە زاڵ بوونی حەزی کوێر و هێشتنەوەیان لە سنووری عەقڵ بە پێی توانا بە جۆرێك کە لە ئاشتی و تەبایی دا بژین.[40]
هەر بۆیە لە دیدگای دیموکراسی گەشەگەرا ئازادبوونی ویستی هاووڵاتیان تەبایە لەگەڵ عەقلانیەت و لە سیستەمی ستەمکاری دایە کە ئەگەرەکانی خزانە نێو نەزانی و بەربەرییەت زۆر زیاترە. لای (جۆن ستیوارت میل) یەکێك لە باشترین سوودەکانی حکومەتی ئازاد، پەروەردەکردنی هۆش و هەستی هاووڵاتیانە، ئەم کارەش کاتێ دەتوانێ تا نزمترین توێژی جەماوەر کاری پێ بکرێت کە داوای هاوکاریان لێ بکرێت بۆ گێڕانی ڕۆڵێك کە راستەوخۆ کاریگەری لەسەر بەرژەوەندی گشتی وڵات هەیە[41] هەر بۆیە پێیوایە ئەوەی ئازادی مرۆڤ دەوڵەمەند دەکات و پەرەسەندنی خودی لێ دەکەوێتەوە ئەوەیە کە کۆمەڵگا ئازادی بە تاکەکان بدات بۆ ئەنجامدانی هەڵبژاردنی تایبەت بە خۆیان[42] چونکە تاك بەردەوام لەناو ڕەوشی جودا مەیلی بۆ هەڵبژاردنی جیاواز هەیە. هەروەك تۆکڤیل ئاماژەی بۆ کردووە، کە «ڕەوشی کۆمەڵایەتی بەرهەمی دروستکارێك و هەندێ جاریش بەرهەمی یاساکانە بەڵام زۆربەی کاتەکان بەرهەمی هەر دوو هۆکارەکەیە، لێ پاش هاتنەئارای ڕەوشەکە دەتوانین بە هۆکاری یەکەمی یاسا و داب و نەریت و بیروبۆچوونەکانی لەقەڵەم بدەین کە حوکم بەسەر ڕەفتاری نەتەوەکان دا دەکات».[43] ئاماژەی ئەم بیرمەندە بۆ ڕەوشی کۆمەڵایەتی بایەخێکی

---

٣٩. Lucius Anneaus Seneca(٤ پ.ز-٦٥ ز) سیاسەتمەدار، نووسەر و فەیلەسوفی ڕۆمانی.

٤٠. سپینوزا، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٨٣.

٤١. جان ستیوارت میل، حکومت انتخابی ، ت:علی رامین، نشر نی، تهران، ١٣٨٦(٢٠٠٧)،ل ١٨٨

٤٢ .ستیفن دیلو، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٢٢.

٤٣. الكسي دو توكفيل، عن الديمقراطية في اميركا ، ت: بسام حجار، الجزء الثاني، معهد الدرسات الاستراتيجية، بغداد-بيروت، ٢٠٠٧، ل ٩١.

زۆری هەیە لە فکری سیاسی و کۆمەلاّیەتی دا، چونکە گەشە و بەرەوپێش چوون پەیوەست دەکات بەو بارودۆخەی کە تاك تێیدا دەژیت و ئەمەش کاریگەری لەسەر رادەی دیموکراسی دەبێت. (ج.س. میلّ) رای وایە دوو تێڕوانینی جیاواز لە ژێر ناوی دیموکراسی دا بەهەلّە تێکەلّ کراون. ***یەکەم*** وێنای پەتیی دیموکراسییە کە بریتیە لە حکومەتی هەمووان و لەلایەن هەمووان و بەبوونی دەرفەتی مافی نوێنەرایەتی یەکسان بۆ هەمووان. ***دووەم*** وێنای ئاسایی و ئەو واقیعەی کە ئێستا هەیە، کە بریتیە لە حکومەتی هەمووان کە لەلایەن زۆرینەیەك لە خەلّك و بە بوونی دەرفەتی قۆرغ کراوی مافی نوێنەرایەتی بۆ ئەم زۆرینەیە.[٤٤] یەکەمیان لەسەر یەکسانی و ئەویتریان لەسەر ئیمتیازات دامەزراوە. و رای وایە لێرە دا کەمینە لە مافی نوێنەرایەتی بێ بەش دەکرێت، ئەمەش جۆرێك لە دیموکراسی دێنێتە ئاراوە کە ناتەواو و ساختەیە. بەم جۆرە لای میلّ سیستەمی سیاسی ناتوانێ لە ژێرناوی دانایی هەندی کەس دا زەمینەی ستەمکاری و لەناو بردنی ئازادی ئەوانیتر خۆش بکات. بەم چەشنە لە دیدی گەشەگەراییەوە دەبێ هاوولاّتیان سوود لە یەکسانی سیاسی و ئابووری وەربگرن بۆ ئەوەی هیچ کەسێك نەتوانێ ببێتە سەرداری ئەویتر و هەمووان بتوانن وەکیەك چێژ لە ئازادی و پەرەسەندن وەربگرن لە پرۆسسی دیاریکردنی چارەنووس و بەرژەوەندی و چاکەی گشتی.[٤٥] کەواتە لە هزری لیبرالی گەشەگەرا دا سەرەڕای پابەندبوون بە بەها و پرەنسیپە سەرەکیەکانی لیبرالیزمی کلاسیك کە تێیدا تاك دەکەوێتە چەقی پرۆسسی سیاسی، بەلاّم لە نێوان هاوکێشەی ئازادی و یەکسانی دا، زیاتر جەخت لەسەر بایەخی یەکسان بوون لە مافەکان دەکرێتەوە لە پێناو هێنانە ئارای رادەیەکی زیاتر لە دادپەروەری،ماف دەبێت بە بەهایەکی نەگۆڕی کۆمەلاّیەتی و سیاسی و تەنانەت پەیوەست دەکرێ بە بوونی خودی کەسەکانەوە و لێرە دا ماف و ئازادی لە رۆح دا رەنگ دەداتەوە و هەر وەك هیگلّ دەلّێت:

**پانتاییی رۆح مافە و خالّی دەستپێك ئیرادەی ئازادە...ئیرادەی ئازاد لە بوونی راستەوخۆی ماف دا پێ دەگات. تاك لەبەرئەوەی مافی هەیە و**

---

٤٤. جان ستیوارت میل، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٥٧-١٥٨.

٤٥. دیفید هیلد، سەرچاوەی پێشوو،ل ١١٢.

**مارەسەیان دەکات، کەسە. هەر بۆیە ئیلزامی ماف بریتیە لە : ببە بە کەس و ڕێزی ئەوانیتر بگرە چونکە ئەوانیش کەسن.**[٤٦]

لێرەوە گۆڕانی ئیرادەی ئازاد بۆ ماف لە روانگەی (میلٚ)ەوە، دەزگا سیاسیەکانی لێدەکەوێتەوە و پێیوایە ئەم دامەزراوانە لە لایەن مرۆڤ و بە ئیرادەی ئەو دروست دەبێت و ئەم دەزگایانە نەك هەر پێویستیان بە رەزامەندی مرۆڤ هەیە، بەڵکو نیازمەندی بەشداریی‌یەکی چالاکی هاوولاتیانیشە.[٤٧] بەلاٚم بە کردەوە نوێنەرانی گەل ئەم دەزگایانە پڕ دەکەنەوە، هەربۆیە لای میلٚ دوو مەترسی هەڕەشە لە دیموکراسی نوێنەرایەتی دەکات:[٤٨]

١. ئاستی نزمی ئاگایی لە نێو گروپی نوێنەران و رای گشتی کە چاودێری ئەمانە دەکات.

٢. یاسادانەری چینایەتی کە لە لایەن زۆرینەیەکەوە پێك هاتووە کە ئەندامی ئەو چینەن.

لە تێڕوانینی(میلٚ) دەردەکەوێت کە ئەگەر لەلایەکەوە پەرە بە هۆشیاری و ئاگایی رای گشتی و تاکەکان نەدرێت بەتایبەتی ئەوانەی کە وەك نوێنەری ئیرادەی زۆرینە هەڵدەبژێردرێن و لە لایەکی ترەوە ئەرکی گرنگی چاودێری چۆنیەتی پیادەکردنی ویستی تاکەکانی کۆمەڵگایە پشت گویٚ بخرێت، ئەوا دیموکراسی دەکەوێتە بەردەم هەڕەشەوە. خالێکی تری ناو بیرکردنەوەی میلٚ بایەخدانە بە مافی کەمینە بۆ ئەوەی لە ئاستی یاسایی دا پێشێل نەکرێن. بەم جۆرە بەشداری لە ژیانی سیاسی شتێکی پێویستە نەك تەنیا بۆ دیاری کردنی بەرژەوەندی تاکەکان بەڵکو بۆ دروست کردنی کوتلەیەك لە هاوولاٚتی هوشیار و پابەند و پەرەسەندوو کە ئەمانە لە فۆرمی دەستوور دا خۆیان دەردەخەن، واتە بەبیٚ بوونی ئەم چوارچێوەیە ناشێت سنووری ماف و ئەرك و ئازادیەکان بەڕوونی تەعبیر بێت لە سیستەمێکی دیموکراتی. لەم نێوەندە دا هیگلٚ دەڵێت: « بنەمای دەوڵەت، دەسەلاٚتی عەقڵە کە وەك ئیرادە لە رێگای عەقڵەوە خۆی بەدیهێناوە ... و ئامانجی عەقڵی رەها بەدیهێنانی ئازادی بەکردەوەیە... بەشێوەیەکی

---

٤٦. رينيه سرو، هيغل و الهيغلية ، ت: د. ادونيس العكره، دار الطليعة للطباعة النشر ن بيروت، ١٩٩٣، ل٦٢.

٤٧. جان ستیوارت میل، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤١-٤٢.

٤٨. هەمان سەرچاوە، ل ١٧٥.

راستەوخۆ وەك دەوڵەتێکی تاك و بەو پێیەی لە خۆیدا هەبوویەکی زیندووی سەربەخۆیە ، لەدەستوور یان یاسای دەستووری دا بەدی دێت».[49] لای هیگڵ کۆمەڵگا دەگۆڕێت بۆ دەوڵەت کاتێ ئیرادە و حەز و ئایدیا بالاکانی بەشێوەیەکی ئاگایانە لە دەستوور و ژیان لەدەوری ئەم دەستوورە دا رێکدەخات و بەم جۆرە دەوڵەت کاتێ بەکردەوە بوونی دەبێ کە هوشیارە لە یەکیەتی و شوناسی خۆی و دان بەوە دادەنێت کە ئەم شوناسە گوزارشت لە ئیرادە دەکات بەو پێیەی پرەنسیپێکی عەقڵیە.[50] واتە دەوڵەت بەرهەمی گەشەسەندنی ئیرادە و ئایدیایە بە ئاراستەی شوناسێکی یەکگرتوو کە رەزامەندی هەمووانی وەرگرتووە. لێرەوە دیسان هیگڵ پێیوایە بوونی کردەیی ئەبستراکت و جەوهەری دەوڵەت پشت بەو وتەیە دەبەستێت کە ئامانجەکەی بەرژەوەندی هەمەکیە و وێرای ئەویش پاراستنی بەرژەوەندییە هەندەکییەکانە، مادام بەرژەوەندی هەمەکی جەوهەری ئەم بەرژەوەندییانەیە.[51] کەواتە لە دیدی گەشەگەراکانەوە دەبێت یەکسانی بالادەست بێ بەسەر ئازادی دا، چونکە ئەگەر یەکسانی لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵگا دا لە ئارا دا نەبێت، ئەوا ئازادیش بەرەو نەمان دەچێت، هەربۆیە لای ئەوان ماف یان هەیە یان نییە، هەروەك تۆکڤیل دەڵێت:

**من جگە لە دوو رێگا بۆ هەڵسەنگاندنی یەکسانی لە بواری سیاسی شتێکی تر نازانم: یان ماف بە هەموو هاوولاتیان بدرێت یان بە هیچ کەسێك نەدرێت...لە راستی دا ئارەزوویەکی زاڵ و مەشروع بۆ یەکسانی هەیە کە هەموو مرۆڤەکان هان دەدات بۆ هەوڵدان لە پێناو ئەوەی رادەیەك لە هیز و شوێنگەیان هەبێت. و بە لەخۆبردوویەوە هانیان دەدات بۆ یەکسانی لە کۆیلایەتی دا نە نایەکسانی لە ئازادی دا و ئازادی مەبەستی یەکەم و هەمیشەیی خواستەکان نییە، ئەوەی لایان عەشقێکی سەرمەدیە بریتیە لە یەکسانی.**[52]

---

٤٩. هیجل، اصول فلسفة الحق،٢٥٨-٢٥٩، ت: د. امام عبدالفتاح امام، الجزء الثاني، التنوير للطباعة والنشر و التوزيع، بيروت، ٢٠١٠، ل١٤٠-١٤٩.

٥٠. میشل متیاس، سەرچاوەی پێشوو،ل ٣٠.

٥١. هیجل، سەرچاوەی پێشوو، ٢٧٠-١، ل١٥٧.

٥٢. الكسي دو توكفيل، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٣.

بەم جۆرە بەرای تۆکڤیل بناغەی دیموکراسی لەسەر ئـازادی و یەکسـانی دامــەزراوە و پێیوایە کــە دیموکراســی حەتمیــە و دیموکراســی بــێ یەکســانی بــوونی نییــە و هــەروەك چــۆن یەکسانیش بێ ئازادی، کۆمەڵگا بەرەو وێران بوون دەبات.[٥٣] لە ناو تیۆری لیـبرال دیموکراســی دا هەبوونی مافەکانی مرۆڤ ئامرازی سەرەکی بەدەست هێنانی کەرامەتی مرۆییە و هەر بۆیە مافــەکانی مــرۆڤ بــە پێچــەوانەی دارایـیــەکانی تــر ئاڵوویریــان پێناکرێــت و ناگوێزرێنــەوە، مامەڵەکردن و ئاڵوێری مافەکانی مرۆڤ واتە کەمکردنەوەی گەوهەری مرۆڤایەتی و کەرامەتی مرۆیی و بچوك کردنەوەی مرۆڤ بۆ شت.[٥٤]

لای جۆن دیوی (١٨٥٩-١٩٥٢)دیموکراسی زۆر لــەوە بــەرفراوانترە کــە تــەنیا فــۆرمێکی سیاسی تایبەت و رێگەیــەك بێــت بــۆ بــەڕێوەبردنی حکومــەت و یاســادانان و رایــی کردنــی کاروباری کارگێڕی دەوڵــەت بــە پشــت بەســتن بــە بەشــداری جــەماوەر و هەڵبژاردەیــەك لــە کارمەندەکان، سەرەڕای گرنگی ئەمانە ئامرازێکــە بــۆ بــەدیهێنانی ئامانجــە پەنهانــەکان لــە مەیــدانێکی بــەرفراوانی پەیوەندییــە مرۆییــەکان دا و بەرزکردنــەوەی کەســایەتی مرۆڤــە و شێوازێکی کۆمەڵایەتی و تاکەکەسی ژیانە.[٥٥]

هەڵبژاردنی گشتی و مافی دەنگدان و بەشداری لە دارشتنی سیاســەت و یاســادانان و هەڵبژاردنی دەسەڵاتدارە سیاسیەکان و ســەرجەم توخمــەکانی تــر کــە سیســتەمی دیموکراســی پێدەناسرێتەوە میکانیزمی کاریگەرن، بەڵام لای ئەو دیموکراسی بــە پلــەی یەکــەم خــۆی لــەو کلتورە کۆمەڵایەتیەدا دەبینێتەوە کە رەسمی سیاسەتی دیموکراتی دەکەن بۆ پێگەیاندنی مرۆڤ. لای (دیوی) یەکسانی ناوەرۆکێکی سیاسی و یاسایی هەیە واتە مافی هەمووان بــۆ بەدەســت هێنانی یەکسانی لەبەر دەم یاسا دا بــۆ ئــەوەی بتــوانێ تواناکــانی خــۆی گەشــە پێبــدات.[٥٦]

---

٥٣. امام عبدالفتاح امام، الأخلاق و السياسة- دراسة في فلسفة الحكم ، المجلس الأعلى للثقافة،القاهرة،٢٠٠١، ل٢٨.

٥٤. اندرو لوين، طرح ونقد و نظريه ليبرال دمكراسى ، ت: د.سعيد زيبا كلام، سازمان مطالعة وتدوين كتب علوم انسانى دانشگاهها، تهران، ١٣٨٠(٢٠٠١)،ل ١٦٨.

٥٥. جون ديوی، دفاع عن الديموقراطية، لە کتێبی 'جون ر. بورر و ميلتون جولدينجر '، سەرچاوەی پێشوو،ل٢٣.

٥٦. جون ديوي، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٦.

ئەمەش تەنیا كاتێ دێتە ئاراوە كە دەوڵەت تەنیا پشت بە بوونی كۆمەڵێك دەزگای دیموكراتی نەبەستێت كە لەسەر فۆرمی بازاڕ، بواری ركەبەرایەتی دەرەخسێنێت، بەڵكو دەبێ هەوڵ بدات بواری گشتی لە پێناو بەرژەوەندی گشتی تاكەكان و خۆشگوزەرانیان بەكار بێنێت. هەر بۆیە لە كۆمەڵگایەكی دیموكراتی دا پێدەچێت دەوڵەت نەتوانێ واز لە كاری دووبارە دابەشكردنەوە[ی سامان] بێنێت، لە راستی دا شەرعیەتی دەسەلاتی سیاسی لە خودی خۆیدا لەسەر توانای بۆ دابین كردنی یەكسانیەكی دیاری كراو لەمەڕ بارودۆخی هاوولاتیان دامەزراوە،[57] ئەمەش دەرفەتی دادپەروەری زیاتر دەرەخسێنێ كە (میكایل والرز) هەوڵ دەدات ئەو مەرجانە دیاری بكات كە رێگە دەدات بە بەدیهاتنی دادپەروەری بێ ئەوەی سیستەمێكی ستەمكاری یەكگرتووی لێ بكەوێتەوە و ئەمەش بە راڤە كردنی "تێگەیشتنی هاوبەش". بیرۆكەكە دەڵێت چەندایەتیەك لە (مەیدانی دادپەروەری *Spheres of Justice*) بوونی هەیە هاوتەریبە لەگەڵ چەندایەتیە جۆراوجۆرەكانی كالاَ (السلع) كە پێوەری دابەشكردنی خۆیانیان هەیە و گروپە جیاوازەكان بەدوای دا دەگەڕێن. ئەوەی دادپەروەری دەیەوێت ئەوەیە كە نابێ هیچ كام لەم كالاَیانە وەك ئامرازی كۆنترۆڵ بەكار بهێنرێن.[58] واتە لە پانتایی كۆمەڵگا و شوێنگە جیاوازەكان دا كالاَی جیاواز هەیە كە تاكەكان دەتوانن نەك بۆ ناچاركردنی یەكتر بەڵكو بۆ ئالۆوێر و تێركردنی پێداویستی خۆیان بەكاری بێنن.

دیموكراسی لای دیوی پشت بەو بیرۆكەیە دەبەستێت كە هیچ مرۆڤێك یان كۆمەڵە مرۆڤێك بوونی نییە كە رادەیەكی تەواو لە حیكمەت و فەزیلەتیان هەبێت بۆ حوكمڕانی كردن بەسەر ئەوانیتر دا بەبێ رەزامەندی ئەمان و ئەمەش واتە پێویستی بەشداری هەموو ئەوانەی كە دەكەونە ژێر كاریگەری سیستەمێكی كۆمەلاَیەتی بۆ بەرهەم هێنانی سیستەم و بەرێوەبردنی.[59] ئەمەش هەم پێچەوانە بژاردەگەرایی كلاسیكە كە پێیان وایە هەندێ مرۆڤ بە سروشت داناترن، هەم دژی ئاراستەی دیموكراسی نوخبەوی نوێیە، لەم دیدەوە دەزگا و پرۆسسی دیموكراتی لەسەر ویستی هاوولاَتیان بۆ بەشداری و هاندانی دەوڵەت دروست دەبێت. كەواتە هاوولاَتی كەسێكە

٥٧. اريك كيسلاسي، الديمقراطية و المساواة ، ت: جهيدة لاوند، معهد الدراسات الاستراتيجية، بغداد- بيروت،٢٠٠٦،ل١١٩.

٥٨ . اريك كيسلاسي، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣٢-١٣٣.

٥٩. جون ديوي، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٤.

بەشدارە لە کۆمەڵگای مەدەنی ، لەرێگای ئیرادە یان لە میانی میکانیزمـەکانی نوێنەرایـەتی و راوێژ و راگۆڕینـەوەی بـەردەوام. هـاووڵاتی بـوون ئـامرازی چـوونە نـاو پـرۆژەی هاوبەشـە بـۆ بەدیهێنانی چاکەی گشتی. کەواتە کۆی بەها و نۆرمەکانی کۆمەڵگا بەشێوەیەکی گشـتی دەبـێ هاووڵاتیان ئازادانە و لە پرۆسسێکی رێککەوتن و کارلێـك دا دانـی پیـابنێن و بەشـدار بـن لـە دروست کردنی ئەخلاقیاتی کۆمەڵایـەتی و سیاسـی دا کـە هـیچ هێزێکـی باڵادەسـت نـەتوانێ فۆرمێك لە ئەخلاق و بەها بسەپێنێ، هەربۆیە دەبینین دەستوور وەك بەڵگەنامەی هێز و بەهاکان لای هیگڵ خەسڵەتێکی ئەخلاقی هەیە و دەڵێت: دەوڵەت بوونی بەکردەوەی بیرۆکەی ئەخلاقیـە، رۆحی ئەخلاقییە بەو پێیەی ئیرادەییەکی جەوهەرییە لە خۆیدا دەردەکـەوێ و خـۆی دەنـوێنێ و دەناسێ و بیردەکاتەوە، بەو رادەیە دەسکەوتی هەیە کە دەناسێت و دەوڵەت بە شێوەی راستەوخۆ لە داب و یاسا دا بوونی هەیە و بە شێوەیەکی ناراستەوخۆش لە ناخوئاگـای تـاك و مەعریفـە و چالاکیەکانی دا.[٦٠] بەم جۆرە لەبەرئـەوەی ئـیرادەی تـاك وەك هەبوویـەکی بیرکـەرەوە مەحەکـە هەربۆیە لە راستی دا عەقلانیەت دواپێوەرە کە چاکەی دەستووری پێ هەڵدەسـەنگێنرێت و بـەم جۆرە بۆمان دەردەکەوێت دەوڵەت بـەو رادەیـەی عەقلانییـە، چـاکەخواز ومەشروعیشـە و ئـەم دەوڵەتە جڤاکێکە لە بوونەوەرەکان کە خۆیان دیاری کەری خۆیـانن.[٦١]کەواتـە تـاك لـە پانتـایی ژیانی کۆمەلایەتی و سیاسی دا دەگۆڕێ بۆ کەسی هاووڵاتی کە دەوڵەت بەرپرسە لە رەخساندنی دەرفەت بۆ دەرکەوتنی وزە و تواناکـانی و دواجـار بەگەڕخسـتنەوەی لـە پێنـاو خۆشـگوزەرانی کۆمەڵگا دا.

**لەم چوارچێوەیەدا ئەوکەسانەی بە "هاووڵاتی" ناوزەد دەکرێن چ وەك ئەوانەی دەپـارێزرێن یـان تـەنیا وەك کەسـانێك کـە هەڵبـژاردنی سیاسـی ئـەنجام دەدەن...توانای بەشداریان هەیە لە کاروباری گشتی و هەڵبژاردنی عەقلانی. ئەم هەڵبژاردنەش بێ مەرج نییـە و پەیوەسـتە بـە پەیوەنـدی نێـوان هـاووڵاتی و کۆمەڵگا و بە ئاراستەی "بەرژەوەندی گشتی".**[٦٢]

---

٦٠. هیجل، سەرچاوەی پێشوو،٢٥٧، ل ١٣٩.

٦١. میشل متیاس، سەرچاوەی پێشوو،ل ٤١.

٦٢. رابرت آودی و مارشال برمن و ئەوانیتر، پست مدرنیتە و پست مدرنیزم ،ت: حسینعلی نوزری، انتشارات نقش جهان، چ ٢، تهران، ١٣٨٠(٢٠٠١)،ل ٥٨٦.

کەواتە گەشەگەرایی، چالاکی کارای هاووڵاتیان و پەرەپێدان بە توانا و بەهرەی تاکەکان لە پێناو کۆمەڵگایەکی عەقلانی و یاسایی دا بە پێویست دەزانێ. ئەم رەوتە بانگەشە بۆ ئۆتۆنۆمی تاك و ئازادییە بنەڕەتیەکان دەکات لە پێناو بەرزکردنەوەی ئاگایی و عەقلانیەت لە هەمەکیەتی خۆیدا بۆ یەکسانی و دادپەروەرییەکی زیاتر.

## تەوەری دووەم: پاراستنگەرایی و هاووڵاتی ئازاد

ئاراستەیەکی دیاری تری لیبرالیزم پشت بەم تێڕوانینە دەبەستێت کە ئەرکی دەوڵەت ئەوە نییە کە بە ناوی بەرژەوەندی گشتی یان رێکخستنی کۆمەلایەتی و دادپەروەری، دەسوەربداتە بوارەکانی ژیان و ئازادی تاك بەرتەسك بکاتەوە، بەڵکو ئەرکی سەرەکی دەوڵەت ئەوەیە تاك بپارێزێ، واتە پاراستنی لەو هێز و دەسەلاتانەی کە سنووری ئازادییەکانی تاکەکان دەبەزێنن، بۆیە لە رەوتی مێژوودا ئەم مۆدێلەی لیبرالیزم هەوڵیداوە بۆ «کۆتوبەندکردنی دەسەلاتی کەنیسە و دەوڵەت و دیاریکردنی بازنەیەکی دەگمەن بۆ تایبەتمەندییە سەربەخۆکانیان و لە ناوەندی ئەم پرۆژەیە دا ئامانجی رزگار کردنی کیانی سیاسی لە چنگی ئایین و ئازادکردنی کۆمەڵگای مەدەنی (ژیانی تاکەکەسی، خێزانی و کار) لە دەسوەردانی سیاسەت دەبینرێت».[٦٣] بەشێکی گەورەی باکگراوندی ئەم ئاراستە فکریە بۆ تێڕوانین و تیۆرەکانی بیرمەندانی وەك (تۆماس هۆبز) و(جۆن لوك) و (مۆنتسکیۆ) دەگەڕێتەوە. بەرای هۆبز « یەکەمین ئەولەویەتی دەوڵەت پاراستنی مافی هاووڵاتیانە».[٦٤]

بیرۆکەی "ترس"و"پاراستن" بەشێکی دیاری هزری هۆبز پێك دێنێ، چونکە هۆبز پێیوایە ئەگەر هێزێکی وەك دەوڵەت نەبێت ئەوا (مرۆڤ بۆ مرۆڤ گورگە) و هیچ کەسێك ناتوانێ لە ئاسایش دا بژیت و ترس هەموو شتێك دەتەنێت، هەربۆیە پێویستی یاسا سەرهەڵدەدات و لەم نێوەدا هۆبز بڕوای بەیاسا سروستیەکان هەیە وەك هەمەکێکی عەقلانی. لای ئەو یاسای سروشتی پەیڤی یەزدانە، مۆرکێکی دووانەیی هەیە کە بریتیە لە گشتگیری و سەربەخۆیی.[٦٥] بەلاّم (لوك) بە پشت بەستن بە مافە سروشتیەکان ئەولەویەتی سەرەکی دەدات بە هەندێ مافی

٦٣. دیفید هیلد، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣٦.

٦٤. ستیفن دیلو، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٥٧.

٦٥. بیتر فرانسوا مورو، سەرچاوەی پێشوو،ل ١١٤.

بنەڕەتی وەك مافی ژیان و ئازادی و خاوەنداریێتی و لیرەدا دەتوانین ئاماژە بە دوو خـاڵی گـرنگ بکەین: **یەکەم**، بناغەی سەرهەڵدانی دەوڵەت و ڕێکخستنی سیاسی، بڕواهێنانە بـەبوونی مـافی پیرۆزی سروشتی بۆ مرۆڤ، **دووەم**، ڕێکخستنی سیاسی بریتیە لە بەرژەوەندی یـان قـازانج، واتـە مافە سروشتیەکانی خەڵك و ڕەخسـاندنی دەرفـەتی ئـەمین لەبـەردەمیان بـۆ پیـادەکردنی ئـەم مافانە.[٦٦] لەم ڕوانگەیـەوە مـاف و ئازادییـەکان ناکەونـە پـاش سـەرهەڵدانی دەوڵـەت، واتـە ڕێکخستنی سیاسی خوڵقێنەری ئەو بەها و حەقیقەتانـە نییـە کـە تـاك دەتـوانێ سـوودیان لێ وەربگرێت، بەڵکو ئەمانە لە پێش بوونی دەوڵەتەوەن، لە پانتایی کۆمـەڵگا دا ئـەرکی دەوڵـەت ڕەخسـاندنی دەرفـەتی یەکسـانی یاسـاییە. کەواتـە «گریمانـەی لـوك ئەوەیـە کـە سیسـتەمی کۆمەلایەتی پەیوەندییە سیاسیەکان دروست دەکـات و دەیـان پـارێزێ».[٦٧] لێـرەوە بیرمەنـدانی پاراستنگەرایی بایەخیکی زۆر بە پاراسـتنی ئامـانج و مەبەسـتی هاوولاتیـان، واتـە ئازادییـە تاکەکەسیەکان دەدەن.

> **لە لیبرالیزم دا ئازادی بەهایەکە دەبێ دەزگا سیاسـیەکان بیپـارێزن و ئەمەش لە ڕێگای کەمترین ڕێوشوێنەوە دەبێت، هەر بۆیە دەبێ دەوڵـەت یـان دەرکەوتە دەزگاییەکەی واتە حکومەت لە ناو کۆمەڵگا دا، شتێك نەبێت زیاتر لە "پاسەوانی شەو" کە تـەنیا گرانتـی ڕەچـاوکردنی ڕێسـاکانی ڕێکخسـتنی ڕکەبەرایەتی و هاوکاری بکات.**[٦٨]

بەم جۆرە دەردەکەوێت بە پێچەوانە تێڕوانینی گەشەگەرایی، ئەم ئاراسـتەیە جـەخت لەسـەر بەرفراوانی سنووری ئازادی تاك و بەرتەسك کردنەوەی پانتایی دەسەلاتی دەوڵـەت تـا کـەمترین رادە دەکاتەوە، گرێبەستی کۆمەلایەتی کە پەیوەندی نێـوان دەسـەلات و تـاکی هـاوولاتی ڕێـك خستووە، نابێت وەك چوارچێوەیەکی یاسایی بەکار بهێنرێ بۆ ئاستەنگ دروست کـردن لەبـەردەم ئازادی تاك دا، هەر بۆیە لە ڕوانگەی هۆبزەوە «هاوولاتیان مافی خۆیانە تەنانـەت لـە بەرانبـەر ئەو کەسانەش کە بە یاسایی هێرشیان دەکەنە سەر بەرگری لە خۆیان بکەن و ئەو میسـاقەی بـۆ

٦٦. امام عبدالفتاح امام، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٩١-٢٩٢.

٦٧. اندرو لوین، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤١.

٦٨. هەمان سەرچاوە، ل ٤٦.

پاراستن و داکۆکی کردن لـه خـودی تاکـەکان نـەبێت پوچـەڵە».[69] بـەم جـۆرە هـۆبز چـەمکی دادپەروەری لە بیرۆکەیەکی میتافیزیکیەوە دەگۆڕێ بۆ چەمکێکی واقیعی و بەهاکەی پەیوەست دەکات بەئیرادە و رەزامەندی تاکەکان و پێیوایە «بەهای دادپەروەرانە هەمان ئەو بەهایەیـە کـە لایەنەکانی گرێبەست رەزامەندی لەسەر دەدەن»[70] و لە بنەڕەت دا گرێبەست بۆ گونجانـدنی ئـەم ئیرادانە پێك دێت هەروەك هیگڵ پێیوایە « ناکۆکی نێـوان ئیرادەکـان بـە گرێبەسـت چارەسـەر دەکرێت».[71] لە دیدی لوکەوە سەرهەڵدانی دەزگاکانی حوکمڕانی و دەوڵەت لەپێناو حوکمدانێکی بێلایەنانەیە بە سەر ئەو ناکۆکیانەی کە دەکەوێتە نێوان ئیرادە و بەرژەوەنـدی تاکـەکان، چـونکە کاتێ هێزەکان هاوتا بن ئەوا چەمکی ماف و حەقیقەت دەکەوێتە بـەردەم مەترسـیەوە و ئیـدی پێوەرێك نییە دانی پێدا بنـێن، هەربۆیـە پێویسـتیان بـە دەزگایـەکی یەکلاکـەرەوە هەیـە کـە هــەموویان لەســەری کــۆك بــن. جــۆن لــوك ئامــاژە بــەو مافانــە دەکــات کــە ناگوێزرێنــەوە *inalienable* و لەگەڵ گرێبەست دا ناچنە ژێر دەستی حاکمەوە. و رای وایـە بـەبێ دەوڵـەتیش خاوەن مافین ، بەلاّم زۆر نادڵنیایین لە سوودمەندبوون لەم مافانە و بەردەوام دەکەونە ژێر دەست درێژی ئەوانیتر، بۆ رزگار بوون لەم رەوشـە نائـەمن و نادڵنیایـە تاکـەکان حەکـەمی *umpire* گشتی دروست دەکەن کە دەسەلاّتی جێبەجێ کردنە.[72] کەواتە بـە پێچـەوانە گەشـەگەرایی ئـەم ئاراستەیە لە جیاتی جەخت کردن لە سەر یەکسانی و دادپەروەری لە پێناو پەرەپێدان بە زەیـن و بەهرەی مرۆڤ لە لایەن دەوڵەتەوە، جەخت لە سـەر ئـازادی تاکـەکان دەکاتـەوە وەك بەهایـەکی نەگۆڕ، بە تایبەتی ئەو سنوورە دیاری دەکرێت کە نابێ دەوڵەت هەوڵ بدات ئـەم یەکسـانییە لـە سەر حسێبی ئازادی دروست بکات، بەلاّم ئەمە بەمانای ئەوە نییە کـە چـەمکی یەکسـانی بـە تەواوی ونە، دەرفەتی یەکسانی دادپەروەرانە یەکێکە لە پرەنسیپە سەرەکییەکانی لیبرالیزم و لەم نێوەدا هۆبز ئاماژە بە دوو جۆر دادپەروەری دەکات:

**دادپـــەروەری ئـــاڵوێری *commutative* و دادپـــەروەری دابەشـــی *distributive*. یەکەمیان بریتیە لە نسبەتی ژمارەیی و دووەمیـان نسـبەتی**

---

٦٩. توماس هابز، لویاتان ، ت: حسین بشیریە، نشر نی، چ٣، ١٣٨١(٢٠٠٢)، ل ٢٢٣.

٧٠. هەمان سەرچاوە، ل١٧٥.

٧١. بیتر فرانسوا مورو، سەرچاوەی پێشوو، ل ١١٤.

٧٢. اندرو لوین، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٦٥- ١٦٦.

**هەندەسیە. دادپەروەری ئـاڵۆیزی لـە یەکسـانی بـەهای بابـەتی گرێبەسـت و دادپەروەری دابەشی لە دابەشکردنی بەرژەوەندی یەکسانی نێوان ئەو کەسـانەی کە خاوەن توانا و بەهرەی یەکسانن.**[٧٣]

واتە نابێت لە ژێر ناوی یەکسـانی دا نایەکسـانی و پێشـێل کردنـی ئـازادی و توانـای ئەوانیتر بێتە ئاراوە، چونکە یەکسانی رەهـا جۆرێکـە لـە نادادپـەروەری لەبـەر ئـەوەی توانـا و بەشداری و هەوڵی تاکەکان جیاوازە. هـەر بۆیـە (کـارل پۆپـەر) بـۆ چـارەکردنی ئـەم کێشـەیە رەهەندێکی مرۆڤگـەرایی بـە چـەمکی دادپـەروەری دەدات و پێیوایـە تیـۆری مرۆڤدۆسـتانەی دادپەروەری سیٚ خواست یان پێشنیاری سەرەکی هەیە:[٧٤]

« أ) پەیڕەوی کردن لــە پرەنسـیپی یەکسـانی، واتــە پێشـنیاری بــە لاوەنـانی ئیمتیـازاتی "سروشتی"، ب) پەیڕەوی کردن لە پرەنسیپی گشتی تاکگەرایی، ج) پەیڕەوەی کردن لەم پرنسیپە کە ئەرك و ئامانجی دەوڵەت دەبێت پاراستن و داکۆکی کردن بێت لە ئازادی هاوولاٚتیان».

لێرەدا بیرمەندانی پاراستنگەرایی جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە ئەرکی دەسەلاٚتدار دابـین کردنی هەمان ئەو ئامانج و مەبەستەیە کە سپێردراوە بە دەسەلاٚتی سـەروەر بـۆ بـەدیهێنانیان، واتە دابین کردنی ئاسایشی خەڵك و ئاسایشیش تەنیا پاراستنی گیان ناگرێتـەوە بـەڵکو هـەموو ئەو نیعمەتانە دەگرێتەوە کە مرۆڤەکان دەتوانن لەرێگای کار و هەوڵی یاسایی خۆیانەوە و بـەبیٚ دروست کردنی مەترسی و زیان بۆ دەوڵەت بەدەستی بێنن.[٧٥]

بەم جۆرە هەرچەندە لە بیری لیبرالی دا جیاکاری لە نێوان دەوڵەت و کۆمـەڵگای مـەدەنی دا هەیە، بەلاٚم ئەم جیاکارییە دابـڕان نییـە، بـەڵکو پەیوەندییـەکی ئۆرگانییـە، چـونکە ئەوانـەی دەسەلاٚتی کارگێڕیان بەدەستەوەیە یان ئەوانەی نوێنەرایەتی ئـیرادەی هاوولاٚیـان دەکـەن لـە نـاو سیستەم و دەزگاکان دا، هەم چاودێری دەکرێن و هەم بەردەوام لەبەردەم بەرهەڵستی و گۆڕانکاری دان. هەربۆیە مێژووی دیموکراسی لیبرال دوو ئاراستە لەخۆ دەگرێت، لە «لایەکەوە جەخت لەسەر ئازادی تاکەکان دەکرێتەوە دژی دەسەلاٚتی دەوڵەت و لە لایەکی ترەوە بەشداری تاك لە ئیـدارەی دەوڵەت دا بایەخی پێدەدرێت، هەربۆیە پشکداری ئازادانەی هـەموو تاکێـك لـە دەسـەلاٚت دا و

٧٣. توماس هابز ، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٧٥.

٧٤. کارل پوپر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٦٧.

٧٥. توماس هابز، سەرچاوەی پێشوو،ل ٣٠١.

ئازادی بەرهەڵستی ئەم دەسەڵاتە کرۆکی لیبرالیزم پێك دێنێ».[76] ئەمە بە پێی پێناسەی ئەوەی کێ تاکە ماناکەی دەگۆڕێت بەڵام لە دیموکراسی دا جیاکردنەوەی پانتاییەکان گرنگی تایبەتی هەیە، واتە هەمیشە پانتایی ئازادی و پانتایی دەسەڵات دەکەونە بەرانبەر یەکتر، پانتایی ئازادی بواری بەرگرییە لە بەرانبەر دەسەڵات کە خۆی لە کۆنترۆڵ و دیسپلین دا دەبینێتەوە، ئەکتەرەکانی ئەم هاوکێشەیە بەردەوام دەگۆڕێن بێ ئەوەی ڕێساکە گۆڕانی بەسەر دابێت. کەواتە جگە لەوەی هاووڵاتیان پێویستیان بە پاراستن هەیە لە دەسەڵاتداران و لە یەکتری، بەڵام وێڕای ئەمانە بوونی کۆمەڵگایەکی مەدەنی چالاك و هەڵبژاردنی ئازاد و سەروەری یاسا و بوونی دەنگی جیاواز و بەرهەڵست و ناڕازی بەشێکی گرنگی فەلسەفەی لیبرالیزم پێك دێنێت. واتە ئازادی تەنیا بەدوور بوون نییە لە دەسوەردانی دەوڵەت و هێزەکانی تر و سەربەخۆیی و دوورە پەرێزی تاك، بەڵکو بریتیە لە مافی جیاواز بوون و ناڕەزایەتی مەدەنی و ڕادەربڕین، حکومەت ناتوانێ پاراستنی سیستەمی کۆمەڵگا و سەرهەڵنەدانی ئاژاوە بکاتە پاساوێك بۆ سنووردار کردنی مافی ڕادەربڕین، لای سپینۆزا «ئاژەوەگێڕی ڕاستەقینە ئەو کەسەیە کە لە دەوڵەتی ئازاد دا دەیەوێت ئازادی رادەربڕین نەهێڵێ کە ناشێت سەرکوت بکرێت».[77] تاکگەرایی لیبرالیزم لە سۆنگەی ئەم بەڵگەنەویستەوە دەست پێ دەکات کە تاك بەهایەکی رەهایە وئەمەش سەرچاوە دێرینەکەی بۆ فەلسەفەی یۆنان و ئەم وتەیە دەگەڕێتەوە کە «مرۆڤ پێوەری هەموو شتێکە».[78] کەواتە لیبرالیزم هەوڵێکی بەردەوامە بۆ داکۆکی کردن لە بەهای ئازادی هەڵبژاردن، عەقڵ و لێبووردەیی لەبەرانبەر ملهوڕی و سیستەمی ستەمکاری و دەمارگرژی دا، چونکە تا بەربژاری جیاواز لە ئارا دا نەبێت و سیستەمێکی مەدەنی و عەقلانی ململانێ و پەیوەندییەکان ڕێك نەخات، ئەوا تاك ناتوانێ بانگەشەی سەربەستی بکات.

لە سەدەی بیستەم و لە کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانی ئاراستەیەکی رادیکاڵ لە هزری لیبرال دا سەری هەڵدا کە (فردریش فۆن هایك *Fridricsh Von Hayk*) یەکێکە لە نوێنەرە سەرەکییەکانی. هایك بە ئەرگۆمێنتی نوێ داکۆکی لە پرەنسیپ و بەها سەرەکییەکانی لیبرالیزمی کلاسیك دەکات کە بریتین لە «عەزەت و کەرامەتی تاك، ئەولەویەتی ئەخلاقیی

٧٦. د. منذر الشاوي، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٥١.

٧٧. سپینوزا، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٥٢.

٧٨. بەناوبانگترین رستەی پرۆتاگۆراسی سۆفیستی سەردەمی سوقراتە، ئەفلاتون، ل ٦٩٢.

بیرۆکـەی ئـازادی، ئەفزەلیـەتی سیسـتەمی بـازاڕی ئـازاد، زەروورەتـی حکومـەتی یاسـا و سنووردارکردنی دەسەلاتی دەوڵەت)).[٧٩] هایك هەر دوو چەمکی ئازادی تاك، بەشێوە رادیکاڵەکە و بازاڕی ئازاد لێك دەبەستێت و پێیوایە رێسای بازاڕ لە خودی خۆیدا دادپەروەرانەیە و دەوڵـەت بۆی نییە لە ژێرناوی یەکسانی و دادپەروەری و گەشەپێدان بە بەهرە وتوانستی مرۆڤ دەستکاریان بکات و هایك دەڵێت: ((لیبرالیزم لە دۆزینەوەی ئەو سیستەمەوە سەرچاوە دەگرێـت کـە توانـای ئەوەی هەیە کە خۆی بە شێوەیەکی سەربەخۆ بئـافرێنیّ، سیسـتەمێك کـە دەتـوانیّ سـوود لـە مەعریفە و بەهرە و توانستی تاکەکانی وەربگرێت تا ئەو رادەیەی کە بەو سیستەمانە نەچێت کە خاوەن ئاراستەی ناوەندگەرایین)).[٨٠]

بەشێك لە تێڕوانیینە سیاسی و ئابووریەکانی هایك وەك پەرچەکردارێکی تیۆرییە لە بەرانبەر تەوژمی ئیشتراکی کە بۆ ماوەیەکی درێژ بـاڵی بەسـەر ئـابووری و سیاسـەت دا کێشـابوو. لـە روانگەی هایکەوە کۆنترۆڵ کردنی بازاڕ و پلان دانان بۆی جگە لە دروست کردنـی بیرۆکراسـیەت هیچی تری لیّ ناکەوێتەوە و تاکە رێگای پەرەپێدانی مرۆڤ، ئازاد بوونیەتی لە کۆتوبەندانەی کـە دەوڵەت دەیسەپێنیّ و رەخساندنی دەرفەت بۆ پەرەسەندن و پێشکەوتنێکی لەسەرخۆ و تلقـائی، هەر بۆیە دوو جۆر عەقلانیەت جیا دەکاتەوە.

**عەقلانیەتی بنیاتنانەوە** *Costructive Rationality* **کە لەسەر بنـەمای مەعریفەی تەواو و رێنمایی کردنی کۆمەڵگا دامەزراوە و بناغەی سۆشیالیزم و پلاندانانە و عەقلانیەتی پەرەسـەندنگەرا** *Evolutionary Rationality* **کـە جەخت لەسەر بنەمای پەرەسەندنی لەسەرخۆ و تلقایی دەزگا کۆمەلایەتیـەکان دەکاتەوە.**[٨١]

چەمکی لەخۆڕا (تلقائی) لە سیسـتەمی بیرکردنـەوەی هایـك دا چـەمکێکی سـەرەکییە و بەردەوام جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کـە پێشـکەوتن و هـەموو دەسـکەوتەکان لـە مێـژوو دا بەشێوەیەکی تلقائی هاتۆتە ئاراوە نەك بەپێی نەخشەیەکی پێشوەختە، دژی پلانرێژییـە چـونکە

---

٧٩. حسين بشيريە، ليبراليسم و محافظە كارى ، جلد ٢، نشر نى،چ٧، تهران، ١٣٨٦(٢٠٠٧)، ل ٨٠.

٨٠. انطوني دي كرسبني، اعلام الفلسفة السياسية المعاصرة، ت: د. نصار عبداللة، الهيئة المصرية العامة للكتاب، القاهرة، ١٩٨٨، ل٣٨.

٨١. حسين بشيريە، سەرچاوەی پێشوو،ل٨٤.

پێیوایە زەینی مرۆڤ ناتوانێ پێشبینی ئایینـد بکـات وردەکاریـەکانی ژیـان بزانـێ و رای وایـە هەرچەندە مرۆڤ دەزگا و دامەزراوەکان دروست دەکـات، بـەلاّم ئەمـە بـەرەنجامی نەخشـەیەکی ئیرادی و هوشیارانە نییە بەڵکو پەیوەندی راستەوخۆی هەیە بە ئازادی تاکەوە.

هایك جیاوازی دەکات لە نێوان سێ مانای ئازادی دا: [82] ١) ئازادی بـەمانای بەشـداری لـە هەڵبژاردنی حکومەت و داڕشتنی یاسا و پرۆسسی بەرێوەبردن.(ئازادی سیاسی). ٢) ئازادی بـە مانای ئەو مەودایەی کە مرۆڤ دەتوانێ بگات پێی بۆ ئەنجامدانی کردەیەکی دیاریکراو و بە پێـی ئیرادەی تایبەتی خۆی (ئازادی ناوخۆیی) ٣)ئازادی بە مانای رادە توانـای مـرۆڤ بـۆ تێرکردنـی حەزەکانی، یان ئەو چوارچێوەیەی کە مرۆڤ دەتوانێت لە نێوان خیاراتە بەردەسـتەکان دا یـەکێك هەڵبژێرێت. (ئازادی وەك توانا).

لای هایك ئازادی وەك بەهایەکی جەوهەری بریتیە لەوەی «مرۆڤ ناچار نەبێت مل بۆ ئیرادەی ئەویتر بدات». [83] ئەوە هەم دەوڵەت و هەم کۆمەڵگا دەگرێتەوە. سـەبارەت بـەبازاڕیش پێیوایـە «تەنیا شێوازێکە کە بە بێ دەسوەردانی زۆرەملێ و سەرەڕۆیانەی دەوڵـەت، چـالاکیەکان تێیـدا هەماهەنگ دەبێت». [84] بەلاّم ئەمە تێڕوانینێکی ئەبستراکتە بۆ بازاڕ چـونکە سـەرەڕای بـوونی رێسای ناوەکی ئابووری بەلاّم هێشتا بازار لە سیاسەت و کۆمەڵگا دانابڕێت، ئەوە جگـە لـەوەی ئەو پرسیارە دێتە ئاراوە کە ئایا ئەم هەماهەنگیە لەسەر بنەمای قازانجە یـان ئـازادی. بنیـامن باربر دەڵێت: «سیستەمی دیموکراسی ئەفزەلیەت دەداتە بازاڕی ئازاد، بەلاّم بازاڕ ئەفزەلیەت بـە دیموکراسی نادات». [85] کەواتە بە رای هایك ئەرکی دەوڵەت پاراستنی تاکـە لـە دەسـوەردانی دەرەکی و رەخساندنی بوارە بۆ پەرەسەندنی لـەخۆوە(تلقائی)، واتـە زامنکردنـی رێـڕەوەی ئـەم پەرەسەندنە، نەك پلانی پێشوەختە کە ئاراستەی خواستەکانی تاك دیاری بکات.ئەمە بە کـورتی روانگەی دیموکراسی لیبرالی پاراستنگەرا بوو کە لە پاراسـتنی تاکـەوە دەسـت پێـدەکات و بـە پاراستنی بازاڕ کۆتایی دێت.

---

٨٢. انطوني دي كرسبني، سەرچاوەی پێشوو،ل٣٦.

٨٣. هەمان سەرچاوە، ل ٣٦.

٨٤ . حسين بشيريه، سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٥.

85 .Barber, Benjamin, Jihad vs. McWorld,  New York. 1995 , p. 243.

## باسی سێیەم
## فرەیی مۆدێل و جیاوازی پێوەری  دیموکراسی

ئاشکرایە دیموکراسی چەمکێکی فرە رەهەندە و بە درێژاییی مێژوویی فەلسەفە هەروەك پێشتر ئاماژەی بۆ کرا، راڤە وخوێندنەوە و پۆلێنی جیاوازی بۆکراوە، بە پێی قۆناغی مێژوویی و پەرەسەندنی کۆمەڵگای مرۆیی دیدگاش لەمەڕ ئەرك و فەلسەفەی دیموکراسی گۆڕانی بەسەردا هاتووە و پێشکەوتنی چەندایەتی و چۆنایەتی بەخۆیەوە بینیوە، هەربۆیە تێگەیشتن و ئاراستەی جیاواز سەری هەڵداوە. بۆ نموونە سامۆئیل هانتیگتۆن Samuel P. Huntington لە روانگەیەکی مێژووییەوە سەیری دیموکراسی دەکات و بەسەر سێ شەپۆل دا دابەشی دەکات، کە لە شەپۆلی یەکەم و دووەمی دیموکراسی دا هاوکات ئاراستەیەکی پێچەوانە و دژە دیموکراسی و گەڕانەوە بۆ حوکمی تۆتالیتاری و دیکتاتۆری لە ئارادابووە.* بەڵام شەپۆلی سێیەم، بریتیە لە باڵادەستی هزری لیبرالیزم. لای ئەو «شەپۆلی وەرچەرخان بەرەو دیموکراسی بریتیە لە کۆمەڵێك بزاڤ بۆ پەڕینەوە لە سیستەمی نادیموکراتی بەرەو

---

* ١.شەپۆلی درێژی یەکەمی وەرچەرخان بەرەو دیموکراسی (١٨٢٨-١٩٢٦): ئەم شەپۆلە رەگەکانی بۆ هەردوو شۆڕشی فەرەنسی و ئەمریکی دەگەڕێتەوە، بەڵام بە بۆچوونی هانتیگتۆن سەرهەڵدانی راستەقینەی دەزگا دیموکراتییە نەتەوەییەکان دیاردەیەکی تایبەتە بە سەدەی نۆزدە.- دژە شەپۆلی یەکەم (١٩٢٢-١٩٤٢): لە سەرەتای سیەکان دا دیموکراسی پاشەکشە دەکات و بەرەو حوکمی تۆتالیتاری  دەگەڕێتەوە.٢. شەپۆلی کورتی دووەمی دیموکراسی ( ١٩٤٣-١٩٦٢) : لە جەنگی دووەمی جیهانیەوە دەست پێدەکات و ئەم قۆناغە سەرەتای کۆتایی کۆلۆنیالیزمی رۆژئاوایە.-دژە شەپۆلی  دووەم (١٩٤٣-١٩٧٥): لە سەرەتای سیەکانەوە دیموکراسی وەزەی نەما و لە کۆتایی پەنجاکان دا پەرەسەندنی سیاسی و سەرهەڵدانی سیستەمە تۆتالیتاری بە روونی دەرکەوت بەتایبەتی لە ئەمریکای لاتین.٣. شەپۆلی سێیەمی دیموکراسی (١٩٧٤-  ): ئەم قۆناغە لەپاش کودەتای پورتوگال دەست پێدەکات و سەرەتا باشووری ئەوروپا و پاشان ئەمریکای لاتین و ئاسیا دواتر رووخانی سیستەمی کۆمۆنیستی لێ دەکەوێتەوە. صامویل هانتنجتون، الموجة الثالثة-التحول الديموقراطي فی أواخر القرن العشرين، ت: د.عبدالوهاب علوب، مرکز ابن خلدون للدراسات الأنمائية، القاهرة،١٩٩٣، ل ٧٤ودواتر.

سیستەمی دیموکراتی کە لە ماوەیەکی زەمەنی دیاریکراودا رووی داوە)).[86] بەم جۆرە جەخت کردنی ئەو زیاتر لە سەر پرۆسسی بەدیموکراسی کردنە، لێرەوە شەپۆلی سێیەمی دیموکراسی کە پەیوەستە بە سەرکەوتنی لیبرال دیموکراسی رۆژئاوا و بەجیهانی بوونی بازاڕی ئازاد، لەبنەڕەت دا وەك مۆدێلێکی بیٚ رکابەر بۆ هەموو جیهان خۆی دەخاتەڕوو. وەك بیرمەندێك کە بە توندی داکۆکی لە لیبرال دیموکراسی دەکات و پێیوایە دوایین قۆناغی گەشەی عەقڵی مرۆڤە (فۆکۆ یاما) بە شێوەیەکی وروژێنەر و بە پێی نەریتی سمیسی و هیگڵی پێشوازی لەم وەرچەرخانە مێژوویە کردووە، چونکە [هیگڵ] پێیوابوو گۆڕانکاری بریتیە لە پێشکەوتنی عەقڵ لە مێژوو دا و لە وێشەوە رەوتی ئەم مێژووە بەرەو کۆتایی دەچێت و (ئادەم سمیس)یش بڕوای بە پێشکەوتنی بازاڕ هەبوو بەو پێیەی هێزێکی ئازادی یەکانگیرە.[87] بەلاٚم لە جەوهەر دا ئەم رەوتە بیٚ دژبەر نییە و بەردەوام لەلایەن هێزی جیاوازەوە رووبەڕووی تەحەدا دەبێتەوە، بەتایبەتی ئەو مۆدێلەی کە لە لایەن بازاڕی بیٚ کۆتوبەندەوە پیادە دەکرێت، تووشی بەرهەڵستی دەبێت هەر لە دووبارە سەرهەڵدانەوەی سیاسەتی پاراستنی [کۆمەلاٚیەتی]ەوە تا دەمارگرژی ئەتنی و ئایینی.[88] ئەوە جگە لەوەی کێشەی کلتور و شوناسە جیاوازەکان لەگەڵ ئەم شەپۆلەی دیموکراسی لە هەندیٚ حاڵەت دا کردەی توندوتیژ و نکۆلی کردن لە بەرانبەر و تیرۆری بەرهەم هێناوە، چونکە بەشێك لە بەرکەوتەکانی ئەم شەپۆلە وەك کالاٚی دەرەکی و هاوردە سەیری دیموکراسی دەکەن.

## تەوەری یەکەم: مۆدێلەکانی دیموکراسی

لێرە دا بەکورتی ئاماژە بە روانگەی ومۆدێلی هەر یەك لە (گی ئیرمە) و (هێلینا گێت) و(ئەنتۆنی گیدنز) و(دەڤید هیلّد) دەکەین، کە هەریەکەیان لە گۆشەنیگای جیاوازە، بەلاٚم لە چوارچێوەی نەریتی لیبرالیزم دا تیشکیان خستۆتە سەری و پۆلینیان بۆ کردووە.

---

٨٦. هەمان سەرچاوە، ل ٧٣.

٨٧ . فالح عبدالجبار، ما بعد ماركس ، دار الفارابي، بيروت، ٢٠١٠، ل٢٢٢.

٨٨ . كلاوس مولر، حاكميت ، دموكراسى و سياست جهانى(سەروەری، دیموکراسی و سیاستی جیهانی)،ت: لطفعلى سمينو، نشر اختران، تهران، ١٣٨٤(٢٠٠٥)،ل ٣٦-٣٧.

### أ- (گی ئیرمە Guy Herment ) و دوو جۆر دیموکراسی:

گی ئیرمە باسی دوو جۆر دیموکراسی دەکات، ***یەکەمیان*** "دیموکراسی میتۆدی"ە کە دیموکراسی تەنیا بە میکانیزمی فەرمانڕەوایی دەزانێت و بێ بەرییە لە هەموو جۆرە ئامانجێکی کۆمەڵایەتی و مێژوویی و ئامانجەکەی بریتیە لە پاراستنی تاك و کۆمەڵگا لە هەڕەشەی ستەمکاری و ملهوڕی. ***دووەمیان*** "دیموکراسی بەهایی"ە، کە دیموکراسی کەمتر بە ڕێکخستنی دەزگایی دەزانێت و زیاتر وەك پلانێك بۆ کۆمەڵگا سەیری دەکات کە ئامانجەکەی بەرزکردنەوەی بەختەوەری تاکەکەسی و جەماعی هەموو هاوولاتیانە.[89] ئەم مۆدێلە بە وەبەرچاوگرتنی مێژووی ستەمکاری پێیوایە ئەرکی یەکەمی سیستەمی دیموکراسی ئەوەیە هەندێ میکانیزمی یاسایی گونجاو دابرێژێت کە تاك لە ستەمی دەسەلات بپارێزێ، بەلام مۆدێلی دووەم پێیوایە دیموکراسی دەبێ خاوەن پەیام بێت و ئامانجە مرۆییەکان وەك بەها سەیر بکات نەك تەنیا بایەخ بە ئامرازەکان بدات.

### ب- (هێلینا گێت Helena Gatt) و سێ مۆدێلی دیموکراسی:

گێت ئاماژە بە سێ مۆدێل دەکات:١) دیموکراسی بەشداریی، کە تێیدا خەلك لە ڕێگای گفتوگۆی گشتیەوە سەبارەت بە کێشەو گرفتەکانیان و باشترین ڕێگاچارە رۆڵیان هەیە.٢) دیموکراسی راستەوخۆ، لەم حاڵەتەش دا خەڵك لە ڕێگای بڕیاردان سەبارەت بە بابەتێکی تایبەت بە چارەنووسی خۆیان لە نێوان چەند خەیارێك دا یەکێك هەڵدەبژێرن و ئەمە لە شێوەی ریفراندۆم دا دەردەکەوێت.٣) مۆدێلی نوێنەرایەتی یان لیبرال دیموکراسی کە تێیدا گروپێك لە نوخبەکان هەڵدەبژێردرێن و ئەرکی بڕیار وەرگرتن سەبارەت بە خەڵك بەم گروپە دەسپێردرێت.[90] مۆدێلی یەکەم ئێستا لە هەندێ هەرێمی بچوك دا کاری پێ دەکرێت، بەلام لە کۆمەڵگا ئالۆزەکان دا تاقی نەکراوەتەوە، سەبارەت بە مۆدێلی دووەمیش دەتوانین بڵێین یەکێکە لە دەرکەوتەکانی دیموکراسی، چونکە ریفراندۆم حاڵەتە نەك دیاردە، بەلام مۆدێلی سێیەم دیارترین مۆدێلە کە لە زۆربەی ولاتە پێشکەوتووەکان دا بەرچاو دەکەوێت. لە بنەڕەت

---

٨٩. گی ارمە، فرهنگ و دیموکراسی، ت: مرتضی ثافت، ققنوس، تهران، ١٣٧٦(١٩٩٧)، ل ٢٢-٢٦.

90. Helena Gatt , Democracy in Practice ,Routledge, USA and Canada, pp.125-148.

وەرگیراوە لە: سید محمد ناصر تقوی، الگوهای دمکراسی ، لەم سایتەی خوار وەوە لە ڕێکەوتی ٢٠١٠/٦/١

http://www.hawzah.net/Hawzah/Articles/Articles.aspx?LanguageID=1&id=88528

دا دیموکراسی نوێنەرایەتی بەو مانایەیە کە بڕیاری تایبەت بە کۆمەڵگا لە لایەن هەموو ئەندامان وەرناکیرێت بەڵکو لەلایەن ئەو کەسانەوە دەردەکرێن کە بۆ ئەم مەبەستە هەڵبژێردراون.[91]

بەڕای ڤەیبەر بۆ ئەوەی سیستەمێکی دیموکراتی تاڕادەیەك کاریگەری هەبێت، دەبێ دوو مەرج دەستەبەر بکرێت: **یەکەم،** دەبێ حزبەکان بوونیان هەبێت کە نوێنەرایەتی بەرژەوەندی جیاواز بکەن و تێڕوانینی جودایان هەبێت. **دووەم**، دەبێ سەرکردایەتی سیاسی بوونی هەبێت کە خاوەن خەیاڵ و چالاکی پێویست بن بۆ دەربەبازبوون لە قورسایی تاقەت پڕوکێن و بێ رۆحی بیرۆکراسی.[92] کەواتە تەنانەت ئەگەر حزبی زۆریش هەبێت، کە بەدەوری حزبی سەرکردە دا دەخولێنەوە بێ ئەوەی خاوەن ئیرادە و پرۆژەی سەربەخۆ بن و روانگە وئایدۆلۆژیای جیاوازیان هەبێت و نەتوانن رکەبەرایەتی لەگەڵ یەکتر بکەن، ئەوا بە سیستەمێکی دیموکراسی دانانرێت. هەروەك ئاشکرایە فیبەر بیرۆکراسیەت بە یەکێك لە خەسڵەتەکانی دەوڵەتی مۆدێرن سەیر دەکات، بەڵام بۆئەوەی ژیانی سیاسی رۆحی هەبێت دەبێ بژاردەیەکی کاریگەر و سەرکردە جڵەوی پرۆسسی سیاسی بگرنە دەست. « بەم جۆرە دیموکراسی هەر دوو رەهەندی رکەبەرایەتی و بەشداری لەخۆدەگرێت و روبرت دال ئاماژە بەوە دەکات کەئەم دووانە بۆ دیموکراسی راستەقینە یان حوکمڕانی جەماعی پێویستن».[93]

لێرە دایە کە ئاراستەی بژاردەگەرایی دیموکراتی *Democratic Elitism* جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە دیموکراسی بەمانای بەشداری هەمووان نایەت لە پرۆسسی دروست کردنی بڕیار دا، بەڵکو نوخبە دەتوانێ بەوەبەرچاوگرتنی هەندێ پێوەر، بڕیارەکان دەربکات، بەتایبەتی لە کۆمەڵگا گەورەکان دا کە دیموکراسی بەشداری خوازانە نامکین دەبێت و بەرێوەبردنی کۆمەڵگایەکی ئاڵۆز پێویستی بە شارەزایی *Expertise* هەیە، لای ڤەیبەر گەشەسەندنی هاوولاتی گشتگیر *Mass Citizenship* کە پەیوەندییەکی نزیکی لەگەڵ چەمکی بەشداری گشتی دا هەیە، پێویستی بە کاربەدەستی بیرۆکراتی دێنێتە ئاراوە.[94]

---

٩١. آنتونی گیدنز، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٤٣.

٩٢. هەمان سەرچاوە، ل ٣٤٧.

٩٣. صامویل هانتنجتون، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٦.

٩٤. آنتونی گیدنز، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٤٦.

واتە لەگەڵ برفراوان بوونی مافی هاوولاتیبوون و گشتگیربوونی بەجۆرێك کە هەموو ئەو چین و توێژ و نژادانە بگرێتەوە کە لەژێر سایەی ئوتوریتەی دەوڵەت دا دەژین و بەلاوەنانی هەلاواردنی کۆمەلایەتی، بیرۆکراسیی و رێوشوێنی دەزگایی سەریهەڵدا. (شۆمپیتەر) پێیوایە «میتۆدی دیموکراسی بریتیە لە وەرگرتنی تەدابیری دەزگایی لە پێناو گەیشتن بە بڕیاری سیاسی کە لە میانیەوە تاکەکان دەسەلاتی دەرکردنی بڕیار بەدەست دێنن لە رێگای رکەبەرایەتی لەسەر دەنگەکان». [٩٥] بە وتەی شومپیتەر کە یەکێکە لە بیرمەندای بژاردەگەرایی، دیموکراسی حکومەتی سیاسەتمەدارە نەك گەل. هەروەك چۆن دەلاڵەکان بازرگانی پشکن لە بازاڕی بۆرسە دا، سیاسەتمەدارەکانیش "دەلاڵی دەنگ"ن *dealer in votes*. [٩٦]
بەلام بڕوای بەوە هەیە دەبێ سیاسەتمەدار تاڕادەیەك وەلامی خواست و بەرژەوەندیی دەنگدەران بداتەوە و چاوەدێری دەسەلاتیش لە ئارادابێت، بۆ ئەوەی پارێزگاری لە دیموکراتی بوونی هەموو پرۆسسەکە بکرێت.

لای هەندێ بیرمەندی وەك (جۆن دیوی) بژاردەگەرایی ناتوانێ پارێزگاری لە ماهییەتی دیموکراسی بکات، چونکە دوور خستنەوەی خەڵك لە بەشداریەکی چالاك بۆ داڕشتنی سیاسەت سەبارەت بە چارەنووسی خۆیان و کۆمەڵگا، دیموکراسی لە ناوەرۆکی خۆی بەتاڵ دەکاتەوە هەر بۆیە ئاماژە بە مەترسی رەوتی تایبەتمەندبوون و بیرۆکراتیزە بوونی پاراستنی سیاسی دەکات: «حکومەتی شارەزاو پسپۆڕەکان کە جەماوەر نەتوانێ تێیدا خواستەکانی خۆیان بخەنەڕوو، هیچ نییە جگە لە سیستەمی ئولیگاریشی کە بە ئاراستەی بەرژەوەندی کەمینەیەکی دیاریکراو ئیدارە دەکرێت». [٩٧] بەشی گەورەی ناوەرۆکی پاراستنی سیاسی، داڕشتنی سیاسەت و بڕیارەکان بۆ جێبەجێ کردن، زۆربەی کاتەکان لە شوێن و لە لایەن گروپە پسپۆڕ و بیرۆکراتە تایبەتیەکانەوە ئەنجام دەدرێت، نەك لەو هۆڵە تایبەتیانەی کە بۆ کە بۆ گفتوگۆی کراوە و ئازاد دروست کراوە...ئەمەش بیرۆکەیەکی هێناوەیە ئاراوە کە سیستەمی خۆشگوزەرانی کۆمەلایەتی وەك دەزگایەکی حکومیی یاسایی _ ئیداری_دەرمانی، کە بابەتە سیاسیەکانی پەیوەست بە شرۆڤەی خواستەکانی خەڵك دەگۆڕێ بۆ بابەتی یاسایی، کارگێڕی و

---

95 .Joseph Schumpeter, Capitalism, Socialism and Democracy,2nded, New York,1947,p.269.

٩٦. آنتونی گیدنز، سەرچاوەی پێشوو،ل ٣٤٧.

٩٧. رابرت آودی و مارشال برمن و ئەوانیتر، سەرچاوەی پێشوو، ٥٩١.

یان دەرمانی، بە ئاراستەی لە سیاسەت خستن دەیانباتە پێش.[98] واتە سەرەڕای دەسوەردان لە کۆی بوارەکانی ژیان وەك نەخۆشی سەیری کێشە گرفتە سیاسی و کۆمەلآیەتی و کلتورییەکان دەکات. بەم جۆرە یەکێك لەو رەخنانەی ئاراستەی روانگەی بژاردەگەرایی دەکرێت ئەوەیە کە بە شێوەیەکی پاسیڤ سەیری هاوولاتیان دەکات و پێیوایە کە جەماوەری ئاسایی کە کرۆکی پرۆسسی سیاسی پێك دێنێت و سەرچاوەی رەوایەتی بڕیارەکانە، توانای بڕیاردانیان نییە لەسەر کێشە و پرسە چارەنووس سازەکان.

**ج- (ئەنتۆنی گیدنز Antony Giddens) و سێ مۆدێلی دیموکراسی:**

١. دیموکراسی نوێنەرایەتی فرەحزبی. کە زۆربەی کاتەکان وەك دیموکراسی لیبرال ناوزەد دەکرێت.

٢. دیموکراسی نوێنەرایەتی یەك حزبی.

٣. دیموکراسی بەشداریخوازانە.[99]

مۆدێلی یەکەم پشت بە پلۆرالیزمی کلتوری و لێبووردەیی و بوونی کۆمەلگای مەدەنی دەبەستێت کە رێز لە ئازادی و مافی هەموو تاکێك دەگرێت و چوارچێوەی پێکەوەژیان دەڕەخسێنێ، بەلآم لە سیستەمی دیموکراسی دا هەندێ کێشە سەرهەلدەدات کە بەپارادۆکسی دیموکراسی ناسراوە، واتە رەخساندنی زەمینەی دیموکراسی بۆ ئەوانەی کە دژی دیموکراسین. بە پێچەوانەی مۆدێلی دووەم کە تەنیا پشت بە لایەنی فۆرمالی دیموکراسی دەبەستێ وەك رێگایەك بۆ شەرعیەت بەخشین بە دەسەلآت و سیستەم، لەم مۆدێلەدا دەستاودەست کردنی دەسەلآت لە چوارچێوەی ئایدۆلۆژیای رەسمی دا و لە نێو کەسەکانی یەك حزب دا دەبێت زیاتر لە بواری کارگێڕی دا کارایی هەیە وەك لە سیستەم تۆتالیتارەکان دەبینرێت. بۆ مۆدێلی سێیەمیش نموونەی یۆنانی کۆن و ئێستاش ریفراندۆم لەبەر دەست دایە.

**د- (دەڤید هیلد *David Held*) و مۆدێلەکانی دیموکراسی:**

هیلد لە کتێبی مۆدێلەکانی دیموکراسی *Models of Democracy*[100] دا ئاماژە بە یازدە مۆێل دەکات کە بەم جۆرە دابەشی کردووە: دیموکراسی کلاسیك، کۆماری،

---

٩٨. هەمان سەرچاوە ،ل ١٥٤.

٩٩. آنتونی گیدنز، سەرچاوەی پێشوو ،ل ٣٤٣.

لیـبرالی، راسـتەوخۆی مارکسـی، بژاردەگـەرایی رەکەبەرایـەتی، فرەیی(پلۆرالیسـتی)، یاسایی، بەشداری ، ئۆتۆنۆمی، کۆسمۆپۆلیتی. ئەم دابەشکردنە بەرفراوانترین پۆلێنـە بـۆ دیموکراسی کە هەموو تەوژم و قوتابخانەکان دەگرێتەخۆ.

## تەوەری دووەم: پێوەرەکانی راڤەکردنی دیموکراسی

دیارە دیموکراسی دوای ئەو قۆناغـە جیاوازانـەی برِیوەیـەتی، بێگومـان وەك بەشـێك لەبەرهەمی عەقڵی مرۆڤ لەیەك رەهەند یان رووەوە ناپێورێت، ئەگـەر هـەر لەسـەرەتاوە بتوانین دیموکراسی بپێوین وەك حاڵەتێکی جیاواز لەو واقیعەی تێیدا گەشە دەکات. بەڵام هەرچۆنێ بێت ئاماژە بەهەندێ روانگە دەکەین کـە بـەبێ فـەرامۆش کردنـی کۆمـەڵێك جیاوازی، بەرچاو روونیمان پێ دەبەخشێت لەمەرِ خاڵە هاوبەشەکان.

### أ.چوار تێگەیشتن بۆ دیموکراسی:

بەشێوەیەکی گشتی لە رووی ئەرك و خەسڵەتەوە (تیللی) چـوار جـۆر تێگەیشـتن بـۆ دیموکراسی دیاری دەکات:[101]

١. دەستووریی *Constitutional* کە تەرکیز لەسـەر ئـەو یاسـایانە دەکاتـەوە کـە سیستەمی حوکمرِانی دایاندەرێژێت سەبارەت بە چالاکی سیاسی. واتـە پابەنـدبوون بـەو چوارچێوە دیموکراتی و یاساییانەی کە لە دەستوور دا دیاری دەکرێت، ئەمە بەشێوەیەکی گشتی پشت بە فۆرمی دیموکراتی و رێکخستنی پەیوەنـدی نێـوان هێـز و دەسـەڵاتەکان دەبەستێ.

٢. جەوهەریی *Substantive* کە جەخت لەسەر مافە بنەرِیەتیەکان دەکاتەوە لەسەر رەوشی ژیان و سیاسەت کە سیستەمێکی حـوکمرِانی هـەوڵی چەسـپاندنیان دەدات. لـە تێرِوانینـی جەوهـەری دا ئامـاژە بـەوە دەکرێـت کـە سـەرەرِای جیـاوازی سیسـتەمە دیموکراتیەکان، بەڵام دەبێ هەندێ بنەمای جەوهەری بە نەگۆرِ سەیر بکرێت کە خۆی لـە ماف و ئازادییە سەرەکییەکان دەبینێتەوە.

---

100 .David Held Models of Democracy, Polity Press, Cambridge, UK, 1988.

١٠١. تشارلز تيللي، الديمقراطية (ديموكراسی)،ت: محمد فاضل طباخ، المنظمة العربية للترجمة،بيروت، ٢٠١٠، ل٢٢ تا ٢٦.

٣. ڕێکـاری *Procedural* کۆمــەڵێکی بەرتەســك لــە ممارســەی دەســەڵاتیانەی هەڵدەبژێرن بۆ ئەوەی لەسایەی دا سیستەمێکی حوکمڕانی بە دیموکراسی وەسـف بکرێـت یان نا. ئەم ئاراســتەیە کـە (کـە یـورگن هابرماسـیش تەبـەنی دەکـات) بـوونی ڕێکـار (اجـراءات) و ڕێوشوێنی یاسایی لە پرۆسسی دیموکراتی بە پێویست دەزانێت کە لەلایـەن هەمووانەوە دانی پیانرابێت و مەشروعیەتی هەبێت.

٤. ئاراستەی پرۆسسی *prossess-oreinted* کە لانی کەمی هەندێ پرۆسس دیاری دەکەن و دەبێ بەردەوام کار بکات بۆ ئـەوەی بـە دیموکراسـی وەسـف بکرێـت. لێـرە دا بەشێوەیەکی سەرەکی پشت بە پێنج پێوەرەکـەی ( رۆبـرت دال)*دەبەسـترێت کـە بـریتین لە:[١٠٢]

١. بەشداری کاریگەر یان چالاك: بەدرێـژایی پرۆسسـی بڕیـاردانی سـەرەکی، دەبـێ هاووڵاتیان دەرفەتی یەکسان و گونجاویان بۆ بڕەخسێت بۆ خسـتنەڕووی ئەولەویەتـەکانی خۆیان.

٢. یەکسانی دەنگ لە پانتاییە چارەنووسسازەکاندا: دەبێ هاووڵاتیان بۆ دەربڕینی ڕا و هەڵبژاردن لە بوارە چارەنووسسازی بڕیاری جەماعی دا، خاوەن دەرفـەتی یەکسـان بـن بەجۆرێك کە لەگەڵ دەنگ و هەڵبژاردنی ئەوانیتر دا یەکسان بێت.

٣. تێگەیشتنی ڕۆشنگەرانە: هەمووهاووڵاتیەك دەبـێ لەسـەر بنـەمای بەرژەوەنـدی خۆی بۆ دۆزینەوە و ئەرگۆمێنت هێنانەوەبۆ هەڵبـژاردن و بڕیـار دەرفـەتی تـەواوی پـێ بدرێت.

---

*ڕۆبرت دال Robert Dahl لە ساڵی ١٩١٥ لە دایك بووە، پرۆفیسۆری فەخری بەشی زانستە سیاسیەکانی زانکۆی ییلە، لە ساڵی ١٩٤٠ دکتۆرای وەرگرتووە و سەرۆکی پێشووی کۆمەڵەی زانستە سیاسیەکانی ئەمریکا بووە و بە "ڕاگری"زانایانی زانستە سیاسیەکانی ئەمریکا دادەنرێت و ئەم ناسناوەی وەك پێزانینێك لە بەرانبەر ئەو کتێبە زۆرانە پێبەخشراوە کە نوسیویەتی و زیاتر لە ٢٠ کتێبی هەیە.

سەرچاوە: http://en.wikipedia.org/wiki/Robert_Dahl

١٠٢. Philip Green (ed), Democracy –Key Concepts in Critical Theory,NewJersey, Humanities Press, 1993,pp.58-64.

٤. کۆنترۆڵی ئەجندا: دەبێ خەڵك سەبارەت بە بڕیار وەرگرتن لە هەمبەر ئەوەی چۆن بابەتەکان بخرێنە بەرنامەی کارەوە بۆ ئەوەی لە پرۆسسی دیموکراتی دا بڕیاریان لەسەر بدرێت، خاوەن دەرفەتی گونجاو و گشتگیر بن.

٥. لەخۆگرتنی پێگەیشتووەکان (البالغین) : ئەمەش دووتایبەتمەندی هەیە، دەبێ هاوولاتی بوون ڕێژەیەکی گەورە لە بەتەمەنەکان بگرێتەوە و مافی هاوولاتی بوون دەرفەتی بەرهەڵستی و رادەربڕین لەبەرانبەر بەرزترین کاربەدەستی حکومەت بگرێتەخۆ.

دیارە بەردەوام لەگەڵ گەشەسەندنی بیرۆکەی دیموکراسی دا جەخت کردنەوە لەسەر یەکسانی و پارێزگاری کۆمەلایەتی بوونی هەبووە، چونکە ئەگەر یەکانگیری کۆمەلایەتی کەلێنی تێبکەوێت و لە هەندێ حاڵەت دا دەوڵەت هەوڵی پاراستنی چین و توێژەکانی کۆمەڵگا نەدات، ئەوا ئەگەری ئەوە هەیە کە دیموکراسی بکەوێتە بەردەم هەڕەشەوە. هەربۆیە یەکێك لە پێوەرەکانی تری دیموکراسی پاراستنی کۆمەلایەتیە.

## ب. پێوەری U:

بۆ بە هێز کردنی کۆڵەگەکانی پاراستنی کۆمەلایەتی راپۆرتی بیڤریج[١٠٣] ئاماژەی بە سێ چەمك کردووە هەموویان بە پیتی U دەست پێدەکەن و هەربۆیە بە پێوەری *U* ناسراوە:

١-گشتیەت *Universality* : دەبێ سیستەمی پاراستنی کۆمەلایەتی هەموو دانیشتوان داپۆشێت.

٢-وەکیەکی *Uniformity* : نابێت ڕێژەگەرایی پیادە بکرێت. نابێ داپۆشینی کۆمەلایەتی پەیوەست بێت بە داهاتەوە، هەموو تاکێك بەپێی پێداویستیەکانی وەربگرێت نەك بەشدارییەکەی.

٣-یەکیەتی *Unity* : دەبێ سیستەمی پاراستنی کۆمەلایەتی بە پێی پرەنسیپی سۆلیدارێتی و خۆشگوزەرانی هاوبەش لە لایەن خزمەتی گشتیەوە بەرێوە بچێت.[١٠٤] هەرچەندە ئەمە بە پلەی یەکەم روانگەی سۆسیال دیموکراتەکانە بۆ دیموکراسی و

---

١٠٣. Beveridge 1942 وەزیری تەندروستی بەریتانیا.

١٠٤ . وەرگیراوە لە: اریك کیسلاسی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١١٨.

بەردەوام لە ژێر رەخنەی توندی لیبرال دیموکراسی رادیکال دا بووە، بەلاّم توانیویەتی پارێزگاری لە هاوسەنگی نێوان بازاڕی ئازاد و پاراستنی کۆمەلاّیەتی بکاتەوە، چونکە هەروەك باربر دەلّێت:

**بازاڕی ئازاد هەم بە قازانجی سیستەمی سەرمایەدارییە و هەم بە قازانجی منە وەك بەکاربەر (مستهلك)، بەلاّم من لە کۆمەلّگایەکی دیموکراتی دا تەنیا بەکاربەر نیم بەلّکو هاوولاّتیشم. وەك هاوولاّتی دەتوانم لەگەلّ ئەوانیتر دا کاریگەریم هەبێت لەسەر گۆڕینی ئاراستەی دەرەنجامە نەخوازراوەکانی بڕیارە تاکەکەسیەکانی خۆم لە پێناو بواری کۆمەلاّیەتی دا.**[١٠٥]

واتە تاك دەشێت خاوەن ئیرادەیەکی عەقلاّنی بێت و تاکگەرایی لەجیاتی خۆپەرستی بگۆڕێت بۆ ئەویترخوازی و پێکەوە ژیان بەرهەم بێنێت.

## ج. چوار رەهەندی دیاریکردنی دیموکراسی:

**لەلایەکی ترەوە (تیللی)** چوار رەهەندی سەربەخۆ بۆ دیاریکردنی سیستەمێکی حوکمڕانی دیموکراتی یان نەبوونی دیموکراتیەت پێشنیار دەکات:[١٠٦]

١. **بەرفراوانی:** واتە پێکهاتەکانی کۆمەلّگا چۆن سوود لە مافەکان وەردەگرن و رادەی بەرفراوانی ئەم مافانە چۆنە ؟ ئایا کەمینەیەك خاوەن زۆرترین مافە و زۆرینەی کۆمەلّگا تەنیا هاوولاّتین.

٢. **یەکسانی:** لە نەبوونی یەکسانیەوە دەست پێدەکات لە نێوان چینەکانی هاوولاّتیان تا یەکسانی گشتگیر.

٣. **پاراستن:** لەنێوان کەمترین پاراستن و زۆرترین پاراستن لە سیستەمی دەولّەتدا دەجولّێت.

٤. **راوێژی پابەندی دوولایەنە:** لە نێوان پابەندبوون و پابەند نەبوونی دوولایەنە دا خۆی دەبینێتەوە.

105 .Barber,op.cit., p.244.

١٠٦. تشارلز تیللي، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٤- ٣٦ .

ئەگەر سیستەمێکی حوکمڕانی هەوڵ بدات بۆ دابین کردنی زۆرترین رادەی ئـەم چـوار رەهەندە ئەوا بە دیموکراتی وەسف دەکرێت، بەلاّم جولّە بە ئاراستەی کەمترین رادە ئەوا بە لەدیموکراسی خستن ناوزەد دەکرێت.

ئەمانــە ســەرەڕای ئــەوەی کــە بــەبێ ســنووردار کردنــی مارســەی ســەلاّحیاتی دەسەلاّتدارەکان لە رێگای جیاکردنەوە و چاودێری دەسەلاّتەکان و دامەزراندنی"دەوڵـەتی دیموکراتی ماف ویاسا" کە گرانتــی ئـازادی تـاك و گروپـەکان دابـین بکـات، پایـەکانی دیموکراسی لەرزۆك دەبێ. دیموکراسی بـە بـێ بـوونی پلـۆرالیزم وبـوونی کۆمەڵگایـەکی مەدەنی ئەکتیڤ و سەندیکا و یەکێتی کارا و بەگشتی دەزگای چالاکی دەرەوەی دەوڵەت ناتوانێ بوونی هــەبێت و هەربۆیـە پرۆسـسـێکی درێژخایـەنی سیاسـی وکۆمەلاّیـەتی و ئابووری و کلتووریە کە پێویستی بە هەندێ پێش مەرج هەیە لەوانە:[١٠٧]

١. بــەدیهاتنی دیموکراســی پەیوەســتە بــە رێــژەی هێــزی ئــەو چــین و توێــژە کۆمەلاّیەتیانەی کە پێویستیان بە دیموکراسی هەیە.

٢. دیموکراسی ناتوانێ بەبێ بوونی دەزگای دیموکراتی کە توانای ئەوەیان هەبێت بە شێوەیەکی کاریگەر هێزە چەکدارەکان کۆنترۆڵ بکەن، بەردەوامی هەبێت.

٣. دیموکراسی لیبراڵ تەنیا دەتوانێ لەو ولاّتانـە بـەدی بێـت کـە خـاوەن بونیـادی سیاسی و ئابووری و فرەیین.

٤. بوونی کۆمەڵگای چالاکی مەدەنی مەرجێکی تری بەدی هاتنی کۆمەڵگایـەکی دیموکراتیە.

جگە لەمانە هەندێ خاڵی وەك میدیای ئازاد و دەسەلاّتی سەربەخۆی دادوەری و رێکخراوە ناحکومیەکان $NGO$، جیاکردنەوەی دەسەلاّتەکان کەهەم بتوانن یەکتر کۆنترۆل بکەن و هەم یەکتر تەواو بکەن، کە ئەمانە وا دەکات سیاسـەتی گشـتی شـەفاف بێـت و خەڵك متمانەیان بە حکومەت هەبێت، چونکە دیموکراسی سیستەمێکە خۆی لە بەرانبەر ئەگەرە جیاوازەکان دا رادەگرێت و پارێزگاری لە کۆڵەگە سەرەکیەکانی دەکات. هەربۆیە پێویستی بوونی ئاستێکی دیاریکراو لە متمانە (الثقـة) بە مەرجێکی زەرووری دەزانرێت

١٠٧. منوچهر صالحی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٨٣تا١٨٧.

بۆ دیموکراسی و نەبوونی هەڕەشە لە دیموکراسی دەکات کە لەم خالانەدا خۆیان دەنوێنن:[108]

أ. هاوکاری کردن لەگەڵ حکومەت لە سەر بنەمای پابەندبوون نەك زۆرەملێ و داپلۆسین.

ب. دەبێ بەبەراورد لەگەڵ فۆرمەکانی تری حوکمڕانی سیستەمە دیموکراسیەکان ئاستێکی بەرزتر لە متمانە بە حکومەت داوا بکەن، چونکە بەخشینی دەسەڵات بە نوێنەر و بەرپرسەکان لەسەر بنەمای متمانەی رەها دەبێت.

ج. دەستاودەست کردنی دەسەڵات لەلایەن حزبەکان پشت بە متمانە دەبەستێ.

د. دیموکراسی سیستەمێکە لە خودی خۆیدا زیاتر لەبەر دەم موجازەفەیە، هەر بۆیە ئەوانەی متمانەیەکی گەورەیان بە سیاسەتی دیموکراتی هەیە هاوکاری سیستەم دەکەن. کەواتە بە شێوەیەکی گشتی لە سیستەمی دیموکراتی دا کە لەسەر بنەمای پرەنسیپی سەروەری گەل و مافی سیاسی یەکسان بۆ هەموو هاوولاتیان دامەزراوە نابێت پەیوەندی رەگەزیی و ئەتنی و ئایینی و... نابێت رۆڵیان هەبێت. دیموکراسی بە بوونی مافە بنەڕەتیەکانی هاوولاتی بوون و بەرخورداربوونی تاك لە پاراستنی دەوڵەتی یاسایی و پێش گرتن لە پێشێل کردنی مافی هاوولاتی بوون لە لایەن دەزگا حکومییەکان ممکین نییە. دیموکراسی بە بێ بوونی مافی بەشداری و دەرفەتی یەکسان بۆ تاك و پاراستنی کەمینە مانای نییە. واتە دیموکراسی چەندە رای زۆرینەیە هێندەش پاراستنی مافی کەمینەیە بە تایبەتی لە کاتێك دا کە پرسەکە پەیوەندی بە دادپەروەری ئالۆێریەوە نەبێت بەڵکو پەیوەست بێت بە شوناس و کلتوری کەمینەوە، لێرە دا پێوەری (٤) رۆبەرت دال بایەخی خۆی دەردەخات.

### د. چوارچێوەی رێکاریانەی دیموکراسی:

لە لایەکی ترەوە لە چوارچێوەی رێکاریشەوە دەتوانیین ئاماژە بە هەندی توخم بکەین کە بریتین لە:[109]

١٠٨. تشارلز تیللي، سەرچاوەی پێشوو، ١٦٢-١٦٣.

١٠٩. فالح عبدالجبار، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٥١-٢٥٢.

١ . كۆنترۆڵ كردنی بڕیارە سیاسیەكانی حكومەت كە بە شێوەیەكی دەستووری بە دەستە هەڵبژێردراوەكان دراوە.

٢ . بەرپرسە هەڵبژێردراوەكان لە هەڵبژاردنی دووبارە و دادپەروەرانە دا دیاری دەكرێن كە بە شێوەیەكی ڕێژەیی دوورە لە ناچارەكی.

٣ . لە ڕووی كردەییەوە هەموو پێگەیشتووەكان مافی هەڵبژاردنی بەرپرسەكانیان هەیە.

٤ . لەڕووی كردەییەوە هەموو پێگەیشتووەكان مافی وەرگرتنی پێگەیان هەیە لە حكومەت دا بە پێی هەڵبژاردن.

٥ . هاوولاتیان مافی رادەربڕینیان هەیە بە بێ ترس لە سزایەكی دلڕقانەوە.

٦ . هاوولاتیان مافی گەڕانیان هەیە بە دوای سەرچاوەی بەدیلی زانیاری دا سەرەڕای ئەوەی كە سەرچاوە بەدیلەكان لە لایەن یاساوە دەپارێزرێن.

٧ . هاوولاتیان مافی دروست كردنی كۆمەڵە و ڕێكخراوی تاڕادەیەك سەربەخۆیان هەیە، بە حزبی سیاسی سەربەخۆ و كۆمەڵەی خێرخوازیشەوە.

سەرەڕای گرنگی هەموو ئەم توخمانە دیموكراسی كاریگەری لەسەر گەشەپێدانی ئابووری و مرۆیی هەیە و ئەویش بەهرە و توانای تاكەكان بەرز دەكاتەوە، هەربۆیە راپۆرتی بانكی نێودەولەتی ٢٠٠٦ باس لە گرنگی پەیوەندی نێوان دیموكراسی و گەشەپێدانی ئابووری دەكات و « تەنانەت دیموكراسیەت بە بنەمای گەشەپێدانی ئابووری ساخلەم و دادپەروەری و ئینساف لەقەڵەم دەدات».[١١٠] دواجار هەر وەك (تۆرین ) دەڵێت ناوەرۆكی دیموكراسی ئەوەیە كە فێر ببین بەیەكەوە بژین، سەرەڕای جیاوازییەكانمان جیهانێك بنیات بنێین كە زۆرتر و زۆرتر كراوە بێت ، لەهەمان كاتدا زۆرترین هەمەرەنگیش(تنوع) لەخۆ بگرێت، ئەگەر پەیوەندیكاری بەبێ یەكیەتی(وحدة) ئاستەم بێت ئەوا بێ هەرەنگی مەرگ بالادەست دەبێت بەسەر ژیان دا، نابێت هیچ كام لەم دووانە بكەینە قوربانی یەكتر.[١١١]

---

١١٠. تشارلز تیللي، سەرچاوەی پێشوو،ل ٣١٧.

١١١. آلان تورین ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦.

**لـە رووی بنـەماوە دیموکراسـی یەکێکـە لـە مۆدێلـە گونجاوەکـانی حـوکمڕانی کـە زەمینەیەکی لەبار بۆ فرەیی کلتوری و سیاسی** دەڕەخسێنێت و تێیدا بـە شـێوازی جیـاواز شوناسەکان گوزارشت لە خۆیان دەکەن و ئەمەش لە میـانی دەزگـا و دامـەزراوەی یاسـایی و دیموکراتی بەئەنجام دەگات کە هەم میکانیزمی دیموکراسین و هەم بـەرەنجامی ئـەم پرۆسسـەن، لەسەردەمی بە جیهانی بـوون دا و پـاش هـەرەس هێنـانی ئایـدۆلۆژیا نەیارەکـەی لـە رووی سیاسیەوە واتە کۆمۆنیزم، دیموکراسی لیبرالّ وەك مۆدێلی بالاْدەسـت و سـەرکەوتوو، بـەرەو ڕووی رەخنەی جدی بۆتەوە کە کە دەتوانین ناوی بنێن دوورکەوتنەوە لە ناوەرۆك یان ماهییەتی دیموکراسی، کە بریتیە لەو کێشەیەی کە ئەو بڕیار وسیاسەتانەی کە بە ناوی ئیرادەی گەل یـان خەڵکەوە دەردەچن لە پراکتیك دا پێداویستی ئایدۆلۆژی و چینایەتی بیٚ پـڕ دەکرێتـەوە و لـە راستی دا میکانیکیەتی پرۆسسی دیموکراسی پێش ماهییەتی دیموکراسی کەوتووە.

ئەمە سەرەتایەکی کورتە بۆ توێژینەوە لەسەر فکری سیاسی (یورگن هابرمـاس) کـە بەیەکێك لە فەیلەسـوفەکانی هـزری دیموکراسـی هاوچـەرخ لەقەڵـەم دەدرێـت کـە کـۆی سیستەمی فەلسەفیەکەی لەسەر بنەمای بڕوابـوون بـە دیموکراسـی و لێـك تێگەیشـتن و پەیوەندیکاری و کارلێك دامەزراوە و مۆدێلێـك پێشـکەش دەکـات کـە بـە دیموکراسـی رێکاری یان راوێژگەری ( الديمقراطية التشاورية) ناسراوە کە راسـتەوخۆ لەسـەر بنـەمای تیۆری رەخنەیی و لەمیانی هەڵسەنگاندن و رەخنەگرتن لە تێڕوانینی و جیهـانبینی ئـەم ئاراستە و تەوژمانە بە تایبەتی روانگەی هەر دوو مۆدێلی بالاْدەسـتی دیموکراسـی واتـە رەوتی کۆماریخوازی و رەوتـی لیـبرالی بـۆ مـاف و هـاوولاْتیبوون و پرۆسسـی سیاسـی، دامەزراوە.

# باسی یەکەم

## یورگن هابرماس و قوتابخانەی فرانکفۆرت

قوتابخانەی رەخنەیی فرانکفۆرت ناوەندێکی هزری مارکسیی و ڕێبازیکی نوێ بوو لە بواری فەلسەفە و زانستی سیاسەت و کۆمەڵناسی دا، کە سەرچاوەکەی بۆ "ئەنیستیتوتی توێژینەوەی کۆمەلاّیەتی"* زانکۆی گۆتەی شاری فرانکفۆرتی ئەڵمانیا دەگەڕێتەوە. بەشێوەیەکی گشتی تیۆری رەخنەیی بریتییە لەو بیروبۆچون و توێژینەوە ولێکۆڵنەوانەی کەبیرمەندانی قوتابخانەی فرانکفۆرت خستویانەتەڕوو کە بنەماکانی پشت بەم سێ سەرچاوەیەی خوارەوە دەبەستێت: ١) فەلسەفەی عەقلانّی لە رۆسۆوە بۆ هیگڵ. ٢) ئابووری سیاسی کارل مارکس. ٣)دەروونشیکاری فرۆید.[١١٢] گرنگترین بیرمەندانی قوتابخانەی فرانکفۆرت بریتی بوون لە (ماکس هۆرکهایمەر، تیۆدۆر ئادۆرنۆ، هێربرت مارکۆزە، والتر بنیامین و لە نەوەی دووەمیش یورگن هابرماس و لە نەوەی سێیەمیش بیرمەندی ئەڵمانی ئەکسڵ هۆنیس)** کە لە بوارە جیاوازەکانی زانستی کۆمەلاّیەتی و بەتایبەتی لە لەمەڕ

---

* یەکەمین دامەزراوەی توێژینەوەی مارکسی بووە لە رۆژئاوای سەرمایەداری دا کە لە ساڵی ١٩٢٣ بە پاڵپشتی و سەرمایەی (فلیکس ڤایل*Felix Weil*) سەرمایەداری خاوەن کۆمپانیا دامەزرێنراوە.لە ساڵی ١٩٣٠ (ماکس هۆرکهایمەر ) سەرۆکایەتی ئەم ئەنیستیتیوتەی گرتۆتە ئەستۆ کە یەکێکە لە بیرمەندە دیارەکانی ئەڵمانیا. هۆرکهایمەر بیرۆکەی سەرەکی و بەرایی ئەم پەیمانگایەی بە یارمەتی تیۆدۆر ئادۆرنۆ دارشت. ئەندامانی ئەم دامەزراوەیە لە شەردەمی هەژموون و دەسەلاّداریێتی نازی بە ناچاری روویان لە تاراوگە(مەنفا) کردوو و زۆربەیان بەرەو ئەمریکا کۆچیان کرد. لە سەرەتای ١٩٥٠ گەڕانەوە بۆ ئەڵمانیا. پاش مردنی ئادۆرنۆ لە ساڵی ١٩٦٩ پەیمانگاکە هەڵوەشایەوە و لەگەڵ مردنی هۆرکهایمەر سەردەمی چالاکی قوتابخانەی فرانکفۆرت وەك دامەزراو کۆتایی پێ هات. (حسینعلی نوزری، بازخوانی هابرماس ، نشر چشمە ، تهران، ١٣٨١(٢٠٠٢)، ص١٠٥-١٠٦).

١١٢. د. شیرزاد احمد النجار، دراسات في علم السیاسة، مطبعة وزارة الثقافة، اربیل، ٢٠٠٤، ل٧٧.

** جگە لەم چوار بیرمەندە کە بەشێوەیەکی سەرەکی ناویان لەگەڵ قوتابخانەی رەخنەیی و تیۆری رەخنەیی دادێت ، ئەم بیرمەندانەش لە بواری جیاواز دا لەم قوتابخانەیە کاریان کردووە. فردریش پۆلۆك ی ئابووریناس ،

پەیوەندی نێوان ئەم بەشە جیاوازانە و دیاردە سیاسییەکانی وەك فاشیزم و تۆتالیتاریزم و نەزعەی دەسەلاتخوازی و دانپیانان لە کۆمەلگای مۆدێرن دا لێکۆلینەوەیان ئەنجام داوە.

## تەوەری یەکەم: قوتابخانەی تیۆری رەخنەیی

بیروبۆچوونی ئەم قوتابخانەیە کە دواتر بە "تیۆری رەخنەیی"ش ناوبانگی دەرکرد، لە مناقشە و خۆیندنەوەی فیکری لەسەر فەلسەفەی ئایدیالیستی هیگڵ و رەخنەی مارکس لەمەڕ ئابووری سەرمایەداری و توێژینەوەکانی فرۆید لەسەر تێکچوونی دەروونی سەری هەڵدا. هۆرکهایمەر لە وتاری"تیۆری کلاسیکی و تیۆری ڕەخنەیی" دا کە دواتر بە مانفێستی قوتابخانەی فرانکفۆرت یان مانفێستی ١٩٣٧ ناوبانگی دەرکرد، ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە « وشەی ڕەخنە لێرەدا ئەوەندەی بە مانای ڕەخنە لە دیالێکتیکی ئابووری سیاسی بەکارهاتووە هێندە واتای ڕەخنەی ئایدیالیستانە نییە لە عەقڵی پەتی».[١١٣] پرۆسسی رەخنەش بە پشت بەستن بە عەقڵ بەمانات هیگڵیەکەی ئەنجام دەدرێت کە پیوەستە بەئازادییەوە و لێرەوە چەمکی"عەقڵ" وەك بیرۆکەیەکی فەلسەفی سەری هەڵدا بەو پێیەی ئەم عەقڵە توانای دۆزینەوەی جەوهەری دیاردەکانی هەیە، جەوهەرێك کە بەشێوەیەکی ریشەیی جیاوازە لە سیما رواڵەتیە ئەبستراکتەکان.[١١٤]

---

ئەریك فرۆم دەروونناس و دەروونشیکاری بەناوبانگ، ئۆتۆ کرشهایمەرفرانس نومان لە بواری ماف وسیاسەت دا، هنریك گروسمەن وئارکادی گرلند لە بواری ئابووری سیاسی دا، لیۆ لوڤینتال لە بواری ئەدەب دا،برونۆ بتلهایم و ناتان ئاکرمەن و ماری یەهودا لەبواری دەروونناسی دا. سەرچاوە: حسینعلی نوزری، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٦.

١١٣. حسینعلی نوزری، نظریەی انتقادی مکتب فرانکفورت، مۆسسە انتشارات آگە ، تهران، ١٣٨٤(٢٠٠٥) ص٢٤١.

١١٤. توم بوتومور، مدرسة فرانکفورت ، ت:سعد هجرس، مراجعة د. محمد حافظ دیاب، دار اویا، ط٣، بنغازي، ٢٠٠٤، ل ٥٨.

**به گشتی له ڕوانگەی تیۆری ڕەخنەییەوە ، کۆمەڵگا بەشێوەی هیگڵی وەك سیستمێك سەیر دەکرێت که تێیدا تاکەکان به دوای بەرژەوەندی و حەزی تایبەتی خۆیانەوەن و حەتمەن بەرەو پەیوەندی دوولایەنه ، دابەشکردنی کار ، بەرهەم هێنانی کالا بەپێی سیستەمی ئاڵوێر، کاری گرێگرتە، ناوەندێتی بیرۆکراسی و دەوڵەتی وبەگشتی بەرەو عەقڵی ئامرازی ئاراسته دەکرێن، ئەم سیستەمە له ڕوانگەی تیۆری ڕەخنەییەوە له خودی خۆیدا بەرەوە قەیران دەچێت.**[115]

گەڕانەوەی بیرمەندانی ئەم قوتابخانەیە بۆ فەلسەفەی هیگڵ چوارچێوەی بەشی زۆری بەرهەمەکانیان پێك دێنێ و له میانی ژمارەیەك لەو چەمك و زاراوانە دەردەکەوێت که چاوگەکەیان بۆ فەلسەفەی هیگڵ دەگەڕێتەوە (بۆ نموونە چەمکی نامۆبوون- الأغتراب *Alienation*، ئەم چەمکە چوارچێوەی بیرکردنەوەی بەشێکی زۆر له بیرمەندانی قوتابخانەی ڕەخنەیی پێك دێنێ و ناوەرۆکەکەی بریتیه لەوەی که مرۆڤ نامۆیە بە توانست و ماهیەتی خۆی چونکه خاوەنبەرهەمی کاری خۆی نییه، کۆمەڵگای پیشەسازی پێشکەوتوو بەشێوەی جیاواز و له ئاستی کلتوری و ئابووری دەبێتە هۆی نامۆبوون و بەشتبوون *Reification* . «چەمکی بەشت بوون و نامۆبوون له دەسەلاتی سیستەمی بیرۆکراسی وئامرازەکانی سەرکوت کردنی ئیداری دا دەردەکەوێت، نامۆبوونی مرۆڤ لە پرۆسەی یەکخستنی پێداویستیە مرۆیەکان و بەیاسایی کردنی شێوازەکانی ڕەفتار دا خۆی دەنوێنێ».[116] بەشێوەیەکی گشتی هەندێ ئاراستەی جیاواز نوینەرایەتی قوتابخانەی فرانکفۆرتیان کردووە که دەتوانین بەم جۆرە کورتیان بکەینەوە.

١- ئاڕاستەی (هۆرکهایمەر) ** و(ئادۆرنۆ) کە نوێنەرایەتی میتۆدی ڕەخنەیی دیالیکتیکیان دەکرد که ئامانجەکەی بریتی بوو له یەکخستنی تیۆر و پراکتیك و پێشکەش

---

١١٥. حسین بشیریه، اندیشه‌های مارکسیستی، جلد اول، نشر نی، تهران، چاپ ٧،١٣٨٦ (٢٠٠٧)،ل١٧٠.

١١٦. ابو النور حمدي ابوالنور حسن، يورجين هابرماس- الاخلاق و التواصل، دار التنوير، ل٢٩ و٤٤.

** *Max Horkheimer* ساڵی ١٨٩٥ لەدایك بووە، له ساڵی ١٩١٧ بۆ ماوەیەکی کورت چۆتە ریزی سوپاوە دوو ساڵ پاشتر له مونیخ دەستی کردووە به خوێندنی سایکۆلۆژیا و فەلسەفە، له ١٩٢٢ دکتۆرای فەلسەفەی وەرگرتووە .له کۆتایی بیستەکان بووە بە سەرۆکی ئەنیستیتیوتی توێژینەوەی کۆمەلایەتی له

کردنی تیۆرێکی رەخنەیی لەمەڕ کۆمەڵگا کە بتــوانێ لەبەرانبــەر بیرۆکــەی دەســەلاتخوازی و توندوتیژی دا بوەستێت وهەوڵ بدات بۆ دروست کردنــی فکــری رەخنــەیی لــە خــودی خۆیــدا بەلیبرالی و نالیبرالیەوە.

٢- ئاراستەی (هێبرت مارکۆزە )کــە خــۆی لــە رەدکردنــەوەی کۆمــەڵگای داپلۆســێنەری هەنووکەیی و شۆڕش لەدژی دا دەبینێتەوە لە میانی جەخت کردن لەسەر رۆڵی یەکلاکەرەوە و شۆڕشگێڕانەی عەقڵ لە ژیانی مــرۆڤ دا و ســەیر نــەکردنی کۆمــەڵگا لــە روانگەیــەکی تــاك رەهەندەوە.

٣- ئاراستەی سایکۆلۆژی– شیکاری کە خۆی لە بیروبۆچوونی (ئەریك فــرۆم)و فرۆیدییــە نوێیەکان دا دەبینێتەوە.

٤-ئاراستەی (یورگن هابرماس) کە ئاراستەیەکی فەلسەفی ئەنترۆپۆلۆژیــە و جــەخت لــە توێژینەوە لەسەر سەرمایەداری پێشکەوتوو دەکاتەوە وەك کۆمــەڵگای پیشەســازی عــەقلانی خاوەن ئایدۆلۆژیای تەکنۆکراتی.[١١٧]

٥- ئاراستەی ئەکسڵ هۆنیس[١١٨] کەلەسەر بنــەمای دانپیانــانی دوولایەنــە دامــەزراوە و پێیوایە داپیانانی کۆمەلایەتی بەشێکی دانەبڕاوە لە بونیادی کردەی پەیوەندیکاری.[١١٩]

---

فرانکفۆرت.هەندێ لە بەرهەمەکانی بریتین لە **: *عەقڵ گیران* Eclipse of Reason، *تیۆری رەخنەیی و تیۆری نەریتی(کۆمەڵە وتار) ، رەخنە لە عەقڵی ئامرازی.*** (سەرچاوە: تئودور و. ادورنو – ماکس هورکهایمر،دیالکتیك روشنگری،ت:مراد فرهادپور و امید مهرگان،گام نو،چاپ ٣ ، تهران،١٣٨٧(٢٠٠٨).)

١١٧ . د.ابراهیم الحیدري ، مدرسة فرانکفورت... تأسیس نظریة نقدیة للمجتمع ، لەم سایتەی خوارەوە:

. http://www.bohothe.blogspot.com/2010/03/blog-post_27.html

١١٨. ئەکسڵ هۆنیس 1949) *Axel Honneth*– ) نەوەی سێیەمی قوتابخانەی فرانکفۆرت، بەرێوبەری ئێستای ئەنیستیتوتی توێژینەوەی کۆمەلایەتی لە فرانکفۆرت.

١١٩. د. کمال بومنیر، النظریة النقدیة من هورکهایمر الی اکسل هونیث ، دار العربیة للعلوم ناشرون و منشورات الاختلاف، بیروت، ٢٠١٠، ل ١٦٣.

(هۆرکهایمەر) پاشوەرگرتنی پۆستی سەرۆکایەتی لە وتاری دەستبەکاربوونیدا کە لـە ژێـر ناونیشانی "ڕەوشی هەنووکەیی فەلسـەفەی کۆمەلاّیـەتی و ئـەرکی ئەنسـتیوتی توێژینـەوەی کۆمەلاّیەتی "هێڵی فیکری خۆی ڕوونکـردەوە کـە پێچـەوانەی مارکسـیزمی ئـەرتۆدۆکس و گەڕایەوە بۆ ئیستعاب کردنـی پرەنسـیبەکانی مێـژووی فەلسـەفەی کۆمەلاّیـەتی وقوتابخانـە نوێیەکانی کۆمەڵناسی وکانتیزمی نوێ.[120] کەواتە دەتوانین بلێین توێژینـەوەکانی قوتابخانـەی فرانکفۆرت تەنیا جەخت نەبووە لەسەر ژێرخانی ئابووری بەڵکو بایەخیان بە رۆڵی کلتـور دەدا لە دروست کردنی  هۆشیاری ساختە بۆ مرۆڤ و بە شت کردنی تاکەکان لـە پرۆسسـی بەرهـەم هێنان بە پشت بەستن بە جۆرێك لە مەعریفە و لەم نێوەدا رەخنەیان ئاراسـتەی پـۆزەتیڤیزم و سـەرهەڵدانی هـزری فاشـیزم وعـەقڵی تۆتالیتـاری کـردووە وەك بـەرەنجامی رۆشـنگەری و عەقلانیەتی ئامرازی و تەکنیك و بالاّدەستی لە کۆمەڵگای مـۆدێرن دا کـە لـە خـوارەوە بـە کورتی ئاماژەیان پێ دەکەین:

## ١- ڕەخنە لە پۆزەتیڤیزم:

لەگەڵ بـەرفراوان بـوونی دژایـەتی نێـوان ئاڕاسـتەی نـەریتی و ئاراسـتەی ڕەخنـەیی لـە کۆمەڵناسی دا ، کاریگەرییەکانی لە پانتایی سیاسەت دا بەدیارکـەوت، بـەڕای هۆرکهایمـەر تیۆری نەریتی واتە پۆزەتیڤیزم (الوضعية) «لە هەوڵدان دایە بۆ ڕوونکردنـەوەی یاسـاو ڕێسـا کۆمەلاّیەتییـەکان و خـۆی لـە تیـۆری ڕەخنـەیی جیادەکاتـەوە. ئامـانجی تیـۆری رەخنـەیی تێگەیشنە لەم خالّە کە چۆن دەکرێت ئاستەنگ و لەمپـەرە سیاسـی و کۆمەلاّییـەکانی سـەر ڕێگای تاك کەم بکرێنەوە وئەگەر کرا بە تەواوی نەهێلرێن».[121] ئەمەش لە پێناو رەخسـاندن و بەدیهێنانی ئازادییە واتە تیۆری رەخنەیی پێیوابوو لە توانای زانست دایە کە یارمەتی مـرۆڤ بدات بۆ رزگاربوون لە کۆتوبەندکان، هـەر بۆیـە ئـەم تیـۆرە  تـەنیا وەسـفیی نییـە بـەڵکو معیارییە و ئامادەی تێدایە یارمەتی گۆڕانی کۆمەلاّیەتی و سیاسی بدات. لە روانگەی تیۆری

١٢٠. علاء طاهر، مدرسة فرانكفورت من هوركهايمر الى هابرماس، منشورات مركز انماء القومي، بيروت، بلا تاريخ، ص ٤٤-٤٥.

١٢١. حسینعلی نوزری، نظریەی انتقادی مکتب فرانکفورت ، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٧.

رەخنەییـــەوە «کێشـــەی ســـەرەکی پـــۆزەتیڤیزم بـــۆ ئەوجیاکارییـــە دەگەڕێتەوەکـــە لـــەنێوان "حەقیقـــەت" و"بـــەها" دا دەیکـــات، هۆرکهایمـــەر پێیوایـــە پـــۆزەتیڤیزم حەقیقەتـــە هەندەکییەکان(جزئـي) ناخاتە ناو چوارچێوەی هەمـەکی(کلـي) ».[122] واتـە هێنـدەی جـەخت لەسەر بەهاکان دەکاتەوە وەك دەرکەوتەی پەیوەندییە کۆمەلآیەتی و کلتوری و سیاسـییەکان، ئەوەندە بایەخ بە حەقیقەت نادات وەك خواست و ئایدیایەکی مرۆیی، بـەڵکو بـە شـێوەیەکی سەرەکی لە خزمەت وەسفکردن و پەسەند کردنـی ڕەوشـی هەنووکـەیی دایـە، بـەلآم تیـۆری رەخنەیی بیرکردنەوەیەکی ئایدیالّی سەبارەت بە کۆمەڵگا دەخاتەڕوو، لەم تیۆرە دا پانتـایی و بەشی جۆراو جۆری زانستە مرۆیی وکۆمەلآیەتییەکانی وەك فەلسەفە، کۆمەڵناسـی، زانسـتی سیاسەت، ئابووری، دەروونناسی، ئـەدەبیات، هونـەر و ئیسـتاتیکا، فیمینـزم..... هتـد بـۆ شـیکردنەوەی پـرس وکێشـەکانی کۆمـەڵگای هاوچـەرخ و خسـتنە ڕووی ڕێگـا چـارە، بەکارهێنراون.[123]هۆرکهایمەر لە سێ خاڵ دا رەخنە لە پۆزەتیڤیزم دەگرێت:[124]

١. وەك حەقیقەت و شتی ئەبستراکت و لـە نـاو چوارچـێوەیەکی دیـاریکراو و پلانرێـژی حەتمیەتی میکانیکی دا مامەڵە لەگەڵ مرۆڤی تەژی لە زینوێتی و چالاکی دەکات.

٢. وەك پێدراوێکی راستەوخۆ تەنیا لە ئەزموون دا وێنای جیهان دەکـات و بـە جۆرێـك ئەمەی بردە پێش کە تەنیا جیاکردنەوەی رواڵەت و جەوهەری نەگرتەوە.

٣. جیاکارییەکی رەها دەکات لـە نێـوان حەقیقـەت و بـەها دا و پاشـان مەعریفـە لـە بەرژەوەندی مرۆیی جیادەکاتەوە. کەواتـە تێگەیشـتنێکی گونجـاو سـەبارەت بـە کۆمـەڵگا ناخاتەڕوو، داکۆکی لە رەوشـی هەنووکـەیی دەکـات لـە بەرانبـەر گـۆڕان و یـان لانـی کـەم گۆڕانکاری بە ئەرکی زانست نـازانێ، پشـتگیری هـەژمون و بەرهـەم هێنانـەوەی دەسـەلآتی تەکنەلۆژیا دەکات.

---

١٢٢. توم بوتومور، سەرچاوەی پێشوو،ل ٦٥-٦٩.

١٢٣. مایکل پیوزی ، یورگن هابرماس ،ت:احمد تدین ، انتشارات هرمس ، تهران ، ١٣٧٩ -٢٠٠٠ ، ل ١٠٦.

*-Michael Pusey ,Jurgen Habermas ,Routledge , New York and London , 2003 ,P. 106.*

١٢٤. توم بوتومور ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٤.

## ٢- شیکردنەوەی ڕەخنەیانەی فاشیزم و تۆتالیتاریزم:

سەرکەوتنی بزووتنەوە نازی و فاشیستەکان لە ئەورووپا پاش جەنگی یەکەمی جیهان و تێکشکاندنی بزووتنەوە و ڕەوتە کرێکارییەکان، هەندێك لە بیرمەندە مارکسییەکانی ڕۆژئاوای خستە سەر ئەو ڕایەی کە پێویستە لە ڕوانگەیەکی رادیکاڵ و ڕەخنەییەوە جارێکی تر مارکسیزم بخوێندرێتەوە، چونکە حەتمییەت و دیالیکتیکی مێژوویی و سەرکەوتنی پرۆلیتاریا و ڕزگاربوون لە چەوسانەوە بوو بە شتێکی دوور لە واقیع، هەربۆیە ئەم بیرمەندانە لە مارکسیزمی ئەرتۆدۆکس وئابووری پاشەکشێیان کرد و جارێکی تر گەڕانەوە بۆ بەرهەمەکانی خودی هیگڵ چونکە لای ئەوان مارکس خوێندنەوەی هیگڵ بوو ئەمان هەوڵیان دا ڕاستەوخۆ تاوتوێی بەرهەمەکانی هیگڵ بکەن. «بەم جۆرە بەشێکی گەورەی هزری مارکسیی سەدەی بیستەم دەرئەنجامی گەڕانەوەیە بۆ نەریتی فەلسەفی هیگڵ. بیرۆکەی سەرەکی فەلسەفەی هیگڵ کە پێیوایە دەبێت واقیع بە عەقلانی بکرێت بنچینەی ئەم قۆناغەی هزری سیاسی سەدەی بیستەم پێك دێنێت».[١٢٥]

بیرمەندانی تیۆری ڕەخنەیی ئاماژە بە بوونی پەیوەندیەکی تۆکمە دەکەن لە نێوان سیستەمی سەرمایەداری و فاشیزم دا و لەم نێوە دا هۆرکهایمەر جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئەوەی نایەوێت قسە لەسەر سەرمایەداری بکات ئەوا ڕاستگۆیە لەبەرانبەر فاشیزم دا.[١٢٦] بەم جۆرە لەسەر ئەو ڕایە بوون کە لە کۆمەڵگای مۆدێرن و هاوچەرخی ڕۆژئاوادا بەهۆی گەشەکردنی تەکنەلۆیا و سەرمایەداری مۆنۆپۆلیەوە یەك فۆرم بە ژیانی تاکەکان دەبەخشریت و لە هەموو لایەکەوە دەخرێنە ژێر چاوەدێریەوە و ئەمەش زەمینەی بەرایی سەرهەڵدانی تۆتالیتاریزمە. لە تێڕوانینی ئەوان پەیوەندیەکی تۆکمە لە نێوان ئابووری سەرمایەداری و تەکنەلۆژیاو دەسەڵات دا هەبوو « بناغەی بەرفراوان بوونی دەسەلاتی تەکنەلۆژیا بەسەر کۆمەڵگادا، بۆ دەسەلاتی ئەو کەسانە دەگەرێتەوە کە بالادەستی ئابووریان بە سەر کۆمەڵگا دا لە هەمووان زیاترە. ئەمڕۆ عەقلانیەتی تەکنیکی بریتیە لە عەقلانیەتی دەسەلات. ئەوە خەسڵەتی جەبریی ئەو کۆمەڵگایەیە کە نامۆبووە بە خۆی».[١٢٧]

---

١٢٥. حسین بشیریە، سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٤.

١٢٦. ابو النور حمدي ابوالنور حسن ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٧.

١٢٧. تیودور و. آدورنو و ماکس هورکهایمر ، دیالکتیك روشنگری ، نشر گام نو، چاپ ٣، تهران،١٣٨٧(٢٠٠٨)، ل٢١١.

به بڕوای بیرمەندانی تیۆری ڕەخنەیی فاشیەت سیستەمێکی روخێنەر و دژە تاکە و هەڵ دەدات بۆ دروست کردنی زەینێکی تاکڕەهەند و بەرتەسك بۆ ئـەوەی بتوانرێـت بـە ئاسـانی کـۆنترۆڵ بکرێت، بۆ ئـەم مەبەسـتە هـەوڵی دا کەلـەپوور و کلتـوری مێـژوویی ئـەوروپا لـە ڕەگـەوە هەڵکەنێت، لێرەوە بیرمەندانی تیـۆری ڕەخنـەیی ، بـە قـوڵی دەسـتیان کـرد بـە توێژینـەوە سەبارەت بە ئازادی ، مافی تاك و بایەخی مرۆڤ وسەرجەم چەمکەکانی تر کە بە هۆی هێرشـی ڕوو لـە زیـادی دەزگـاو بـیرو بۆچـوونە تۆتالیتارییـەکان و گەشـەکردنی کلتـوریکی سیاسـی نادیموکراتی و بلاوکردنەوەی هزری توندوتیژی و سڕینەوەی جیاوازیەکان بەرەو نەمان دەچـوون، به بڕوای هۆرکهایمەر «سەربەخۆیی تاك لە فەردانیەتەکەی دایـە».[١٢٨] لـە پرۆسسـی دروسـت کردنی کلتوری مۆدێرن دا کە بە بڕوای (ئادۆرنۆ) و (هۆرکهایمەر) زەمینـە سـازییەکی روونـی تێدایە بۆ تۆتالیتاریزم « تاك دەبێتە جۆریك لـە وەهـم، ئـەویش نـەك لەبـەر سـتاندەربوون و وەکیەیەکی شێوازی بەرهەم هێنان، بەڵکو بوونی تاك تا کاتێ تەحـەمول دەکرێـت کـە هـیچ گومانێك نەبێت لە هاوتابوونی لەگەڵ گشت دا».[١٢٩] واتە بە یارمەتی دەسکەوتەکانی عەقڵی مـــۆدێرن و تەکنـــەلۆژیا و پێشـــکەوتنی پیشەســـازی و لـــە ڕێگـــای ئایـــدۆلۆژیای هێـــزە تۆتالیتێرەکانەوە جۆرێك لە یەکڕەنگی دروست بکرێت کـە تـاك وەك مۆرەیـەکی دەسـتەمۆ و رامکراو بێ بیرکردنەوە و ملکەچانە لە خزمـەت دەسـەلآت دابێـت، لـەم نێـوە دا (هێربـرت مارکۆزە) رای وایە کە:

**دەتوانین ڕەگەکانی فاشیزم لـە دژایـەتی هەمیشـەیی نێـوان مۆنۆپـۆلی پیشەسازی ڕوو لە گەشەو سیستەمی دیموکراتی دا بدۆزینەوە. لە ئـەوروپای پاش جەنگی یەکەمی جیهانی دەزگا و ئامرازە پیشەسازییەکان کـە زۆر بـە عــەقلآنی کرابــوون و بــە خێراییــەکی زۆر گەشــەیان ســەندبوو، لــە بــواری بەرهەمداری دا توشی دژواریەکی زۆر هاتبوون... لە سیستەمی سیاسی تازە دا بە بـێ پیـادەکردنی گوشـارێکی بـەردەوام بـە ئاڕاسـتەی دابـین کردنـی پێداویستەکانی مرۆڤ، ناتوانرێت گەشە بە هێزەکانی بەرهـەمهێنان بـدرێت. ئەمەش پێویستی بە چاودێری تۆتالیتارانە هەیە بەسەر هـەموو پەیوەندییـە**

١٢٨. بابك احمدی ، مدرنیته و اندیشەی انتقادی، نشر مرکز، چاپ ٦، تهران، ١٣٨٥(٢٠٠٦)، ل ١٢٢.

١٢٩. تیودور و. آدورنو و ماکس هورکهایمر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٦٥.

**کۆمەڵایەتی وتاکەکەسییەکان و لەناوبردنی ئازادییە تاکەکەسی و کۆمەڵایەتییەکان  و یەکڕەنگ کردنی جەماوەری لە ڕێگای بەکارهێنانی ئامرازی ترس و تۆقاندن، کۆمەڵگا بوو بە مەعەسکەرێکی چەکدار لە خزمەت ئەم ئامانجە مەزنانە دا توانی لە بەرانبەر ململانێی ئابووری دا خۆی ڕابگرێت.**[130]

ئەم قۆناغەی مێژووی ئەوروپا بەدەرکەوتنی قەیرانی لیبرالیەت وسەرهەڵدانی سیستەمە دەسەڵاتخوازەکان و سەقامگیربوونیان جیادەکرێتەوە. گرنگترین بەشداری بیرمەندانی ئەم قوتابخانەیە لە بواری  زانستی سیاسەت دا قووڵبوونەوەیە لە پرسی دەسەڵاتخوازی وشیکردنەوەی شێوازەکانی پەرەسەندنی یاسایی وکارگێڕی لە دەوڵەتە بۆرژوازییەکاندا وبەتایبەتی توێژینەوە لەسەر ئەو قۆناغەی بە پەڕینەوە لە سیستەمی پەرلەمانی بەرەو سیستمی دیکتاتۆری تۆتالیتاریستی جیادەکرێتەوە لە ئەڵمانیا.[131] بەم جۆرە سیستەمی سیاسی و ئابووری تەواو ئاوێتەی یەکتر دەبن. (فرانس نویمان) ڕژێمی ناسونالیستی ئەڵمانی بە "سیستەمێکی ئابووری تۆتالیتار" لە قەڵەم دەدات کە لە لوتکەی دا دەوڵەتێکی تۆتالیتار بوونی هەیە کە بەسەر هەموو بوارەکانی ژیانی تاکەکەسی وکۆمەڵایەتی وپانتایی سیاسی وئابووری و کۆمەڵایەتی وئەخلاقی وهونەری دا بالادەستە، نویمان ئاماژە بەوە دەکات کە ئابووری ئێستای ئەڵمانیا، ئابووری مۆنۆپۆل و ئابووری دەسەڵاتە، وئابووری سەرمایەداری ملکەچی دەوڵەتی تۆتالیتارییە و پێشنیاری ناوی"سەرمایەداری مۆنۆپۆلی تۆتالیتاری"دەکات.[132] ئەم بیرمەندانە لە خوێندنەوەکانیاندا جەختیان لەسەر ئەوە دەکردەوە کە فاشیزم نیشانەی دوایین قۆناغی سەرمایەدارییە کە تێیدا توشی قەیران دەبێت. لەم قۆناغەی سەرمایەداری مۆنۆپۆلی دا دەوڵەت دەست بەسەر هەموو بوارەکانی ژیان وئامرازەکانی بەرهەم هێنانی ماددی و کۆمەڵایەتی وکلتووری وسیاسی دادەگرێت و هەموو جیاوازییەکان لەناو

---

١٣٠. هربرت ماركوزه، العقل و الثورة ، ت: الدكتور فؤاد زكريا، الهيئة المصرية العامة لتأليف و النشر، ١٩٧٠، ل٣٩٤.

١٣١. د. شيرزاد احمد النجار، سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٨.

١٣٢. توم بوتومور ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٤، ل ٥٥.

دەبات. بە رای مارکۆزە «سێکۆشەی هیگڵی خێزان و کۆمەڵگا و دەوڵەت، ون بوو و لەجیاتی ئەمە یەکیەتیەك سەری هەڵدا کە هەموو شتێ کەوتە ژێریەوە».[١٣٣]

(پۆلۆك) ئاماژە بە پەیوەندی بەرژەوەنـدی نێـوان دەسـەڵاتدارو گروپـەکانی بەرژەوەنـدی ئابووری دەکات کە چۆن لـە ئـابووری و سیاسـەت دا یـەکانگیر دەبـن، بەبۆچـوونی ئـەو لـە سەرمایەداری دەوڵەتی ولە شێوە تۆتالیتارییەکەیدا ، دەوڵـەت ئـامرازی دەسـەڵاتی گروپێـك حاکمی نوێیە کە لە ئاکامی ئاوێتەکردنی بەهێزترین گروپی خـاوەن بەرژەوەنـدی و قـازانج و کاربەدەست وکارمەندە پلەبەرزەکانی بەشی کارگێڕی پیشەسـازی وبازرگـانی ، توێـژە خـاوەن ئیمتیازەکانی بیرۆکراسـی دەوڵـەت و کەسـایەتیەکانی حزبـی سـەرکەوتوو سـەری هەڵـداوە، هەرکەسێ سەر بەم گروپانە نـەبێت تـەنها شـتێکی ژێردەسـتەیە .[١٣٤] کەواتـە لـە روانگـەی بیرمەندانی تیۆری رەخنەیەوە سیستەمی لیبرال دیموکراسی رۆژئاوا نەك هـەر مـاف و ئـازادی تاکەکان ناپارێزێت بەڵکو تەنیا ئامرازێکە بۆ سەرکوت و باڵادەستی گروپە ئابووریەکان.

## ٣- رەخنەگرتن لە سەرکوت و باڵادەستی لە کۆمەڵگا پیشەسازیەکان دا:

بیرمەندانی قوتابخانەی رەخنەیی، بەتایبەتی (هۆرکهایمەر) و (ئـادۆرنۆ) رەخنـەی قـوڵ و جـدیان ئاراسـتەی هـزری رۆشـنگەری *Enlightenment* کـرد وەك بنـەمای باڵادەسـتی عەقلانیەتی ئامرازی و سەرەتای قوڵ کردنەوەی هزری تۆتالیتاری، هەرچەندە رۆشـنگەری بـە ئایدیای ئازادی و پێشکەوتن و بەختەوەری مرۆڤ دەستی پێکردبوو، بەلام بە بڕوای ئادۆرنۆ و هۆرکهایمەر « ئایدیاکانی رۆشنگەری نەك هەر بەدی نـەهاتن بـەڵکو کۆیلایـەتی مرۆڤـی لێ کەوتەوە لە بەرانبەر گەشەی فاشیزم و سەرمایە و ژیان لە کۆمەڵگایـەکی تۆتـالیتێر دا».[١٣٥] بەم جۆرە لەسەر ئەو بڕوایە بوون کە رۆشنگەری سەرەڕای هەوڵدانی بۆ رزگارکردنی مـرۆڤ لـە دەسەڵاتی هێزە خورافیەکان و چەسپاندنی عەقلانیەت، ئەمرۆ « لە خزمەت سەردەمی ئێستا دا، خۆی گۆڕاوە بۆ هەڵخەڵەتاندنی بـێ ئـەملاو ئـەولای جـەماوەر».[١٣٦] زۆربـەی بەرهـەمی

---

١٣٣. هربرت مارکوزە، سەرچاوەی پێشوو، ص ٣٩٧

١٣٤. حسینعلی نوزری، نظریەی انتقادی مکتب فرانکفورت، سەرچاوەی پێشوو، ١٠٧.

١٣٥. بابك احمدی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣٠.

١٣٦. تیودور و. آدورنو و ماکس هورکهایمر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٣.

بیرمەندانی قوتابخانەی رەخنەیی بریتیە لە رەخنەگرتن لە توخم و رەهەندە جیاوازەکانی کۆمەڵگای مۆدێرن ، بە بڕوای ئەوان ناوەندی دەسەڵات لە دونیای مۆدێرن دا لە پانتایی ئابوریەوە بەرەو پانتایی کلتور چووە و جەختیان لە سەر کاریگەری دوولایەنەی بیروبۆچوونی (مارکس) و (ڤیبەر) دەکردەوە سەبارەت بە عەقلانیەت، وەك سەرەکیترین سیمای جیاکەرەوەی پرۆسسی پەرەسەندن لە جیهانی مۆدێرن دا. ڤیبەر هەوڵی داوە دوو جۆر عەقلانیەت لەیەکتری جیابکاتەوە، واتە "عەقلانیەتی شکلی *Formal*"و "عەقلانیەتی جەوهەری *Substantive Rationality*".[137] هەڵبەتە کاتێ ڤیبەر باسی پرۆسسی بە عەقلانی بوون دەکات لەسەر ئەو بڕوایە بوو کە لەگەڵ سەرهەڵدانی عەقڵی ئامرازی ( و سەرهەڵدانی کردەی عەقلانیەتی ئامرازی) و لە ناوچوونی کردەی نەریتی لە کۆمەڵگاکانی رۆژئاوا دا ، ئەم پرۆسسە لایەنێکی زۆر بەرفراوانی ژیانی کۆمەڵایەتی ئەم کۆمەڵگایانە دەخاتە ژێر کۆنترۆڵی حسابات و تێبینی ئامراز و ئامانج . بەبڕوای بیرمەندانی قوتابخانەی فرانکفۆرت کۆمەڵگای پیشەسازی دەرفەتی ئازادی لەبەردەم تاکەکان دا بەرتەسك دەکاتەوە و ئیرادەی سەربەخۆیان کۆنترۆڵ دەکات، عەقڵ لە بەرانبەر ناعەقلانیەت دا تەنازول دەکات.

لای تیۆری رەخنەیی کۆنترۆل سێ رەهەند لەخۆ دەگرێت:[138]

١- کۆنترۆڵ کردنی ژینگەی فیزیکی.

٢- کۆنترۆلی مرۆڤ بەسەر ئەویتر دا.

٣- کۆنترۆڵ کردنی ژینگەی مرۆیی.

هۆرکهایمەر پێیوابوو « بەو رادەیەی کە مەعریفەی زانستی گەشە دەکات- کە خەسڵەتێکی ئامرازی وەرگرتووە- بەهەمان رادە ئاسۆی ئازادی و بەختەوەری مرۆڤ و ئۆتۆنۆمییەکەی وەك تاك تاریك دەبێت».[139] بە رای بیرمەندانی تیۆری رەخنەیی "عەقلانیەتی رواڵەتی"تەنیا لە بیری بەدەست هێنانی کاریگەرترین ئامراز دایە بۆ بەدیهێنانی ئامانجێکی دیاری کراو بە بێ ئەوەی لە ماهیەتی ئامرازەکە رابمێنێ و ئەمە بە "بیرکردنەوەی تەکنۆکراتی" ناوزەد دەکەن و لەسەر ئەم بڕوایەن کە ئامانجەکەی خزمەتکردنە بە هێزە

---

١٣٧. حسینعلی نوزری، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٢٣و٢٢٤.

١٣٨. ابوالنور حمدی ابوالنور حسن، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٩-٦٠.

١٣٩. د. کمال بومنیر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٠.

دەسەلاتخوازەکان نەك رزگارکردنی جەماوەر لـە کـۆتی دەسـەلآت. نووسـەرانی دیـالیکتیکی رۆشنگەری بەشێوەیەکی تایبەتی لە بەرانبەر دروست بوونی ئاراستە سـڕینەوەی کلتـور و زاڵ کردنی کلتوری ئیستهلاکی دا هەستیار بوون و ئەوەیان پێشان دەدا کە لە "پانتایی گشتی"دا واتە دەزگا سەربەخۆکانی دەرەوەی دەوڵەت و پانتایی تایبەتی و بە یارمەتی میدیای گشـتی، مرۆڤ دەرفەتی جیا کردنەوەی شتی عەقلانی و ناعەقلانی لەدەست دەدات [١٤٠] و بە پشتبەسـتن بە ڕوانینی (ڤیبەر) بۆ دوو جۆرەکەی عەقلانییەت واتا عەقلانییەتی ڕواڵەتی و عەقلانییـەتی جەوهەری ، پێیانوایە کە عەقلانییەتی جەوهەری کە لە بەرامبەر عەقلانییەتی ڕواڵەتی دایە، بە پێی هەندێ بـەهای بـالای مرۆیـی وەك دادپـەروەری و ئاشـتی وبەختـەوەری ئامرازەکـان هەڵدەسەنگێنێ. ڕەخنەگرانی تیۆری ڕەخنەیی نازیەت بەگشتی و ئۆردوگـای کـاری زۆرەملـێ بەتایبەتی، وەك نمونەیەکی بەرجەستەی عەقلانییەتی ڕواڵەتی لە دژی عەقلانییەتی جەوهەری لێکدەدەنەوە، هـەروەك (جـۆرج فریسـەن) وتوویـەتی « ئاوشـۆڤیتس شـوێنێکی عـەقلانی *Rational* بوو بەڵام مەعقول *Reasonable* نەبوو». [١٤١]

کەواتـە بیرمەنـدانی قوتابخانـەی ڕەخنـەیی بەتایبـەتی لـەژێر کاریگـەری کارەسـات و وێرانکارییەکانی جەنگی دووەمی جیهانی گەیشـتنە ئـەو دەرەنجامـەی کـە عەقلانییـەتی ڕۆژئـاوا بەتایبەتی لە شێوە ئامرازییەکەی دا هۆکاری سـەرەکی کاولکارییەکانـە ، چـونکە ئـەم جـۆرە لـە عەقلانییەت کەلتور و تاکێك دروستدەکات کە لە ماهییەتی خۆی دایـدەماڵێت و لـەناو پرۆسسـی بەرهەم هێنانی سـەرمایەداری دا دەیتوێنێتـەوە کـە دواجـار وەك تـاکێکی نـامۆ وبێگانـە بـەرەو خەمساردی وپاسیڤی دەچێت و یان هەر وەك مارکۆزە دەڵێت مرۆڤ و کۆمـەڵگای "تـاك رەهەنـد" بەرهەم دێت، هەربۆیـە ئەمانـە بەتایبـەتی مـارکۆزە بانگەشـەی شۆڕشـیان دەکـرد دژی بـەها و دەسەلآتی زاڵ بەسەر کۆمـەڵگای مـۆدێرن. بـەم جـۆرە بیرمەنـدانی قوتابخانـەی فرانکفـۆرت لـە توێژینەوەکانی خۆیان دا سەبارەت بە هەندێ چەمکی وەك بەکالآیی بوونی پەیوەندییـەکان، بەشـت بوونی پەیوەندی مرۆیی و خودئاگـایی سـاختە و توخمـەکانی مرۆڤـی دەسـەلاتخواز و تاکڕەهەنـد و زاڵبوون و پەرەسەندنی ئایـدۆلۆژیا شمولییـەکان لـە کۆمـەڵگا سـەرمایەدارییە پێشـکەوتووەکان، بەشێوەیەکی سەرەکی سوودیان لە بیروبۆچونی هیگڵ و مارکس و فرۆید وەرگرت.

---

١٤٠. بابك احمدی ، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٤١.

١٤١. حسینعلی نوزری، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٢٥.

### ٤. تیۆری ڕەخنەیی و پیشەسازی کلتور ***culture industry***:

هەر وەك ئاماژەی بۆ کرا بەشێوەیەکی گشتی تیۆری رەخنەیی توێژینـەوەی مارکسـیزمی ئەرتەدۆکس هەڵوەشاندەوە سەبارەت بە باڵادەستی ئابووری بەسەر کـۆی بوارەکـانی ژیـان دا. (هۆرکهایمەر) رای وایە کە کلتور و ئایدۆلۆژیا تـەنیا ڕەنگدانـەوەی ژێرخـانی ئـابووری نـین ، بەڵکو پانتـایی تـا ڕادەیـەك سـەربەخۆن. کلتـور وئایـدۆلۆژیا ڕۆڵێکـی گـرنگ دەگێـڕن بـۆ سەقامگیرکردن و تۆکمەکردنی سیستمی هەنوکەیی.

بیرمەنـدانی قوتابخانـەی ڕەخنـەیی بەشـێوەیەکی نێگـەتیفی سـەیری کلتـور وپرۆسیسـی کلتورسازی دەکـەن، بـەجۆرێك کـە پێیـان وایـە تـەنیا لەخزمـەت چـڕکردنەوەی دەسـەڵاتی سەرمایەداری وکۆتکردنی مـرۆڤ دایـە و ئاسـۆی ئـازادی لەبـەردەم مـرۆڤ دادەخـات ولـەناو سیستمی بیرۆکراتیدا دەیکات بەشت وتوخمێك کە تەنیا ئەرکی ئابووری لەسەر شانە وخزمەتی سیستەمی بەکاربەری (ئیستهلاکی) و مانەوەی ئەم سیستەمە دەکات. (ئادرنۆ)و(هۆرکهایمەر) بەم جۆرە پێناسەی "پیشەسازی کلتوور" دەکەن:

> **ئەو پیشەسازییە کە پەنا بۆ ڕەوشی پاشکۆیەتی، ناچـاری ولاوازی خـۆی دەبات و لە هەناوی ئەم بارودۆخەوە سەرهەڵدەدات و هەوڵدەدات سەقامگیرو بەهێزی بکات. ئەو پەیامەی کە ئـەم پیشەسـازییە ڕادەگەیـەنێت بـە زۆری پەیامی "جێبەجێکردن وتەسلیم بوون"ە. ئەم پیشەسازییە دەبێتە ئاستەنگ لە بەردەم گەشەسەندنی تاکە سەربەخۆکان بۆ ئەوەی بەشـێوەیەکی ئاگایانـە و یەکسەر خۆیان بڕیار و حوکم نەدەن.**[١٤٢]

بەرای ئەم بیرمەندانە دووری و بۆشاییەکی گەورە هەیە لـە نێـوان واقعـی کۆمەڵایـەتی و سیاسی لەلایەك و بەرهەم هێنانەوەی کلتور لەلایەکی ترەوە کە جگـە لـە بـەکاڵاکردنی بـەها کلتوریەکان و ئاگایی ساختە شتێکی تر بەرهەم ناهێنێت، هەربۆیە رایان وایە کە «پیشەسازی کلتور ئاماژەیە بۆ پەیوەندی دوو واقعی تەواو دژ بەیەك: پانتـایی مـاددی بەرهـەم هێنـان و پانتایی زەین. شێوازێك بۆ دەربڕینی پرۆسسی بە مۆدێرن بوونی کلتور لە چوارچێوەی سپاردنی

---

*142.Adorno & Horkheimer, Dialectic of Enlightenment, N.Y, the Seabury Press,1972, pp.137-154.*

کالاّ کلتوریەکان بـە لـۆژیکێکی تـەواو بازرگـانی)).[١٤٣] بـەم جـۆرە بیرمەنـدانی قوتابخانــەی فرانکفــۆرت، ڕەخنــەی تونــدیان لــە پیشەســازی کلتــور ، واتــا بونیــادە بــەعقلاّنی کــراو وبیرۆکراتیزەکراوەکان گرت، کە کلتوری مۆدێرنی خسـتۆتە ژێـر چـاودێری خۆیـەوە. ئـادۆرنۆ سەبارەت بە پیشەسازی کلتور پێیوایە (( خودی تەکنەلۆژیا و ئاگایی تەکنەلۆژی دیاردەیـەکی نوێی لە فۆرمی کلتوری جەماوەری دا *mass culture* دەقپێوەگرتـوو و داروخـاوی بەرهـەم هێناوە نەزعەی رەخنەی لە ناو دەبات و بێدەنگی دەکات)).[١٤٤] واتە کلتورێك کە یەك فۆرم یان چەند فۆرمێکی دیاریکراو بەردەوام کۆپی دەکاتەوە و وەك شتێکی جیهـانی دەیخاتـەڕوو، بـەم جـۆرە لــە لــۆژیکی بەکاربــەری دا کلتــوری دەبێــت بــە کالاّیــەکی بازرگــانی و لــە رۆحــە ئیستاتیکییەکەی دایدەبڕێت و فۆڕمێك لە زەوقێکی نزم و سادەی رەشۆکی بەرهــەم دێـت کـە ئەرکەکە بریتییە لە سەپاندنی ئایدۆلۆژیای ئیستهلاکیی سەرمایەداری کە وێنەیەکی ناڕاسـت یان وێنەیەکی زالّ لە پەیوەندییە کۆمەلاّیەتیەکان دەخولّقێنیّ و دەیکات بە مۆدێل. ئەوان بـە پێچەوانەی گەشبینی مـارکس بـە ئاینـدەو پێشـکەوتن بـە شـێوەیەکی ڕەشـبینانە سـەیری سیستەمی سیاسی وئابووری وکلتوریان دەکـرد، کێشـەی دونیـای مـۆدێرن لای ئـەوان تـەنیا تایبەت نەبوو بە سیستەمی سەرمایەداری بەڵکو لەسەر ئەو ڕایە بوون کە ئەمە پەیوەستە بـە دونیــای بەعــەقلاّنی کــراو و سیســتەمە سۆسیالیســتیەکان یــان ســەرمایەداری دەولّــەتیش دەگرێتەوە(( هەر وەك ڤیبەر ئایندەیان وەك"قەفەسی ئاسنین" ی بونیادە عەقلاّنییــەکان سـەیر دەکرد کە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ دەرفەتی ڕزگاربوون کەمتر دەکاتەوە. لە سەر ئەو ڕایــە بــوون کـە تاك ئەسیری جیهانێك بووە کە سەرمایە تێیدا لە ڕادەبەدەر چەقی بەستووە و کەڵەکە بــووە و ئابووری وسیاســەت بەشـێوەیەکی ڕوو لــەزیاد چــڕژاونەتە نـاو یەکــەوە)).[١٤٥] ئیــدی کێشــەی جەوهەری ئەوە بوو کە هزر ناتوانێت دونیا بگۆڕێت و سیستەم هێندە بنەماکانی خـۆی پتــەو کردووە کە هەموو ئایدیایەکی گۆڕان شکست دەخوات و ئەمەش پێچەوانەی تێزی یازدەهەمی مارکس سەبارەت بە (فیورباخ) بوو کە دەڵێت: ((فەیلەسوفەکان تەنیا لــە ڕێگــای جیــاوازەوە

---

١٤٣. ایو کوسة و استفن آبه، واژگان مکتب فرانکفورت ، ت: افشین جهاندیده، نشر نی، چاپ ٢، تهران، ١٣٨٩(٢٠١٠)، ل ٦٢.

١٤٤. توم بوتومور ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٠.

١٤٥. هەمان سەرچاوە، ل٢٦٥.

جیهانیان راڤە کردووە لە کاتێك دا پرسەکە گۆڕانە».[١٤٦] دواجا هـونیس پێیوایـە دانپیانـانی دوولایەنە وەك میتۆد دەتوانێت رادەیەك بۆ ئەو ململانێ کۆمەلاّیەتیە هەنووکەییەکان دابنێت کە لەسەر بنەمای کۆنترۆڵ و هەژموون و ستەمی کۆمەلاّیەتی دامەزراوە. و پاشـان تاکـەکان دەتوانن خود و شونای خۆیان لە پەیوەندی نێوانخودی بەدی بێنن کە لە گـرەوی سـێ مـۆدێلی نۆرماتیڤی دانپیانان دایە، کە بریتیە لە خۆشەویستی و مـاف و سـۆلیداریێتی.[١٤٧] بـەم جـۆرە لەمیانی ئەم سێ مۆدێلە، مەرجە شکلیەکانی پەیوەندی کارلێك دیاری دەکرێت کە تێیدا تاك گرانتی "کەرامەتی خۆی" و"هەمەکییەتی خۆی" بەدەست دێنێ. لە کۆتـایی دا بیرمەنـدانی قوتابخانەی فرانکفۆرت ڕەخنەی ڕادیکاڵی لە پیشەسازی کلتور دەگرن. ئایـدیای پـەنهانی نـاو ئەم ڕەخنانـە تـاکێکی سـەربەخۆیە کـە دەتوانێـت خـۆی کـەم تـا زۆری عـەقلاّنی بکـات و سیسـتەمێکی دیمـوکراتی راسـتەقینە و گشـتی دابـین بکـات. [١٤٨] دەتوانێـت ئـەو گوتـارە ئایدۆلۆژییە جیاوازانە شی بکاتـەوەو ڕەخنـەیان ئاڕاسـتە بکـات کـە بەسـەریدا سـەپێنراون، هەروەها توانای ئەوەی هەیە لە بەرامبەر گروپ و کۆمەڵ بوەستێت و ڕای سەربەخۆی هـەبێت ولەگەڵ ئەوانیتردا گفتوگۆ بکات، مانای ناڕاستەوخۆی ئەم بابەتە ئەوەیە کـە کەسـایەتییەکی ئەوتۆ دەتوانێت بنەمای سیستەمێکی دیموکراتی ڕاستەقینە وگشتی دابین بکات.

## تەوەری دووەم : یورگن هابرماس و بنیاتنانەوەی تیۆری رەخنەیی

تویژینەوەکانی هابرماس سەبارەت بە تیۆری رەخنەیی بەشێوەیەکی بەرفراوان جیاوازە لـە نـەوەی یەکـەم و لـە بنـەڕەت دا بیروبۆچـونەکانی خـۆی لـە چوارچـێوەی تیـۆری رەخنـەیی (هۆرکهایمەر) خستۆتەڕوو سەبارەت بە زەرورەتی پەیوەندی نێوان زانسـتە کۆمەلاّیەتیـەکان و ئایدیای رزگاربوونی مرۆڤ. وەك بیرمەندێکی رەخنەیی بەدیدێکی رەخنەییەوە سەیری بەرهەمی نەوەی یەکەمی قوتابخانەی فرانکفۆرت دەکات و هـەوڵ دەدات لـە هەنـدێ بنبەسـتی فکـری

---

١٤٦. بابك احمدی ، مارکس و سیاست مدرن(مارکس و سیاسەتی مۆدێرن)، نشر مرکز،چاپی٣، تهران،١٣٨١(٢٠٠٢)، ل ٧٨١.

١٤٧. د. کمال بومنیر، سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٨.

١٤٨. تد بنتون و یان کرایب، فلسفەی علوم اجتماعی(فەلسەفەی زانستە کۆمەلاّیەتیەکان)، ت: شهناز مسمی و محمود متحد، مؤسسەی انتشارات آگە، تهران ،١٣٨٤ (٢٠٠٥)، ل٢١١- ٢١٢.

رزگاری بکات که ئەم قوتابخانەیەیان توشی وەستان کرد. لەلایەکی ترەوە کۆمەڵێك فاکتەری جیاواز کاریگەریان لەسەر بیری هابرماس هەبوو، روانگە و بیروبۆچوونی لەلایەکەوە لەسەردەمی کارەساتی نازیزم دا گەڵاڵە بوو ، لە لایەکی ترەوە پاش رووخانی نازیزم و سەرهەڵدانی سیستەمێکی سەقامگیری یاساگەرا و دیموکراتی لە ئەڵمانیای رۆژئاوا لە شکلی کۆماری فیدراڵ کاریگەریەکی زۆری لەسەر دروست بوونی دیدگای هابرماس هەبووە.[١٤٩]

## ١. هابرماس و مارکسیزم:

هابرماس وەك بیرمەندێکی گەشبین بە ئاییندەی کۆمەڵگای مرۆیی و چالاك لە بواری گشتی، داکۆکی لە بەها دیموکراتیەکان دەکات. هەروەك پێشتر ئاماژەی پێ کرا گەڕانەوە بۆ دەقە فەلسەفیەکانی هیگڵ و خۆ دوورخستنەوە لە مارکسیەتی ئەرتەدۆکس و گرنگیدان بە رەهەندی رەخنەیی لە بەرهەمەکانی مارکس دا، رەوتێکی نوێی مارکسی هیگڵی دروست کرد. بەشێکی زۆر لە توێژەران لە سەر ئەوە کۆکن کە هابرماس نوێنەرایەتی نەوەی دووەمی قوتابخانەی فرانکفۆرت دەکات ، ئەو نەوەیە کە تیۆری ڕەخنەیی بەرەو قۆناغێکی پێشکەوتوو و بەرفراوان برد کە وای لێکرد زیاتر بکرێتەوە بەڕووی زانستەکانی تر داو زۆرتر بچێتە ناو دەستکەوتە تیۆری ومیتۆدییەکان.[١٥٠]هابرماس هەوڵی دا بە دورخستنەوەی تیۆری ڕەخنەیی قوتابخانەی فرانکفۆرت لەو ڕەشبینیە قوڵەی کە لە دەیەی کۆتایی تەمەنی نەوەی یەکەمی قوتابخانەی فرانکفۆرت دا یەخەی بیرمەندەکانی گرتبوو ، پرۆژەی ڕزگاریخوازی لە تیۆری ڕەخنەیی قوتابخانەی فرانکفۆرت دا سەرلەنوێ بنیاتی بنێتەوە و بەردەوامی پێبدات و هەوڵی دۆزینەوەی پاساوێکی نوێ بدات بۆ تێپەڕین لە رەوشی بەشتبوون لە سەرمایەداری و سیما نیگەتیڤەکانی پرۆسەی عەقلانیەت و پێشکەوتن و ماهیەت و لۆژیکی زانستە کۆمەلایەتیەکان و خەسڵەتە ناعەقلانیەکانی لە داڕشتنی سیاسەت دا.[١٥١] هابرماس ڕوانگەیەکی ڕەخنەیی بۆ خودی مارکسییەت خستەڕوو ، مارکسییەت لای ئەو تەنیا ئایدۆلۆژیا یان بیروباوەڕێکی سیاسی نیە بەڵکو هەروەك (پۆل ریکۆر) دەڵێت: « لای هابرماس

---

١٤٩. حسینعلی نوزری، بازخوانی هابرماس، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٧.

١٥٠. علاء طاهر ، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٧.

١٥١. حسین بشیریە، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢١٢.

مارکسیەت نە زانستێکی ئەزموونییە نە زانستێکی تەئەمولییە، بەڵکو رەخنەیە».[152] بە هۆی مارکسییەتەوە دەتوانین بە شێوازێکی ماددیانە بیر بکەینەوە و هەروەها دەتوانین تیۆر و پر اکتیك بە گشتی لێك جیا بکەینەوە یان ئاوێتەی یەکتریان بکەین . دواجار مارکسییەت لای هابرماس بانگەشەی بیرکردنەوە و شیکردنەوە دەکات بە دوو ئاڕاستەدا. ***یەکەم***، تیۆرییە کە هەلومەرجە بابەتییەکان شی دەکاتەوە و هەوڵدەدات لە تەرکیبی سەرهەڵدانە تایبەتییەکەی و دروست بوونی لە ناو مێژوو دا تێ بکات واتا بە ئاڕاستەی ئەزموونی کۆمەلایەتی واقیعی. ***دووەم***، تواناکەیەتی لە سەر کرانەوەیەیەکی واقیعانەی دەرفەتە بۆ پراکتیکی سیاسی.[153] تیۆری ڕەخنەیی هەروەك ئاماژەی پێکرا جەخت لەسەر ڕەهەندی هیگڵی هزری مارکسی دەکاتەوە ئەم تیۆرە نمونەی ئابووریانەی مارکسییەت رەد دەکاتەوە کە تێیدا کەلتوور وئایدۆلۆژیا و سیاسەت وەك سەرخان لە لایەنی ژێرخانی ئابورییەوە دیاری دەکرێت. هابرماس لە بنیاتنانەوەی تیۆری رەخنەیی هەرگیز خۆی نەبەستەوە بە شیکردنەوەی سادە و رووکەشانەی و بە پێچەوانەی مارکسییە ئەرتەدۆکسەکان، فاشیزمی تەنیا وەك سیمایەکی گۆڕاوی سەرمایەداری مۆنۆپۆلی لێك نەدایەوە یان بە پێچەوانەی بیرمەندانی پاش جەنگی دووەم دیاردە کۆمەلایەتیەکانی تەنیا لە چوارچێوەی تۆتالیناریزم دا شی نەکردەوە. شیکردنەوەی چەمکی "دەسەلات" لەو بابەتە گرنگ و ژێرخانیانەن کە هابرماس لە بنیاتنانەوەی تیۆری رەخنەیی دا بایەخی پێداوە و بەرفراوانی کردووە. بەبڕوای هابرماس دیاردەی "دەسەلات"ئەگەر لەهەمووان زیاتر لە فاشیەت دا خۆی دەرخستووە، بەلاّم لە هەمان کات دا پرەنسیپی کۆمەڵگا لیبرالەکانیشە.

## ٢. هابرماس و مەعریفەی ئازادیخوازانە:

هابرماس لە توێژینەوەکانی دا هەندێ پرسیار دەوروژێنێت سەبارەت بەرەوشی رزگاربوون لە رەوشی بالادەستی هەنووکەیی و هەوڵی چالاك کردنی و زیندووکردنەوەی تیۆری رەخنەیی دەدات . لای ئەو پرسیارەکە ئەوەیە کە وێنەی رەوشێکی پێویست بۆ دروست کردنی تیۆرێکی

١٥٢. بول ریکور، محاضرات في الأیدولوجیا و الیوتوپیا ، تحریر وتقدیم: جورج ه. تیلور، ت: فلاح رحیم، دارالکتاب الجدید المتحدة، بیروت،٢٠٠٢،ل ٣٠٢.

١٥٣. علاء طاهر ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٩٥.

کۆمەڵایەتی عەقلانی چییە کە بتوانرێت پیادە بکرێت کە هەڵدەستێ بە بانگەشەکردن بۆ ئیرادە و ئاگایی مرۆڤی هاوچەرخ بە جۆرێك کە بکرێت رێگایەکی گونجاو و مەشروع بدۆزرێتەوە بۆ رزگاربوونی هەموو مرۆڤایەتی.[154] لە رووی فەلسەفەی سیاسیەوە تیۆری رەخنەیی پەیوەندییەکی نزیکی لەگەڵ ئایدیاکانی تیۆری لیبرال کلاسیك وتیۆرە دیموکراتیەکان دا هەیە و لە هەمان کات دا رەخنەی مارکسیی سەبارەت بە دیموکراسی لیبرال پەرە پێدەدات. بیرۆکەی سەرەکی هابرماس ئەوەیە کە لەبەر ئەوەی لیبرالیزم پەیوەندیەکی تۆکمەی لەگەڵ سەرمایەداری دا هەیە و لێرەشەوە رۆڵی هەیە لە توندوتۆڵ کردنی دەسەڵاتی "عەقلانیەتی ئامرازی"هەربۆیە هەرگیز ناتوانێت ئایدیاکانی خۆی بپارێزێت و بەهێزیان بکات ئەو ئایدیا و بیرۆکانەی کە بنچینەکەیان بۆ رۆشنگەری دەگەرێتەوە وەك پێشکەوتن و ئازادی و یەکسانی و کۆمەڵك چەمکی تر.

بەبڕوای هابرماس تیۆریسیەنی رەخنەیی لە جیاتی گرنگیدان یان نیگەران بوون لەمەڕ پرۆلیتاریای جیهانی دەبێ مرۆڤ وەك "هەمەك" وەبەرچاو بگرێت...و ئایدیای "یەکیەتی مرۆڤ" تەنیا لەسەدەمی ئێستا دایە کە ئەم بیرۆکەیە تاڕادەیەك بووە بە "حەقیقەت"و دەبێ بیرمەندی رەخنەیی داکۆکی لێ بکات، هەرچەندە هیچ گرنتیەك لە ئارادانییە کە ئەم یەکیەتیە بەدی بێت و بە ئاکام و سەرەنجامی خۆی بگات.[155]

کارە هزرییە فەلسەفیەکانی هابرماس دەلالەت لەسەر هەولێك دەکات بۆ داهێنانی تیۆرێك کە زانستە مرۆڤایەتیەکان کۆ بکاتەوە لە ژێر سایەی سیستەمێکی هەمەکی دا و بە پشتیوانی فەلسەفە جیاکردنەوەی نێوان زانستەکان نەهێڵێت و دەتوانین بڵێین « گرنگترین پەرەپێدان کە هابرماس بە تیۆری رەخنەیی داوە دروست کردنی کارلێکە لە نێوان فەلسەفە و کۆمەڵناسی و زانستی سیاسەت پێیوایە دەشێ تیۆری زانست بە پێی هێرمنیوتیك و فەلسەفەی هاوچەرخی زمان ئاوێتە بکرێت لە هەمەکێکی تەواو دا ».[156] واتە بڕوای بە دابەش بوون و جیاکردنەوەی زانستەکان نییە و دەبێ هەموویان لە کۆمەڵگا دا رۆڵی رزگاریخوازانە بگێڕن و لێرەوە بیرۆکەی سەرەکی هابرماس ئەوەیە کە کۆمەڵگای ئایدیالی ئەو کۆمەڵگایەیە کە هەموو شتێك بە عەقلانی

---

١٥٤. سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٧.

١٥٥. حسینعلی نوزری، نظریەی انتقادی مکتب فرانکفورت ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٩٦ و ٣٩٨.

**١٥٦. د. شیرزاد احمد النجار، سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٠.**

بکرێت و لەم چوارچێوەیەدا داوای شێوازێکی نوێی مەعریفە دەکات واتە: زانستە رەخنەییەکان.[157]
هابرماس گومان لەوە دەکات کە زانست بەمانا پۆزەتیڤیستیەکەی بتوانێ ئەو جیهانە تاوتوێ بکات کە خەڵك بەرهەمی دێنێت، رێك وەك ئەوەی بەسەرکەوتوویەوە زانستە سروشتیەکان تاوتوێی دەکەن و دەڵێت دەتوانین بەڵگە بۆ پەیوەندی جۆرایەتی نێوان رێسا لۆژیکی- میتۆدیەکان و بەرژەوەندی مەعریفە لەهەمبەر سێ کردەی توێژینەوە بێنینەوە، واتەسێ جۆر بەرەژەوەندی لە مەعریفە یان هۆگریی مرۆیی جیادەکاتەوە.

١- لە زانستە ئەزموونی- شیکارییەکان دا بەرژەوەندی مەعریفەی تەکنیکی دێتە ئاراوە.
٢- لە زانستە مێژوویی- راڤەییەکان(هێرمنیوتیك) دا بەرژەوەندی مەعریفەی پراکتیکی.
٣- لە زانستی رەخنەیی دا مەعریفەی رزگاریخوازانە. [158]

کەواتە بە بڕوای هابرماس هەر کام لەم سێ نەریتە لەسەر بنەمای جۆرێك بەرژەوەندی مەعریفەساز *Knowledge-constitutive interest* ی تایبەت بنیات نراوە:
کۆمەڵناسی یان رێبازی پۆزەتیڤیستی لەگەڵ جۆرێك لە بەرژەوەندی تەکنیکی بۆ چاودێری کردنی رەفتاری کۆمەلایەتی دا هاورێیە. شیکردنەوەی راڤەیی دەربڕی بەرژەوەندی کرداریە (عملي) بۆ پاراستنی سۆلیدارێتی کۆمەلایەتی. لە بەرانبەر دا تیۆری رەخنەیی تیۆرێکی کردەیی و ممکینە ،چونکە تاکەکان حەز دەکەن لە سنووری توانای "خود-بڕیاردان" زیاتر بچنە پێش.
بەرای هابرماس مەعریفەی ئازادیخوازانە حاڵەتێکی ئیستنباتی هەیە و پەیوەندی نێوان مەعریفەی تیۆری و پراکسسی ژیان واتە بواری ئەو بابەتانەی لە سەرەتادا تێیدا سەرهەڵدەدات وێرای پەیوەندیکاری شێواوی سیستەماتیك و رەوشی داپلۆسینی بەشەرعی کراو دەگرێتەخۆ. [159]
بەم جۆرە تیۆری رەخنەیی لەسەر بنەمای جۆرێك لە "بەرژەوەندی مەعریفەی رزگاریخوازانە *Emancipator cognitive interest* دامەزراوە بە ئاراستەی تێگەیشتن لە دەرفەتی ئازادکردنی بکەرە کۆمەلایەتیەکان لە کۆتوبەندی ئاستەنگی ناپێویست و شێوازە بەدەزگایی

---

١٥٧. هەمان سەرچاوە، ل ٧٧.

١٥٨. يورغين هابرماس ، التقنيه والعلم كأيدولوجيا– داسة علمية ، ت: د.الياس حاجوج ، منشورات وزارة الثقافة في الجمهورية العربية السورية، دمشق،١٩٩٩، ل ١٦٧.

١٥٩. يورغن هابرماس ، المعرفة والمصلحة ، ت:حسن صقر، مراجعة: ابراهيم الحيدري، منشورات الجمل، كولونيا- المانيا ،٢٠٠١، ل ٣٧٩.

کراوەکانی بیرکردنەوەو چەمکە شێوێنراوەکان.[١٦٠] بە بڕوای هابرماس مەعریفەی جۆری یەکەم بابەتی کارکردن لەسەر سروشت و کۆنترۆڵ ودەستکاری کردنی سروشت دەخاتەڕوو، ئەمەش دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی زانستە سروشتیەکان و تەکنەلۆژیا. مەعریفەی جۆری دووەم دەرفەتی راڤە و لێك تیگەیشتن دەخولقێنێ و توانای ئەوەمان پێ دەبەخشێت پەیوەندی لەگەڵ ئەوانیتر دابمەستین لە پێناو بەرژەوەندی هاوبەش دا. بەلاّم مەعریفەی سێیەم بریتییە لە رامان لەمەڕ خۆمان و شێوازی بیرکردنەوەمان سەبارەت بە جیهان بە شێوەیەکی سەربەخۆیانە و دەیەوێت جۆرێك لە ئازادی و یەکسانی و دادپەروەری بێنێتە ئاراوە. لێرەوەیە کە تیۆری پەیوەندیکاری هابرماس سەرهەڵدەدات چونکە مرۆڤەکان جگە لە سروشت لەگەڵ یەکتریش دا پەیوەندیان هەیە. بەلاّم (کولاکۆفسکی) رەخنەی لە مەعریفەی ئازادیخوازانە گرتووە وەك ئەوەی « هیچ نەبێت جگە لە هەولێکی تری ناسەرکەوتوو لە نەریتی ئایدیالیزمی ئەلّمانی دا بۆ تەجاوزکردنی دژایەتی نێوان عەقلّی کردەیی و عەقلّی تیۆری واتە لە نێوان مەعریفە و ئیرادە دا ».[١٦١] بە کورتی لە روانگەی هابرماسەوە تیۆری رەخنەیی پێویستی بە بنیاتنانەوەیەکی تەواو هەیە کە بتوانێ لە بنبەستەکانی "فەلسەفەی ئاگایی" رزگاری بکات و لە عەقلانیەتی نیگەتیڤەوە بەرەو عەقلانیەتی پۆزەتیڤی ببات، واتە ئامانجی تیۆری رەخنەیی بنیاتنانەوەی کێشەی سەرەکی بەعەقلانی بوونی ئامرازییە کە بەمانای نەمانی مانا و ئازادییە. هابرماس ئەرکی بنیاتنانەوەی سەرچاوە رەخنەیە زیندووەکانی ناو کلتورە دیموکراتییەکان دەگرێت ئەستۆ. بە گەشبینیەکی تایبەتییەوە دەست بەکارەکە دەکاتەوە و لای ئەو کلتوری کۆمەلّگا مۆدێرن و پێشکەوتووەکان پێکهاتەیەکی سەرەکی بونیادی **جیهانی ژین** *world-life* لەقەلّەم دەدات، پێکهاتەیەکی زیندووە کە بنەمای هەلّسوکەوتی ئێمەیە و دەتوانێت بەرهەلّستی دەسەلاّتی پیشەسازی بکات.[١٦٢] دواجار هابرماس پرسی مۆدێرنە دەگەڕێنێتەوە بۆ پەیامەکانی رۆشنگەری « ئەرگۆمێنت دەخاتەڕوو کە پرۆژەی مۆدێرنە کە رەگی لە سیاقی عەقلّیەتی سەردەمی رۆشنگەری دایە بە تەواو نەکراوی ماوەتەوە و پێویستە تەواو بکرێت»[١٦٣] بە

١٦٠. حسینعلی نوزری، نظریەی انتقادی مکتب فرانکفورت، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٨٤.

١٦١. توم بوتومور ، سەرچاوەی پێشوو،ل ١٠٩.

١٦٢. ایو کوسة و استفن آبە، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٥.

١٦٣. ليندا هتشيون، سياسة مابعد الحداثية ، ت: د. حيدر حاج اسماعيل، المنظمة العربية للترجمة،بيروت، ٢٠٠٩، ص ١٠٣.

پێچەوانەی (لیوتار) کە پێیوایە مێژوو کۆتایی بە مۆدێرنە هێناوە و سەردەمی حەکایەتە مەزنەکان بەسەرچووە. ئەو میتاگێڕانەوانەی *metanarrative* کە کاریگەرییەکی سەیریان لەسەر مۆدێرنە هەبووە: وەك رزگاربوونی هێدی هێدی عەقڵ و ئازادی، بایەخداربوونی شێتانە و ترسێنەری کارو دەوڵەمەندبوونی مرۆڤایەتی بەهۆی زانست وتەکنیکی سیستەمی سەرمایەداری.[١٦٤] بەڕای لیوتار ئەمانە شکستی مۆدێرنەیان سەلماند، بەلاّم لە لایەکی ترەوە هربرت مارکیوز لە شەستەکان دا بڕوای بەم بیرۆکەیە بوو کە هەموو بزوتنەوە کۆمەلاّیەتیەکان لە نێوان قوتابیان و کەمینە ئەتنیەکان و جیهانی سێیەم دا توخمی نوێی شۆڕشگێڕیان بۆ مێژوو دروست کردووە.[١٦٥]

بەم چەشنە سەبارەت بە زانستە کۆمەلاّیەتی و مرۆڤایەتیەکان هابرماس پێیوایە پۆزەتیڤیزم کە زانستی بالاّدەستە و بانگەشەی ئەوە دەکات کە گەیشتن بە حەقیقەت لە رێگای ئەزموون و بە شێوەی ئەمپریکی بە دەست دێت و زانست دەتوانێ بێلایەن بێت، ئەرگۆمێنت دەخاتەڕوو کە پەیوەندی نێوان خود/ بابەت لە زانستە مرۆڤایەتیەکان دا ناتواتێ لاسایی زانستە سروشتیەکان بکاتەوە، چونکە لەم زانستەدا مەعریفە لەسەر بنەمای خود/ خود دادەمەزرێت و هەربۆیە مەعریفە بە بەرژەوەندی یان هۆگریی مرۆیی دەبەستێتەوە کە زانستەکە دەیەوێت بەدی بێنێت، لە بەرانبەر مەعریفەی ئەزموونی شیکاری و مەعریفەی مێژوویی_هیرمینیوتیکی دا، ئەلتەناتیڤی خۆی، واتە زانستی رەخنەیی یان مەعریفەی ئازادیخوازانە دەخاتەڕوو کە یارمەتی مرۆڤ دەدات بۆ دروست بوونی ئاگاییەکی راستەقینە لەمەڕخۆی. سەرەڕای ئەو هەموو کۆتوبەند و سانسۆرەی لەسەر ئەم زانستانە هەبووە یان ئەوهەوڵە بەردەوامەی کە بۆ هێشتنەوەی لە چوارچێوەی پۆزەتیڤیزم دراوە،دەتوانین بۆ پشتگیری لە تێڕوانینی هابرماس ئاماژە بە شۆرشەکانی ئێستای رۆژهەلاّتی ناوەڕاست و باکووری ئەفریقا بکەین کە بەشێکی ئەم بزووتنەوانە لە ژێرکاریگەری زانستە کۆمەلاّیەتیەکان بە دیوە رزگاریخوازییەکەی دا گەشەی کردووە.

بەم جۆرە دەتوانین بلّێین تیۆری هابرماس بۆ دیموکراسی سەرچاوەکەی بۆ تیۆری رەخنەیی قوتابخانەی فرانکفۆرت دەگەڕێتەوە، نەوەیەی یەکەمی ئەم قوتابخانەیە، مۆدێرنە و کلتوری رۆژئاوایان لە عەقلاّنیەتی ئامرازی دا کورت کردبۆوە و لای ئەوان سیستەمی مۆدیرن، کۆمەڵگای

---

١٦٤. ژان فرانسوا لیوتارن پسامدرن برای بچەها، ت: آذین حسین زادە، نشر ثالث، تهران،١٣٨٤(٢٠٠٥)، ل٤١-٤٢.

١٦٥. توم بوتومور ، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٩.

سەرکوت و زۆرەملێی و تۆتالیتاریزمی بەرهەم هێناوە و لە چوارچێوەی ئەم سیستەمە دا مرۆڤ تووشی نامۆبوون و بەشتبوون دەبێت و ئاسۆکانی ئازادی لەناودەچن، بەلاّم هابرماس بە خستنەڕووی عەقلاّنیەتی پەیوەندیکاری بەشێکی گەورەی ئەم پرسە چارەسەر دەکات و پێیوایە لە هەناوی کلتوری پەیوەندیکاری دیموکراتی دا دەتوانیین پانتاییەکانی ئازادی بەرفراوان بکەین و ئەمەش بە یەکێك لە بنەماکانی دیموکراسی دادەنێت. لێرەوە وەك ئەرگۆمێنت بۆ ئەو زانستەی هابرماس بە مەعریفەی ئازادیخوازانە ناوزەدی دەکات دەشێت هەندێ دەرکەوتەکانی لە پەیوەندی نێوان زانستە کۆمەلاّیەتی و مرۆییەکان و بزووتنە رزگاریخوازییەکانی جیهانی خۆمان بدۆزینەوە، بە تایبەتی ئەم شەپۆلە بەهێزەی ئێستا دژی داپلۆسین و سەرکوتکاری سیستەم لە جیهانی عەرەبی و بەتایبەتی لەتونس و میسر و لیبیا و سوریا و پێشتریش لە ئێران سەری هەلّدا. تیۆری رەخنەیی سەرەتایەکی پتەوە بۆ رەخنەیەکی گشتگیر لە بالاّدەستی و ئاگایی ساختە و هزری دەسەلاّتخوازانەو تۆتالیتێر و هەولّدان بۆ دارشتنی تیۆریکی بە هێز بۆ دیموکراسی کە لای هابرماس سیمایەکی رادیکالّ وەردەگرێت و بە دیموکراسی راوێژگەری ناسراوە کە بنچینەکەی لەسەر کلتوری لێك تێگەیشتن و دیالۆگ دامەزراوە کە تەنیا وەك بانگەشەیەکی سیاسی خۆی دەرناخات بەلّکو لە ئاستی فەلسەفی دا بناغەیەکی تۆکمەی بۆ بنیات دەنێت.

# باسی دووەم

## له فەلسەفەی ئاگاییەوە بۆ فەلسەفەی نێوانخودی
## Intersubjectivity

هابرماس له چاوخشانەوەیدا بەو وانەوتارانەی(محاضـرات) کە هیگڵ کە لە زانکـۆی یـەنا Iena پێشکەشی کردبوو، له کتێبی ***تەکنیك و زانست وەك ئایدۆلۆژیا -وتاری کار و کارلێك، تێبینی لەسەر "فەلسەفەی روح"ی یەنایی هیگڵ***، هەوڵی داوە چەمکی پەیوەندیکاری خـۆی لەگەڵ پەیوەندی نێوان کار و کارلێك و (من *ego*)و(ئەویتر *other* )ی هیگڵ لێك گرێ بدات. بەپێی بەڵگەخوازی هابرماس ، یەکەمین وانەوتارەکانی هیگڵ لـە زانکـۆی یـەنا مـۆدێلێکی بەهاداری پەیوەندی دوولایەنەی کار و *کارلێکی* لەخۆ گرتبوو کە لە بەرهەمەکانی تری دا بـەر چاو ناکەوێت. هیگڵ دەڵێت: «ئەوە رۆح نییە کـە لـە جوڵـەی رەهـای رامان(تأمـل) لەمـەڕ خۆیەوە ، خۆی لە زمان و کار و پەیوەندییە ئەخلاقیەکان دا دەردەخات، بەڵکو بەپێچەوانەوە، پەیوەندی دیالیکتیکی سیمۆلە زمانیەکان، کار و کارلێکە کـە چـەمکی رۆح دیـاری دەکـات ».[١٦٦] بەم جۆرە هیگڵ دان بە کاریگەری واقیع لەسەر زەین دادەنێت و پێیوایە رۆح بەرهـەمی کارلێکی ئەمانەیە، ئەمە پێچەوانەی ئەو فەلسەفەیە کە دواتر بەرهەمی هێناوە.

### تەوەری یەکەم: دوالیزمی کار و کارلێك Labor and interaction

بە رای هابرماس دیاری کردنی چـەمکەکانی"زمان"، "ئـامرازی کـار" و"خێـزان" سـێ مۆدێلی هاوتان لە ڕووی بەهاوە لە پەیوەندی دیالیکتیکی دا : وێنەی سیمبۆلی - پرسی کـار – کارلێك لە سەر بنەمای کاریگەری دوولایەنە ، هەرکامێکیان بە ڕێگـای خـۆی نێوەنـدێتی

---

١٦٦ .ویلیام اوث وایت ، هابرماس- معرفی انتقادی ،ت: لیلا جوافشانی و حسن چاوشیان، نشر اختران، تهران ،ص ٣٠.     هەروەها بڕوانە ئەم سەرچاوەیە:
- *Jurgen Habermas ,Theory and Practice ,Translated by Jhon Viertel ,Beacon press, Boston, p.147.*

(توسط) خودو بابەت دەكات و هەریەك لە دیالیكتیكی كار و دیالیكتیكی پەیوەندی ئـەخلاقی وەك شێوازێكی تایبـەتی نێوەنـدێتی دەردەكـەوێت[١٦٧] . واتـە ئـەم دووانـە لـە پانتاییـەك دا كاریگەری لەسەر یەكتر دادەنێن و بەهیچ جۆرێك لەیەكتر داناماڵرێن و ئەمـەش لـە چـەمكی "مـــن" دا خـــۆی دەردەخـــات. هیگـــڵ لـــە پێشـــەكی"لۆژیكی خـــودی"دا ئامـــاژە بـــۆ چەمكی"من"دەكات:

**"من" .... ئەوە یەكە (وحدە) بەراییە بێگەردەیە ، لە پەیوەندی لەگـەڵ خۆیدا و ئەمەش بە شێوەیەكی ڕاستەخۆ نا ، بەڵكو بە دامـاڵینی (تجـرد) لـە هەموو دیاریكردن یان ناوەرۆكێك و گەڕاندنەوەی بۆ ئازادیەكەی، ئازادی یەكسان بوونی لەگەڵ خۆیدا و بۆ خۆی، بە بیٚ كۆت و بیٚ سنوور. بەم جۆرە لەلایەكەوە "من" گشتییە، واتە ئەو یەكەیەیە كە یەك نییە لەگەڵ خۆیدا تەنیا لە میانی رەفتارە نیگەتیڤەكەیەوە نەبێت، كەوەك تجـەرود دەردەكـەوێت و بـەم چەشـنە هەموو بوونی دیاریكراوی هەڵوەشاو لە نـاو خۆیـدا دەگرێتـەوە، لـە لایـەكی ترەوە،"من" بەو پێیەی نێگەتیفە لە پەیوەندی لەگەڵ خۆیدا، هەر بۆیە تاكە ، بوونی دیاری كراو و ڕەها روبەڕوی ئەویتر دەبێتەوە و دووری دەخاتەوە،... ئەم گشتیە ڕەهایە ، كە لە هەمان كاتدا بە شێوەیەكی ڕاستەوخۆ تەنیای ڕەهاشە و بوونێكە لە خۆیدا بۆ خۆی بەجۆرێك كـە بـوونی بابەتەكەیـە، بوونێـك نابێـت لەخۆیدا و بۆخۆی تەنیا لە میانی یەكبوون نەبێت لەگەڵ بوونی بابەتەكەدا).[١٦٨]**

كار و كارلێك دوو پرۆسسی پەیوستن بەیەكترەوە كە لە رێگایەوە مرۆڤەكان لەگەڵ سروشتی دەرەكی و سروشتی ناوەكی یان خەسڵەتی مرۆیی خۆیان دا دەگونجێن.لە كاتێك دا كـە كـردەی ئەخلاقی (كانت) پرنسیپێكە كە خودێكی مرۆیی دەتوانێت بەتەنیا یـان هـەر وەك هابرمـاس دەڵێت بە شێوازی "مۆنۆلۆگ" هەڵیبژێرێت، لە روانگەی هیگڵەوە ئەخلاقیات پێویسـتی بـە سـەرلەنویٚ دانپینـانی دوولایەنـەی مرۆڤـە بەكۆمەڵایـەتی بووەكـان هەیـە. ئـەم دانپیانانـە سەرچاوەی راستەقینەی نۆرمە ئەخلاقییەكانە نەك "عـەقڵی كردەكی"ئەبستراكت.[١٦٩] هیگـڵ

---

١٦٧ . یورغین هابرماس ، التقنیة والعلم كأیدولوجیا ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٥- ٤٦ .

١٦٨ .سەرچاوەی پێشوو ، ص٤٧ .

١٦٩ .ویلیام وایت ،سەرچاوەی پێشوو ، ص ٣٠.

پشت بەو چەمکەی "من" دەبەستێت کە (کانت) دایڕشتووە، واتە وەك ( یەکەیەکی بێگـەرد لە پەیوەندی لەگـەڵ خـۆی دا) وەك یەکەیـەکی سـەنتێزی (تـرکیبی) بـەرایی بـۆ دەرکردنـی ئاگاییان. [١٧٠] منego لەرێگای قسە و وتەوە و- ئەویتر Other کە هەڵوێست لە بەرانبەر ئەم کردەی وتنە وەردەگرێ- پەیوەندیەکی نێـوان کەسـی *Interpersonally Relation* لەگـەڵ یەکتر دەبەستن. [١٧١] ئیتر دامەزراندنی "من"لە سەر تەئەمول و ڕامانی* "من"ی تاك وتەنیا لە مەڕ خۆیەوە دەرك ناکرێت، بەڵکو لە ڕێگای کۆمەڵێك پرۆسسی دروستکەرەوە ڕوو دەدات کە لەم پرۆسسەدا نێوەندی نێوانخودی ئەولەویەتی هەیە کە تێیدا خودی تاك فۆرمۆلە دەبێـت. [١٧٢] ئەمە ئەو دەستپێکەیە کە هابرماس پێیوایە دەشێت فەلسەفەی نێوان خودی تێدا دەستنیشان بکرێت، کە "من" وەك بکەری ناسکاری (الذات العارفة) تاك و تەنیا لە تێڕامان و بیرکردنەوە دا، هەوڵدەدات بۆ ناسین و گفتوگۆ پەیوەندی لە گەڵ "من"ی تردا ببەستێت و بـەم جـۆرە دان بـەفرەی "مـن" و لەوێشـەوە"خود" دادەنرێـت و ئەمـەش لـە پەیوەنـدی لەگـەڵ ئـەویتردا دەردەکەوێت. لێرە دا ئاگایی خود دروست نابێت ئەگەر پەیوەندیەکی دوولایەنە ودانپیانانێکی دوولایەنە لەگەڵ ئەویتردا بوونی نەبێت.

بەبۆچوونی هیگڵ ڕوح بنەمایەك نییە کـە خودیـەتی خـۆی لـە سـەر بنیـات نـراوە بـۆ خودئاگایی، بەڵکو ئەو نێوەندەیە کە تێیدا "من" و منـی "ئـەویتر" پەیوەنـدی بـە یەکـەوە دەکەن بەوپێیەی نێوەندیکی رەهایە و هەردووکیان بە شێوەیەکی دوولایەنە دەبن بە دوو خود و

---

١٧٠ . یورغین هابرماس ، سەرچاوەی پێشوو ،ص ٤٧.

١٧١. هبرماس ، القول الفلسفي للحداثة ،ت: د.فاطمة الجيوشي ، منشوات وزارة الثقافة في الجمهورية العربية السورية، دمشق ، ١٩٩٥ ، ص٤٥٥.

* رامان(تأمل) ئەو ئەزمونەی کە رۆشنگەری دەیوروژێنیٚ، رێك ئەو کردەوەیەیە کە لە رێگایەوە خود (*subject*) خۆی لە رەوشێك رزگار دەکات کە تێیدا بووە بە بابەتی(*object*)ئەم چالاکیە تایبەتیەی دەبێت خود ئەنجامی بدات. (پیتر میلر ،ل ٩١)

١٧٢. پیتر میلر ، سوژە ، استیلا و قدرت ، ت: نیکو سرخوش و افشین جهاندیده ، نشر نی ،چ ٢، تهران،١٣٨٤( ٢٠٠٥) ، ل٨٩.

بەم جۆرە ئاگاییەك بـوونی هەیـە كـە نێوەندێكـە هـەردوو خودەكـە تێیـدا بەیـەك دەگـەن، بەچەشنێك ناتوانن بن بە خود ئەگەر بە یەكتر نەگەن.[١٧٣]

ئەمە سەرەتایەكی گرنگی فەلسـەفییە بـۆ پەیوەنـدی نێوانخـودی كـە تێیـدا دانپیانـان و بەیەكگەیشتن دەبێتە نێوەندی هاتنەبوون، واتە خود تونیـا لـەم پانتاییـە دا دەتـوانێ بگاتـە ئاگایی لەمەڕخۆی. ئەم گۆڕانكاریەی كە لە فەلسەفە هیگڵدا ڕووی داوە و ماركس ئاگـاداری نەبووە وای لێكردووە ئاماژە بە دوالیزمی هیگڵی بكات و بـەمجۆرە بـەبێ ئاگـادار بـوون لـە دەستنووسەكانی یەنا ماركس پەیوەندی نێوان كار وكارلێكی لـە دیـالیكتیكی نێـوان هێـزی بەرهەم هێنان و پەیوەندیەكانی بەرهەم هێنان دا دارِشتۆتەوە ... ماركس لـە ڕەخنـەگرتن لـە بەشی كۆتایی "***فینۆمینۆلۆژیای ڕوح*** " دا جەختی لە سەر ئەوە كردۆتەوە كە هیگـڵ پشـتی ئابووری نیشتمانی دەگرێت چونكە تێگەیشتوە لەوەی كە "كار" جەوهـەری مرۆڤـە.[١٧٤] ((بـە دیاریكراوی، كار سەیرورەی نێوان مرۆڤ و سروشـتە ، سـەیرورەیەك كـە مـرۆڤ تێیـدا دەبێتـە نێوەندێك (نێوبژێك) لە نێوان سروشت و گۆڕانی ماددە بە هـۆی كـردەی تایبـەتی مرۆڤـەوە، هەربۆیە [مرۆڤ] ڕێكدەخات و حوكم دەكات. ئەو خۆشی وەك هێزێكی سروشتی لـە بەرانبـەر ماددەیەكی سروشتی دەردەكەوێت)).[١٧٥] هەرلە سەرەتاوە هیگڵ "من "ی وەك شوناسی گشتی و تاكەكەسی دەرك كردووە. مـن گشـتی و تاكەكەسـییە لـە یـەك كاتـدا و ڕوح دۆزینـەوەی دیالیكتیكی ئەم یەكێتیەیە، واتە هەمەكیەتێكی (كلیە) ئەخلاقییە، هیگـڵ بـە شـێوەیەكی ڕەمەكی ئەم زاراوەیە هەڵنابژێرێت، كەواتە ئەو ڕوحـەی لـە زمـانی ڕۆژانـەمان دا بـە كـاری دەهێنین وەك ڕوحی گەل ، ڕوحی سەردەم، ڕوحی گروپ وجڤـات (جماعـە) هەمیشـە سـنوری خودێتی ئاگایی خودی تەنیا و دوورەپەرێز دەبەزێنێت.[١٧٦] بەم جـۆرە هابرمـاس دەیـەوێت لـە فەلسەفەی هیگڵ دا ئەوە روون دەكاتەوە كە (من) یان خود یەكە لە كۆ دا دەردەكەوێت، واتە بـە بـێ بـوونی هەمەكیـەت ئـەم هەندەكـە بـوونی نییـە. دیـالێكتیكی خودئاگـای *self-*

---

١٧٣ . یورغین هابرماس ، التقنیە والعلم كأیدولوجیا ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٩.

١٧٤. محمد الأشهب ، مذهب التواصل في الفلسفة النقدية ليورغن هابرماس ،رسالة نيل شهادة الدكتوراه ، جامعة سيدي محمد بن عبدالله، فاس ،٢٠٠٦-٢٠٠٧ ،ص١٠٥ .

١٧٥. یورغن هابرماس ، المعرفة والمصلحة ، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٦.

١٧٦ . یورغین هابرماس ، التقنیە والعلم كأیدولوجیا ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٩-٥٠ .

*consciousness* هیگڵ پەیوەندی تەواوکارانەی (مکمل) ئەو تاکانەی یەکتر دەناسن دەخاتە شوێنی پەیوەندی ڕامانی (تأمل) تاکە تەنیاکان، ئیتر ئەزموونی خودئاگایی وەك ئەزموونێکی ڕەسەن و بەرایی لە قەڵەم نادرێت ، بەڵکوو بۆ هیگڵ ، ئەم ئەزموونە دەرەنجامی ئـەزموونی کارلێك کردنە .[177] لە بەر ئەوەی هیگل دروستبوونی "مـن" نابەسـتێتەوە بـە بیرکردنـەوەی "من"ی تەنیای گۆشەگیر بە سەرخۆیدا، بەڵکو لەپرۆسسی فۆرمۆلەبوونـدا دەرکـی دەکـات ، واتە لـە یـەکبوونی پەیوەندیکارانـەی خـودە دژبـەرەکان دا، ئـەوەی لێـرەدا یەکلاکەرەوەیـە بیرکردنەوە نییە لەوەی هەیـە ، بـەڵکو ئـەو نێوەندەیـە *medium* کـە شوناسـی گشـتی و تاکەکەسی تێدا سەر هەڵدەدات. هیگڵ باسی ئەو نێوەندە دەکات کـە ئاگـایی لـە میانیـەوە بوونێکی کردەکی بە دەسـت دێنێـت.[178]هیگـڵ تەسـلیمی دیـالیکتیکی "مـن" دەبێـت لـە چوارچێوەی نێوانخودێتی *Intersubjectivity* ئەو روحـە دا کـە"من" پەیوەنـدی بەخۆیـەوە ناکات بە پێیەی "ئەویتر-الآخر" خۆیەتی، بەڵکو "من" لەگەڵ "من"ێکـی تـردا پەیوەنـدی دەبەستێ بەو پێیەی ئەویتریەتی.[179]

هابرماس پێیوایە لێرەوەیە هیگڵ ئاماژە بە بـوونی کـردەی پەیوەندیکارانـە دەکـات لـە نێوەندێك دا کە خۆی گرنگی پێدەدات ئەویش (خێزان)ە وەك نێوەندێك لە ژیانی هاوبەشی کـە کارلێکی تێدا ئەنجام دەدرێت وکاریگەری لە سەر ڕەفتاری دوولایەنەکە دادەنێت، هـەروەك لـە سەرەتاوە ئاماژەی بۆ کرا جگە لە خێزان هیگڵ ئاماژە بە دوو نێوەندی گرنگی تریش دەکـات کە ئەوانیش زمان و کارە. بە بڕوای هابرماس ئەگەر بوونی ئامراز (یان وەسیلەی) گەیشتن بە لێك تێگەیشتن لەرێگای زمانەوە تایبەتمەندییەکی بەرجەستەی ژیانی مـرۆڤ بێـت، ئـەوا لـەم حاڵەتە دا ناتوانین بەرهەم هێنانـەوەی کۆمەڵایـەتی تـەنیا لـە"کار" دا کـورت بکەینـەوە ، هەروەك مارکس لە بەرهەمەکانی خۆیدا ئـەنجامی دابـوو، بـەڵکو بـە پێچـەوانەوە سـەرەڕای چالاکی تایبەت بە دەسەلاتگرتن بەسەر سروشـت دا، بـەکارهێنانی پەیوەسـت بـە کـارلێکی زمانیش رویەکی تری پەرەسەندنی مێژووییە.[180] لێـك تێگەیشـتن و پەیوەنـدی ئـاڵوێری بـە

---

١٧٧ .پیتر میلر ،سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٨. هەروەها لە کتێبی

- *Jurgen Habermas ,Theory and Practice ,op.cit.,pp.144-145.*

١٧٨ . یورغین هابرماس ، التقنیە والعلم کأیدولوجیا ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٦.

١٧٩ . سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٨.

١٨٠ .حسینعلی نوزری ، بازخوانی هابرماس، سەرچاوەی پێشوو، ل٥٤.

نێوبەندی زمان هەل بۆ خودەکان دەڕەخسێنێ تەعبیر لە بوونی خۆیان بکەن «لەم کاتەدا من دەچێتەناو پەیوەندیەکی نێوان کەسێتی بەو رادەیەی کە بەشداری لە کارلێك دا دەکات ، دەرفەتی ئەوەی پێ دەدرێت گوێ لە خۆی بگرێت بە لەبەچاو گرتنی روانگەی "ئەویتر"».[181] چەمکی دیالیکتیك بەو جۆرەی هابرماس بەکاری دەهێنێت دەبێتە هۆی بەرهەم هێنانی نمونەی پەیوەندیکاری پراگماتیکی (تداولي ) بە دوور لە هەژموون و زۆرە ملێی وتوندوتیژی. ئەم نمونەیە کە پرۆژەی کۆمەڵایەنی و سیاسی لەسەر دادەمەزرێت لە سەر بنەمای پەیوەندیکاریەکی نە شێواوا ( **غير المشوه** )بونیات دەنرێت. لێرەوە زەرورەتی گەڕان بە دوای هەندێ ڕێگای دڵنیا بۆ ئەوەی اعتراف بەخود بکرێت لە لایەن ئەویترەوە دێتە ئاراوە بە بێ پەنابردن بۆ پەیوەندیەك کە لەسەر بنچینەی ململانێی پڕ لە زەبروزەنگ دامەزرابێت، بۆ ئەوەی خود لەگۆشەگیری دەربچێت . هابرماس بە بەکارهێنانی ئەم بیرۆکەیە تەنیا ڕەخنە لە وتەزای دیالیکتیکی مارکس ناگرێت کە تەنیا لە سەر بنەمای ململانێ(الصراع) دامەزراوە ، بەڵکو هاوکات دەیەوێت ڕەخنە ئاراستەی فەلسەفەی خود یان فەلسەفەی ئاگایی(**الوعي**) بکات چونکە ئەم فەلسەفەیە کە کانتگەرایی و دیکارتگەرایی نوێنەرایەتی دەکەن هەوڵ دەدات بۆ سەلماندنی بوونی "من" و "ئاگابوون" لە خۆی بەبێ پێوست بوونی خودێکی تر.[182]

مارکس لەسەر ئەو بڕوایەیە کار «مەرجی بوونی مرۆیانەی سەربەخۆییە لە هەموو فۆرمە کۆمەڵایەتییەکان دا، نەك هەر ئەمە بەڵکو زەرورەتێکی سروشتی ئەبەدییە و ئەمەش لەپێناو نێوەندی ئاڵوگۆڕی ماددەیە لە نێوان مرۆڤ و سروشت دا و لەوێشەوە گۆڕانکاریە لە ژیانی مرۆیی دا، لە سەر ئاستی ئەنترۆپۆلۆژی، سروشتی خودێتی(الذاتية) مرۆڤ جیاوازە لە سروشتی بابەتیەتی (الموضوعية) ژینگە و لە هەمان کات دا خودی مرۆڤ نێوەندێتی سەیرورەی بەرهەم هێنانی کاری کۆمەڵایەتی دەکات».[183]

بەبۆچوونی هابرماس تەنیا مارکس لەگرنگی زۆری سەیرورەی کار تێ گەیشتووە، بەجۆرێك مارکس پێیوایە شتێکی نامەعقولە ئەگەر بەشێوەیەکی سەربەخۆ سەیری بکرێت [واتە بە جیا] لەهەر فۆرمێکی کۆمەڵایەتی دیاریکراو وەك زەمینەی دامەزراندنی بونیادی

---

١٨١ . هبرماس ، القول الفلسفي للحداثة ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٥٦.

١٨٢ .محمد الاشهب ، سەرچاوەی پێشوو، ص١٠٦ .

١٨٣ . یورغن هابرماس ، المعرفه والمصلحه ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٦.

مانای نەگۆڕی ژیانی کۆمەلاّیەتی ممکین. کاری کۆمەلاّیەتی تەنیا بناغەیەك پێك دێنێت وەك وتەزا(مقولە) بۆ نێوبەندی لە نێوان سروشتی بابەتی و خودی دا ...نە سروشت بە شێوەیەکی بابەتی و نە سروشت بەشێوەیەکی خودی راستەوخۆ هاوتای کائینی مرۆیی نیین[184] واتە یەکسان نییە بە جەوهەری مرۆڤ، بەڵکو مرۆڤ بەرهەمی واقعی کۆمەلاّیەتی و ئاستی کارلێکە. تۆماس مك کارتی *Tomas McCarthy* رەخنەگر و وەرگێڕی بەرهەمەکانی هابرماس بەم جۆرە جیاوازی لە نێوان کار و کارلێك دادەنێت:

> **سووربوون لە سەر "ناچوونیەکی " کار و کارلێك لە پێناو خۆپاراستن لە تێکەلاّوکردنی تەخنە *techne* و پراکسیس یان پێشکەوتنی تەکنیکی و رێنمایی عەقلاّنی ژیان ئەنجام دەدرێت . گەشەی هێزە بەرهەم هێنەرەکان لەخودی خۆیدا بە مانای جێگرتنەوەی رێکخستنی پەیوەندی کۆمەلاّیەتی ئەوتۆ نییە کە لەسەر بنەمای پەیوەندی بەری لە دەسەلاّت دامەزرابێت لە جیاتی ئەو دەزگایانەی کە لەسەر بناغەی زۆرەملێ و هێز بنیات نراون.[185]**

هەربۆیە توێژینەوەی هابرماس لەمەڕ کۆمەلّگا گرنگیەکی زۆری هەیە کە رەهەندە جیاوازەکانی کردەی کۆمەلاّیەتی بە روونی لەیەکتری دەکاتەوە، تەنیا لەم حالّەتەدایە کە دەتوانین لە پەیوەندی دوولایەنە و کارلێك تێبگەین.

## تەوەری دووەم: (ئەویتر) و ئاگایی نێوانخودی

رەخنەی سەرەکی یورگن هابرماس لە فەلسەفەی رۆژئاوا لەوەدا چڕ دەبێتەوە کە لە جیاتی ئەوەی بریتی بێت لەمەعریفەیەکی نێوانخودی کە لە رێگای دیالۆگ و باشترین ئەرگۆمێنتەوە بەرهەم هاتبێت، بەرهەمی خودی تەنیا و گۆشەگیرە کە لەنێو بیرکردنەوەی خۆیدا نغرۆ بووە و لە دونیا رادەمێنێت، هەر بۆیە بەردەوام لە قەیرانێکەوە توشی تەنگژەیەك بووە و بە رای هابرماس هیچ کام لە پرۆژە فەلسەفیەکان هەر لە ئەفلاتونەوە تا دریدا* نەیانتوانیوە گرفتی

---

١٨٤. هەمان سەرچاوە ، ل٣٨.

١٨٥. ویلیام اوث وایت، سەرچاوەی پێشوو ،ل ٣٤.

* جاك دریدا (١٩٣٠-٢٠٠٤) فەیلەسوفی فەرەنسی و دامەزرێنەری میتۆدی هەلّوەشاندنەوەگەرایی لە فەلسەفە و ئەدەب و زانستە مرۆڤایەتیەکان دا.

فەلسەفە کە کێشەی ئاگایی و خود-سەنتەرییە چارەسەر بکەن و لە هەندی پرۆژەی فیکـریش دا کاتێ هەوڵی دەربازبوون درابێت ئەوا سەر لـەنوێ بەپشـت بەسـتن بـە فەلسـەفەی ئاگـایی ویستویانە لە کێشەکە رزگاریان بێـت. ئـەم جـۆرە بیرکردنەوەیـە رەگـە قوڵـەکانی بـۆ رینـێ دیکارت*دەگەرێتەوە. دیکارت پێیوایە «ئەگەر ئێمە گومان لە هەموو شتێك بکەین، ئەوا ناتوانین گومان لەوە بکەین کە هەین. رستەی "من هەم- أنا موجود"لە راستی دا رستەیەکی جەبریە».[١٨٦] دیکارت پێیوایە ئەگەر نکۆڵی لە هەموو ئەو شـتانە بکـەین کـە نایـەقینین وەك بوونی جیهانی دەرەکی و بوونی ئەوانیتر و بەتایبەتی بوونی جەستە و تەنانەت کاری سروشـتی عەقڵ، لەناکاو ئەوە کەشف دەکەین کە ئەم نکۆڵی کردنە هەمیشە پێویسـتی بـە سـەلماندنی بوونی کائینێك هەیە کە بیردەکاتەوە.[١٨٧] جگە لەم بنـەما فەلسـەفییەی دیکـارت بـەلاّم لـە روانگەی هابرماسەوە ئەمە رامـانی تاکێکـە و نەخراوەتـە بـەردەم ئـەرگۆمێنت خوازییـەوە. دیکارت رای وایە «بیرکردنەوە سیفەتێکە تایبەیە بـە"مـن"و تاکـە شـتێکە کـە وابەسـتەیە پێیەوە...[دیکارت دەڵێت] ئەگەر لە بیرکردنەوە دابرێم،رەنگە بەتەواوی لە بوونم دابرێم».[١٨٨] هێزی (من بیردەکەمەوە_انا افکر) هێزیکە لە دۆزینەوەی پەیوەندی جێگیری نێوان بیرکردنەوە و بوون دا پەنهانە.[١٨٩] لێرەدا من وەك منێکی بیرکەرەوە پشت بە تێڕامانی خۆی دەبەسـتێت بۆ ناسین وزانین و پەیوەندی لەگەڵ خودی خۆیدا هەیە بەو پێیـەی کـە بـوونێکی ئەبسـتراکتی هەیە، هابرماس پێیوایە لەم جۆرە بیرکردنەوەیە یەکیەتی خود سەر هەڵدەدات وەك ئاگاییەکی

---

* رینە دیکارت Descartes Reně( 1596-1650) فەیلەسوف و ماتماتیکزانی فەرەنسی، داهێنەری هەندەسەی شیکاریە و هەوڵی دا میتۆدی ماتماتیك بەسەر فەلسەفە دا پیادە بکات و پاشان فەلسەفەی خۆی لەسەر بنەمای گومانی میتۆدی دامەزراند. سەرچاوە: د.عبدالوهاب کیالی، **الموسوعة السياسية**، الجزء الثاني، المؤسسة العربية للدراسات و النشر، دار الهدى للدراسات و النشر، بيروت، ١٩٧٩ص ٧٤٧.

١٨٦. رینە دیکارت، تأملات ميتافيزيقية في الفلسفة الاولى، ت:كمال الحاج ،منشورات عويدات، ط٤، بيروت -باريس، ١٩٨٨، ل ٣٨.

١٨٧. جنفیاف رودیس لویس ، دیکارت و العقلانية ، ت: عبدة الحلو ، منشورات عويدات ، بيروت- باريس ،ط٤، ١٩٨٨، ص ٣٧.

١٨٨ . رینە دیکارت، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٢.

١٨٩ . جنفیاف رودیس لویس ، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٨.

(وعي) خودی. کەواتە "من"ی بیرکەرەوەی دیکارتی بە پشت بەستن بە تێڕامانی خۆی دەگاتە ئەو دەرئەنجامەی کە بوونی هەیە واتە بە رای دیکارت بنەمایەکی جێگیری نەگۆڕە بۆئەوەی بوون بناسین و ناتوانین گومانی لێبکەین، بەلاّم فردریش نیچە* لە رەخنە کاریگەرەکانی خۆی لە کوگیتۆی دیکارت( ***واتە من بیردەکەمەوە کەواتە من هەم***) ئاماژە بە زەرورەتی نێوەند و بابەتی بیرکردنەوە دەکات و بیرکردنەوەی منی ئەبستراکت بە خوڕافە وەسف دەکات.

بە رای (نیچە) "هێشتا خەڵکی تەئەمولانی ساویلکە هەن کە پێیانوایە "یەقینی بێ نێوەند" ی وەك "*من بیردەکەمەوە*" یان خوڕافەی شۆپنهاوەری* واتە "*من دەمەوێت*"بوونیان هەیە. وەك ئەوەی لێرەدا مەعریفە بابەتەکەی خۆی بە روت و پاکی وەك"شت لە خۆید_شیء في ذاتە" بەدەست بێنێت، واتە نە "خود" دەبزوێت نە"بابەتەکە". بەلاّم دستەواژەی "یەقینی بێ نێوبەند" هەر وەك "مەعریفەی رەها" و "شت لە خۆیدا" دژایەتی ناو و وئاوەڵناوەی لە خۆیدا هەڵگرتوە."[190] *کەواتە نیچە ئەوە پشت راست دەکاتەوە کە هەموو پرۆسسێکی بیرکردنەوە لە بوون و تەنانەت بوون بۆخۆشی دەبێ لە نێوەندێك دا بێتە دی کە شوێنی بەریەککەوتنی خودەکانی تریشە. (نیچە) دەڵێت من لە شیکردنەوەی ئەو روداوەی کە لە دەستەواژەی "من بیردەکەمەوە" دەربڕدراوە توشی کۆمەڵێك بۆچوونی هەڵنەسەنگێنراو دەبم کە گرانە و رەنگە محاڵ بێت پاساویان بۆ بهێنیتەوە. مەبەستی ئەوەیە کە ئەوە کێیە کە بیردەکاتەوە و بیر لە چی دەکاتەوە و بابەتی بیرکردنەوە کە کار و کردەوەی کائینیکە چۆن هەڵدەسێنگێنرێت و چۆن دەزانرێت ئەمە بیرکردنەوەیە و شتێکی تر نییە. هەربۆیە لەسەر ئەو

---

* فردریش نیچە(١٨٤٤-١٩٠٠)فەیلەسوفی بەناوبانگی ئەڵمانی، رەخنەگری فەلسەفە و شارستانیەتی مۆدێرنی رۆژئاوایە.

* ئارتور شوپنهاوەر(١٧٨٨-١٨٣٢): فەیلەسوفی ئەڵمانی کە ئیرادە لای ئەو شوێنێکی گەورەی هەیە لە بوون دا.

١٩٠. فردریش نیچە، فراسوی نیك و بد، ت: داریوش اشوری ، شرکت سهامی خوارزمی، چاپ٣ ، تهران،١٣٧٩(٢٠٠٠) ، ل ٤٦ . هەروەها — فردریش نیتشه ، ماوراو الخیر و الشر ،ت: موسی وهبه ، الفارابی ، بیروت ، بدون سنه، ص ٣٩- ٤٠.

* contradication in adjecto وەك ئەوەی بڵێین "چوارگۆشەی بازنەیی"کە دژایەتی هەیە لە نێوان ناو و ئاوەڵناوەکە.

بڕوایە «بیرۆکە کاتیَ دیَت کە "ئەو"دەیەویَت نەك ئەو کاتەی کە"من" دەمەویَت».[191] ئـەوە خاڵێکە (نیچە) لە فەیلەسوفەکانی تر جیا دەکاتەوە، واتە دانپیانان و بـوونی "ئـەو" بـوونی "من" دەستنیشان دەکات نەك مەعریفە و ئاگایی "من" لە خودی خۆیدا. کێشەی سـەرەکی فەلسەفەی ئاگایی یان خودی تەنیا لەوەدا چڕنابێتەوە کە خودی ناسـکار ( ذات العارفـة) بـە پشت بەستن بە ئاگایی خۆی زانیاری بە دەست دێنێت، بەڵکو لە پەیوەندی نێوان خود(الـذات) و بابەتدا(الموضوع) دەردەکەوێت واتە هەموو ئەو شتانەی دەکەونـە دەرەوەی خـود بـە بابـەت دادەنرێت، تەنانەت خودەکانی تریش بابەتی جێگەی تێڕامان و دەستکاری خـودن، هابرمـاس ئەم پەیوەندیەی نێـوان خودەکـان هەڵدەوەشـێنێتەوە و لـە پەیوەنـدی نێـوان خـود/ بابەتـەوە *subject/object* دەیگۆڕێت بۆ پەیوەندی نێوان خود/ خود *subject/subject*. بە بۆچوونی هابرماس تیۆری ڕوحی هیگڵ لە سەر بنـەمای بیرۆکـەی نێوەنـد *medium* دامـەزراوە کـە لەناویدا خودێك لەگەڵ خودێکی تردا پەیوەنـدی دەبەسـتێت و لـەم ڕێگایـەوە دوو بکـەر بـە شێوەیەکی دوولایەنە وەك خود یەکتر دروست دەکەن. ئاگایی پانتاییەکی نێوەندە کە لـە سـەر بنەمای ئەمە خودەکان لەگەڵ یەکتردا هەڵسوکەوت دەکـەن ، ئـەم ئاگاییـە بناغەیەکـە بـۆ خۆپاراستن لە بیرۆکەی ئایدیالیی خودگەرایی ئیرادە و سـوژە، وەك هەبوویـەکی خـۆ لـەخۆگر *self-contained-entity*. بەم جـۆرە دەتـوانین دروسـت بـوون و پەرەسـەندنی ئـەخلاق لـە تانوپۆی پەیوەندی نێـوان خودەکـان دەرك بکـەین، ئـەو خودانـەی کـە "لـە سـەر بنچـینەی بونیادێکی بەردەوام ناپایەداری مەعریفـەی دوولایەنـە" دروسـت دەبـن.[192] سـەرەڕای ئەمـە هابرماس رای وایە کە فەلسەفەی ئاگایی، فەلسەفەیەکی مۆنۆلۆگی و تاکبێژانەیە کە ڕێگـای لە هەموو جۆرە ئاڕاستەیەکی نێوان خودی مەعریفە یان کردەی پەیوەندیکارانـە دەبەسـتێت، چونکە کردەی پەیوەندیکارانە دا لە سەر بنەمای دیالۆگ دامەزراوە.[193] ئەمەش جیاوازیـەکی گەورەیە کە هابرماس لە کۆی فەلسەفەی رۆژئاوا هەر لە ئەفلاتونەوە تا دریدا کەشفی دەکات و بنەمایەکی پتەوە بۆ پرۆژەی فەلسەفی خۆی کە هەموو چەمکەکانی تری نـاو بیرکردنـەوەی

---

١٩١ .فردریش نیچە ، سەرچاوەی پێشوو ،ل ٤٧ . هەروەها — فردریش نیتشە ، سەرچاوەی پێشوو ،ل ٤١.

١٩٢.پیتر میلر ، سەرچاوەی پێشوو ، ل٨٨-٨٩. هەروەها بڕوانە: - *Jurgen Habermas,lbid.,p 151.*

١٩٣. د.منصور انصاری، دموکراسی گفتوگویی - امکانات دمکراتیك اندیشەهای میخائیل باختین و یورگن هابرماس ، نشرمرکز، تهران،١٣٨٤(٢٠٠٥) ، ل ٢٨٤.

خۆی لەسەر بونیــات دەنێــت و توێژینــەوەی لەســەر مەعریفــە و زانســتیش هــەر پەیوەنــدی بەتێروانینی بۆ پرسی فەلسەفەی خودی و نێوان خودیەوە هەیــە کــە دواتــر بــە درێــژی باســی دەکەین. گۆڕینی مۆدێلی فەلسەفەی ئاگایی و پەڕینەوە لە عــەقڵی خــود-ســەنتەرەوە بــەرەو عەقڵی پەیوەندیکاری و دەرچوون لە فەلسەفەی خود بەرەو فەلسەفەی نێوان خودی لە ڕێــڕەوی (ئەویتر)ەوە دەبێت. بە بڕوای هابرماس « ئەم مۆدێلە هێزەکەی کەم ناکات تەنیا بــەو رادەیــە نەبێت کە (ئەیتر) نەفی دەکات. بەشێوەیەکی "دیــاریکراو "واتــە بــەو رادەیــەی کــە ئــەویتر هەڵدەستێ بە کەمکردنەوە لێی». [194] لەروانگەی هابرماسەوە مــۆدێلی فەلســەفەی ئاگــایی لەناو ناچێت تەنیا ئەوکاتە نەبێت کە لەجیاتی مۆدێلی مەرجەعی خود بۆ خود کە لە تەنیایی دا کار دەکات و دەزانێت ، مۆدێلێکی دیکە دابنرێت واتــە مــۆدێلی لێــك تێگەیشــتن، واتــە پەیوەندی نێوان خودەکان و نێوان ئەو تاکانەی کە بەشێوەیەکی کۆمەڵایــەتی ئــاوێزانی(دمج) یەکتر بوونە و لە ڕێگەی پەیوەندیەوە هەموویان دان بەیەکتر دادەنێن. [195]

لایــەنی دیــاری ئیشــی هابرمــاس ئەوەیــە کــە پرۆســـی زانــین*knowing* و تێگەیشــتن *understanding* لەسەر بنەمای فەلسەفەی گوماناوی منێکی ترانسێندێنتاڵ دانەمەزراوە، بەڵکو لەسەر بناغەی نموونەی هاوبەشی ئێمــە لــە بــەکارهێنانی ئاســایی زمــان و کــارلێکی پەیوەندیکاری ڕۆژانە بنیات نراوە. [196] هەروەك لەم خشتەی خوارەوە دا پەیوەندی نێوان خود و بابەتی مەعریفە و کردەی زانین خراوەتەڕوو.

---

١٩٤. هبرماس ، القول الفلسفي للحداثة ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٧٥.

١٩٥. سەرچاوەی پێشوو ، ص٤٧٥.

١٩٦. مایکل پیوزی ،یورگن هابرماس ،ت:احمد تدین ، انتشارات هرمس ، تهران ، ١٣٧٩ -٢٠٠٠ ،ل ٣٣
*.Michael Pusey ,op.cit., ,PP.,22-23*

| خودSubject | | بابەت Object | | کردە Action | |
|---|---|---|---|---|---|
| من | | لەوە | | بیردەکەمەوە | think |
| من | جیهانی نێوان خودی | ئەوە | جیهانی بابەتی | دەزانم | know |
| من | the objective | ئەوە | the Objective | دەرك دەکەم | perceive |
| من | World | ئەوە | World | تێدەگەم | understand |
| من | | ئەوە | | لێك دەدەمەوە | interpret |
| من | | ئەوە | | وادادەنێم | posit |

خشتەی پەیوەندی مەعریفی بکەری ناسکار و جیهان سەرچاوە:*Michael Pusey* ,*P.21*

کەواتە لەبەر ئەوەی ئەم پەیوەندیە لەسەر بنەمای لێك تێگەیشتنی خودەکان لە ناو واقعێکی دیاریکراو دا دامەزراوە هەربۆیە خودەکان دەتوانن لە نۆرم و بەها و ماناکان تێبگەن و لەپێناو گەیشتن بە رێککەوتن و کۆدەنگی سەرلەنوێ بەکاریان بێننەوە. هابرماس لە بەرهەمەکانی خۆیدا زۆربەی کات « فەلسەفەی ئاگایی کە بەرهەمی خودێکی تاك و تەرایە کە بیر لە جیهان دەکاتەوە لە بەرانبەر چەمکی کارلێکی نێوانخودی دادەنێت. لەم چەمکەدا مانا، فۆرم و بەها هاوبەشەکان بالآدەستن».[197] بە بۆچونی هابرماس پرۆسسی (بەرهەم هێنانی مانا) شتێکی زیاتر لە مۆدێلی تاکە بکەرێکی ناسکار لە خۆدەگرێت کە بەربژارەکانی (خيارات)تر رەت دەکاتەوە یان بەلاوەیان دەنێت بۆئەوەی یەك بەربژار رۆشن و ئاشکرا ببێت، واتا پێویستی بە لایەنێکی دیکەی گفتوگۆ ودیالۆگ هەیە. شوناس و هاوتا بونی مانا ئاماژە نیە بۆ نەرێ لێکردن بەڵکو ئاماژەیە بۆ فاکتەری دڵنیا کەری دروستی و بەهای نێوان خودی.[198]

ئەمە نەك هەر بۆ بەرهەم هێنان و دووبارە بەرهەم هێناناوەی ماناو بەهاکان ڕاستە بەڵکو بەشێوەیەکی گشتی بۆ بەرهەم هێنانەی حەقیقەتیش ڕاستە. بەپێی فەلسەفەی ئاگایی حەقیقەت بەرهەمی خودی بیرکەرەوەیە کە پێویستی بە داپێنان و بوونی ئەویتر(

---

١٩٧ .رابرت هولاب، یورگن هابرماس – نقد در حوزه عمومی ت:د.حسین بشیریه ،نشر نی ، چاپ ٤،تهران ١٣٨٦-٢٠٠٧،ل ٣٩-٤٠ .

١٩٨ .سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٦٤.

الآخر) نییە، بەڵكو لەخودی خۆیدا دەتوانێ حەقیقەت بەرهەم بێنێ. لێرە دا پێویستە ئاماژە بەوە بكەین كە نەك هەر بەرهەم هێنانی حەقیقەت و مانا و بەهاكان لە خودی خۆیاندا ناكرێ كێشەسازن بەڵكو كاتێ ئەمە لەناو واقعی سیاسی و كۆمەڵایەتی دا وەك تاكە مەرجوع و نوێنەری كۆی بیركردنەوەو تێڕوانینی كۆمەڵگا دروستی هەبێت و مەشروعیەتی پێ بدرێت و لە لایەن دەسەڵاتەوە پاساوی بۆ بهێنرێتەوە، ئەوا قەیران و ئاستەنگی گەورە لەبەر دەم گەشە و پەرەسەندنی خودە جیاوازەكان دروست دەكات.

**بەبڕوای هابرماس دەبێ «مۆدێلی بكەری ئاراستەدار بەرەو لێك تێگەیشتن لە جیاتی خودی ناسكار دابنێین، بۆ ئەوەی ئاراستەی بەبابەتیكراو(*objectivant*- الموضع) بوەستێت. بەو جۆرەی كە خودی ناسكار بەهەمان شێوەی گەڕانەوە بۆ شتە ماددیە هەبووەكانی جیهان بۆخۆی دەگەڕێتەوە... ئەوانەی لەڕێگەی ڕێككەوتن لە نێوان خۆیان دا لەسەر ئەو شتەی لە جیهان دا بوونی هەیە ، پڕۆژەكانیان هەماهەنگ دەكەن».**[199]

هابرماس پێیوایە خودی ناسكار هەم كۆمەڵایەتیە و هەم دینامیكیە. لێرەدا لە كانت و نەریتی فەلسەفەی كلاسیك زۆر دوور دەكەوێتەوە، ئەو نەریتەی كە وەك نیگەرانی و پەرۆشی تاكێكی تەنیا لە ڕوبەڕوبوونەوەی لەگەڵ لوغزی گەردوون مامەڵە لەتەك پرسیارە ئەپستمۆلۆژیەكان دا دەكات. بەڕای هابرماس زانین و مەعریفە لە ڕووی كۆمەڵایەتیەوە هەماهەنگ دەكرێن و لە هەموو ساتێك دا ئەزموونی مێژووی ئێمە فاكتەری مەرجداركردن و نێوەندەكیەتی...هیچ زانیارێك *knower* بێ كلتور بوونی نیە، مەعریفە بە نێوەندی ئەزمونی كۆمەڵایەتی بەدەست دێت.[200]

هابرماس بە ڕەخنەگرتن و توێژینەوە لە فەلسەفەی ڕۆژئاوا و بەتایبەتی فەلسەفەی هیگڵ و ماركس جیاكاری دەكات لە نێوان چەمكی"كار" و "كارلێك – تفاعل" دا و لە ناو پرۆژەكەی خۆیدا تەوزیفی دەكاتەوە ، چەمكی كار دەچێتە ژێر چەمكی كردەی ئامرازییەوە و چەمكی كارلێك لە ژێر مەفهومی كردەی پەیوەندیكارانە دا جێ دەگرێت،

---

١٩٩ .هبرماس ، القول الفلسفي ، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٥٥.

٢٠٠. مایكل پیوزی ، سەرچاوەی پێشوو ،ل ٢٣. . *Michael Pusey ,pp.23*-

له ژێر چەمکی کار یان کردەی عـەقلانی ئامانجـدار *Zweckrationales Handelns* دا، یان کردەیەکی ئامرازی یان هەڵبژاردنێکی عەقلانی یان ئاوێتەیەك لـە هـەردووکیان دەبینرێت . بەلاّم لە کارلێك یان کردەی پەیوەندیکاری دا کارلێکی سـیمبۆلی دەبینرێـت کە بەپێی نۆرمە دروستە ئیلزامیەکان دێنەئاراوە کە تەنیا لە ڕێگای بەشداری لـە لێـك تێگەیشتن سەبارەت بە ئامانجەکان دروست دەبن.[201] بەمانەیەکی تر ئەوە لە کاتێك دایـە کە کردەی ئامرازی، ڕێکخەری ئەو ئامراز و کەرستانەیە کـە بـە پێـی کـۆنترۆل کردنـی کاریگەری واقعیەت ڕەنگە گونجاو بن یان نا. کردەی ستراتیژی تـەنیا لـە سـەر بنـەمای هەڵسەنگاندنی فـەراغ و بۆشـاییەکان ئەگـەری هاتنـە ئـارای هەیـە.[202] بـەلاّم زاراوەی "کارلێـــك" بـــەمانای کـــردەی پەیوەنـــدیکاری یـــان کـــارلێکی ســـیمبۆلیك بـــەکار دەهێنێت.کردەیەکی دوولایەنە لە نێوان دوو خود یان زیـاتر کـە پێشـتر لەسـەر نـۆرم و بەهاکان پێك هاتوون. ئەمە توخمێکی گرنگی دیکەی پرۆژەی فەلسـەفەفی هابرماسـە، لەبەرئـەوەی دەیـەوێت ئـەوە بخاتـە ڕوو کـە ئاگـایی نێوانخـودی و کارلێـك کـە بناغـە فەلســەفیەکەی لای هیگــڵ و مــارکس بەرچـاو دەکـەوێت، دەشـێت وەك بنەمایـەك بـۆ فەلسەفەی نێوانخودی بەکار بهێنرێت، چونکە کارلێك زیاتر لـە لایـەن و خودێـك لـەخۆ دەگرێت کە لە ناو پرۆسسی بە یەك گەیشتن و لێك تێگەیشتن و دیـالۆگ، دان بـە یـەکتر دادەنێن وباشترین و دروستترین ئەرگۆمێنت هەڵدەبژێرن.

بەم جۆرە دەتوانین بڵێین هابرماس چەمکی "کار" وەك توانای عەقلی ئەفراندنی خود و بەرهەمی مرۆڤ بۆ کاریگەری دانان لەسەر سروشت و ئەوانیتر دەگۆڕێت بۆ "کارلێك". لە پرۆسسی کارلێك دایە کە زمان و پەیوەندییە کۆمەلاّیەتیەکان و بـەها ئەخلاقییـەکان مانا وەردەگرن و دەشێ بخرێنە بەردەم هەڵسەنگاندنەوە و بەمەش پەیوەندییـەکی نێـوان کەسی *interpersonality* دروست دەبێت، بەم جۆرە "مـن" و "ئـەویتر" کارلێـك لەگەڵ یەکتردا دەکەن و لێـرە دا "مـن" پەیوەنـدی لەگـەڵ خۆیـدا نابەسـتێ بەوپێیـەی "ئەویتری" خۆیەتی و لە خۆی رادەمێنێ ، بـەڵکو لەگـەڵ "منێکـی" تـر دا پەیوەنـدی

[201]. محمد الاشهب ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٠٥ .

[202]. یورگن هابرماس، علم و تکنولوژی در مقام ایدئولوژی ، مجله ارغنون ، شماره ١، ص ٧٠-٧١.

دەبەستێ بەو پێیەی "ئەویتریەتی". هابرماس فەلسەفەی ئاگایی و خودیی *subjectivity* کە نەریتی بالاّدەستی فەلسەفەی رۆژئاوایە و لە (ئەفلاتون)ەوە تا (دریدا) درێژ دەبێتەوە، کە تێیدا مەعریفە لەمەڕ خۆ و دەورووبەر لە میانی رامانی خودەوە بەدەست دێت دەگۆڕێ بۆ فەلسەفەی نێوانخودی *Intersubjectivity* . بەم جۆرە جیهان و راڤەکانی بەرهەمی بیرکردنەوەی بکەر و خودێکی ناسکار نییە کە بەشێوەیەکی ئەبستراکت گەلاڵەبوونی مەعریفە وێنا دەکات بە بێ بوونی نێوەند، بەڵکو لە هەناوی پرۆسسی راگۆڕینەوەی نێوانخودی ئەنجام دەدرێت و لێرەوە فەلسەفە لە مۆنۆلۆگەوە دەگۆڕێ بۆ دیالۆگ و ئەمەش دیسان لە سەر بنەمای پەیوەندیکاری دیموکراتی دادەمەزرێت و یەکێکە لە زەمینە فەلسەفییەکانی دیموکراسی راوێژگەری.

## باسی سێیەم
## عەقڵانیەت و مۆدێلەکانی کردەوە

لە کلتور و هزری رۆژئاوادا چەمکی عەقڵانیەت لەگەڵ ناوی ماکس ڤیبەر*، کۆمەڵناسی بەناوبانگی ئەڵمانیا لەسەرەتای سەدەی بیستەم گەشەیەکی بەرچاو بەخۆوە دەبینێت. ڤیبەر ناوەرۆکی مێژووی هاوچەرخی رۆژئاوا و کرۆکی مۆدێرنیەتە وەك بەعەقلانی بوون لێك دەداتەوە. ڤیبەر دەیەوێت «بە پشت بەستن بە چەمکی عەقڵانیەت، کاریگەری پێشکەوتنی زانستی و تەکنیکی لەسەر دەزگای ئەو کۆمەڵگایانە روون بکاتەوە کە لە حاڵەتی بەمۆدێرن کردن*modernization* دابوون».[٢٠٣] ماکس ڤیبەر لە میانی رێرەوی بەعەقلانی بوون هەوڵی دا بۆ بلاوکردنەوە و قوڵکردنەوەی عەقڵانیەت و ئەمەش ئەو عەقڵانیەتەیە کە ماکس هۆرکهایمەر بە عەقڵانیەتی ئامرازی (العقلانية الأداتية) ناوزەدی کردووە و مەبەست لەم چەمکە کۆی ئەو کەرەستە یان رێسا تەکنیکیانەیە بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی دیاریکراو.[٢٠٤] هەروەك پێشتر باسمان کرد بە رای هۆرکهایمەر «عەقڵی ئامرازی ، عەقڵی بالادەستە بەسەر کۆمەڵگا سەرمایەدارییە نوێیەکان دا ، بە جۆرێك عەقڵ رۆڵی خۆی وەك توانستی هزریی

---

* ماکس ڤەیبەر Max Weber1864-1920 گەورە کۆمەڵناس و بیرمەندی سیاسی ئەڵمانی، لە ئەیرفۆرت Erfurt لە دایك بووە، لە زانکۆکانی بەرلین و هایدلبرگ مێژوو، ئابووری و یاسای خوێندووە. ڤیبەر کۆمەڵێك توێژینەوە و بەرهەمی گرنگی تیۆری لە بواری کۆمەڵناسی سیاسی پێشکەش کردووە و کتێبەکانی بریتین لە: - زانا و سیاسەتمەدار ، - ئابووری و کۆمەڵگا، - توێژینەوەیەك لەسەر تیۆری زانستی، - ئەخلاقی پرۆتستان و رۆحی سەرمایەداری. سەرچاوە: عبدالوهاب الکیالی، ج ٤، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٥٦.

٢٠٣. یورگن هابرماس، علم و تکنو لوژی در مقام ایدئولوژی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٩.

٢٠٤. د. عمر مهيبل، اشكالية التواصل في الفلسفة الغربية المعاصرة، منشورات الاختلاف-المركز الثقافي العربي، بيروت ، ٢٠٠٥، ل ٣٤٧.

لەدەست داوە و تەنیا كورت بۆتەوە بۆ ئامرازێك بۆ بەدیهێنانی ئامانجە دیاریكراوەكـان».[٢٠٥] هۆركهایمەر مەبەستی لە عەقلانیەتی ئامرازی ئەوەیە كۆمەڵێك كەرەستە و رێسای تـەكنیكی زامنكەری بەدیهینانی مەبەستێكی دیاریكراوە كـە پەیوەسـتە پێیـەوە و هـەوڵێكی تاقـەت پروكێنی دەوێت بۆ بەدیهێنانی.[٢٠٦] پێ بە پێی ئەمە عـەقڵ توانـای خـۆی لەدەسـت داوە بـۆ دەركردنی حەقیقەتەكان لە خودی خۆیان دا و هەموو شـتێ تـەنیا كەرەسـتەیە. هـەر لێـرەوە هابرماس جۆرەكانی عەقلانیەت كە بریتین لە عەقلانیەتی مەعریفی -ئامرازی و نۆرمـاتیڤی تەعبیری و پەیوەندیكاری لێك جیا دەكاتەوە و لەم نێوەش دا ئاماژە بە چوار مۆدێلی كـردەوە واتە كردەی ئامانجدار و رێكخستنی نۆرماتیڤ و نمایشی و پەیوەندیكاری.

## تەوەری یەكەم: عەقلانیەت لە دیدی (یورگن هابرماس)ەوە

هابرماس جەخت لەسەر ئـەوە دەكاتـەوە كـە سـەرەڕای ئـەو رەخنەیـەی كـە دەكـرێ ئاراسـتەی عەقلانیەت و مۆدێرنیتە بكرێت و سەرەڕای هەندێ دەرەنجامی تراژیدی(وەك هەر دوو جەنگی جیهـانی و هۆلۆكۆست) كە لە عەقلانیەتی تەكنیكیەوە سەرچاوەیان گرتووە، بـەڵام نـاتوانین بـە هـیچ جۆرێـك دەست لە عـەقڵ هـەڵبگرین[٢٠٧]. لـە پێناسـەیەكی گشـتگیردا دەتـوانین بڵـێین عەقلانیـەتی بـاوەڕو كردەوەكان ئەو بابەتانەن كە زۆربەی كات فەلسەفە خۆیان پێوە خەریك دەكات، تەنانەت دەتوانین بڵـێین هزری فەلسەفی بە شێوەیەكی گشتی لە تێڕامان لەمەڕ عەقڵ بەو جۆرەی كە لە مەعریفە و ئاخاوتن و كردەوەدا بەرجەستە بووە، سەرچاوە دەگرێت و عەقڵ بابەتی سەرەكی هزری فەلسەفیە. فەلسەفە هـەر لەسـەرەتاوە هەوڵـیداوە جیهـان وەك هەمـەكێك (كـل) ڕوون بكاتـەوە، وەك یـەكێتی( وحدة) لـە فرەیی(تعددیة) دیاردەكان دا، ئەو جیهانەی كە دەبێ بنەماكانی لە عـەقڵ دا بدۆزرێتـەوە.[٢٠٨] تیـۆری

---

٢٠٥. ابو النور حمدي ابوالنور حسن، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣٣. وەرگیراوە لە
- H. Horkheimer,the Eclipse of Reason ,Continun , New York, 1974, p.7.

٢٠٦ . د. عمر مهيبل ، من النسق الى الذات، منشورات الاختلاف ، الجزائر،٢٠٠٧، ل ١٤٧.

٢٠٧ . محمد نورالدين افاية ، الحداثة و التواصل في الفلسفة النقدية المعاصرة- نموذج هابرماس، افريقيا الشرق، ط٢ ، بيروت ، ١٩٩٨ ،ل١٣٣.

٢٠٨. یورگن هابرماس ، نظريه كنش ارتباطی-عقل و عقلانيت جامعه - جلد ١، ت: كمال پولادی ، انتشارات مؤسسه ايران ، تهران ،١٣٨٤ (٢٠٠٥)، ل ٥٣. (تێبینی: بۆ رێكخستنی زاراوە و زانیاری زیاتر بەراوردمان كردووە بە دەقە ئینگلیزییەكان:

عەقلانیەت لای ماکس ڤیبەر سەرچاوەیەکی سەرەکی پرۆژەی فەلسەفی هابرماس و ئەو باکگراوندەیە کە پرۆژەکەی لەسەری بونیات نراو. ماکس ڤیبەر لە سێ ڕوانگەوە سەیری عەقلانیەت دەکات: بەکار هێنانی ئامرازەکان، دانانی ئامانجەکان و چوون بەرەو بەهاکان. عەقلانیەتی ئامرازی کردەیەك، بەو پلانە چالاکە دەپێورێ کە دادەڕێژرێ بۆ پیادە کردنی ئامرازەکان لە پێناو گەیشتن بە ئامانجێکی دیاری کراو دا، عەقلانیەتی هەڵبژاردنی کردەوەش(عقلانية اختيار) بە تەقدیرکردنی دروستی ئامانج و مەبەستەکان دەپێورێ لە ژێر سایەی بەهای دیاریکراو و ئامرازی شیاو و ڕەوشێکی دیاریکراودا، هەروەها عەقلانیەتی نۆرماتیڤی (معياري) کردەوە، بە توانای یەکخستن و ڕێکخستنی میتۆدی و بە نفوزی ئەو کردەوانە دەپێورێ کە مەرجی عەقلانیەتی ئامرازەکان دەستەبەر دەکەن و ئەمەی بە " عەقلانیەتی ئامانجدار" ناوزەد کردووە و هەروەها ئەو کردەوانەی کە مەرجی نۆرماتیڤی عەقڵی دەستەبەر دەکەن ناوی " عەقڵیەتی بەها"ی لێناوە و دەشێ ئەم دووانە لە یەکتری جیاواز بن.[209] لێرە دا تەنیا لە ڕوانگەی هابرماسەوە چەمکی عەقلانیەت شرۆڤە دەکەین و خۆ بەدوور دەگرین لەو میراتە دەوڵەمەندەی کە فەلسەفە بە درێژایی مێژووی خۆی پێشکەشی کردووە. هابرماس هەر لەسەرەتادا دەیەوێت وێنایەکی تاڕادەیەك ڕوون و گشتی لەسەر عەقلانیەت بخاتە ڕوو و واز لە بەکارهێنانە ئەبستراکتەکانی عەقڵ دەهێنێ کە بەشێکی گەورەی هزری فەلسەفی داگیر کردووە. چەمکی عەقڵ لای هابرماس «لە هەموو پرسێکی جەوهەری دوور دەکەوێتەوە، یان بە جۆرێکی تر عەقڵ لای ئەو جەوهەر نییە، جا ئەم جەوهەرە چ بابەتیبێت یان خودی، بەڵکو دەبێتە بارگر (محمول) لێرەوە بایەخ بە عەقلانیەت دەدات لەجیاتی جەخت کردن لە سەر عەقڵ لە شێوە ئە بستراکەکەی دا».[210]

**هەر بۆیە هابرماس دەڵێت: کاتێ تەعبیری "عەقلانی" بەکار دەهێنین، گریمانەکەمان ئەوەیە کە پەیوەندییەکی نزیك لە نێوان عەقلانیەت و مەعریفە دا بوونی هەیە. مەعریفەکەمان خاوەن بوونیادێکی دەستەواژەییە، دەتوانین**

- Jurgen Habermas, the Theory of Communicative Action -Reason and the Rationalization of society ,Volume1,Translated by Thomas McCarthy, Beacon Press, Boston,1984,p.1.

٢٠٩ . د.عطيات ابو السعود، الحصاد الفلسفي للقرن العشرين ،منشاة المعارف، الاسكندرية،٢٠٠٢،ل٩٧ .

٢١٠ . د. عمر مهيبل، اشكالية التواصل في الفلسفة الغربية المعاصرة ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٦٠-٣٦١.

**بیرو باوەڕی خۆمان لە قاڵبی ڕستەدا دەربڕین دەتوانین بـەهۆی متمانـەدار نەبوونەوە ڕەخنە لە مەعریفە بگرین. پەیوەندی نزیکـی نێـوان مەعریفـە و عەقڵانیەت دەربڕی ئەوەیە کە عەقڵانیەتی تەعبیرێك پشـت بـە متمانـەدار بوونی مەعریفەی ناو ئەم تەعبیرە دەبەستێ .**[٢١١]

بەم جۆرە لای هابرماس «هیچ عەقڵێکی پەتی لە ئارا دانییـە کـە بەشـێوەیەکی لاوەکـی خەسڵەتی زمانی هەبێت. عەقڵ بە پێی ماهییەتی خۆی لە پانتایی کـردەی پەیوەنـدیکاری و بونیادەکـانی جیهـانی ژیـن دا بەرجەسـتە دەبێـت».[٢١٢] و عەقڵانیـەتی هـەر تـەعبیرێك *expression* لەسەر بنەمای ڕەخنە خـوازی و بەڵگـەخوازی دامـەزراوە. تـەعبیرێك پـێش مەرجەکانی عەقڵانیەت لـە کاتێـك و تـا ئـەو جێگەیـە دابـین دەکـات کـە بەرجەسـتەکاری مەعریفەیەکی بۆ هەڵەشیاو بێت و هەر بۆیـە لەگـەڵ جیهـانی بابـەتی (واتـە فاکتـەکان) دا پەیوەندی هەبێت و خوازیاری داوەری و حوکمی بابەتیانە بێت. حوکمێك بەمەرجێك دەتوانێت بابـــەتی بێـــت کـــە لەســـەر بنـــەمای بانگەشـــەی مســـداقیەتی نێوانخـــودی *intersubjectiv*دامەزرابێت بەجۆرێك کە بـۆ بینـەر و بەشـدارەکان هـەمان ئـەو مانایـەی هەبێت کە بۆ خودی بکەرەکە (فاعل) هەیەتی. ڕاستگۆیی و کارایی لەم جـۆرە بانگەشـانەن. کەواتە هەرچەندە بانگەشەی پەیوەسـت بـە حـوکم یـان کـردەوە ئامانجـدارەکان (بانگەشـەیی ڕاستگۆیی گوتە یان کارای کردەوە) باشتر لە بەرانبەر ڕەخنە دا بتوانێ داکۆکی لە خۆی بکات ئەوا بە عەقڵانی تر لەقەڵەم دەدرێت.[٢١٣] ئەمە زەمینەیەکی هاوبەشە بۆ نۆرم و بـەهاکان کـە دەبێتە بەستێنی دروست کردنی مانا و لە دەرەوەی ئەم بوارەدا پەیوەندیکاری ئەستەم دەبێت.

**أ– عەقڵانیەتی مەعریفی– ئامرازی:**

ئەگەر لە بەکار هێنانی ناپەیوەندیکارانەی مەعریفە لە کـردەی ئامانجـدارەوە دەسـت پـێ بکەین بەر لە هەموو شتێ دەگەین بە چەمکی عەقڵانیەتی مەعریفی_ئامرازی. بـەم مانایـە

٢١١ . یورگن هابرماس ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٦١. - Jurgen Habermas ,op. Cit.,p.8.

٢١٢. یورگن هابرماس، راه برون رفتنی از فلسفەی سوژە، لە کتێبی لارنس کهون، متنهای برگزیدە از مدرنیسم تا پست مدرنیسم، ویراستار: عبدالکریم رشیدیان، نشر نی، چ ٤، تهران، ١٣٨٤(٢٠٠٥)، ل ٦٣١.

٢١٣. یورگن هابرماس، نظریەی کنش ارتباطی، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٦٣. - Jurgen Habermas ,op. Cit.,p.9.

چەمکی عەقڵی ئامرازی بەرتەسکەو توانای هەڵسەنگاندنی پەیوەندی و دەزگا و سیستەمە کۆمەلاّیەتیەکانی نییە.[214] «ئەم چەمکەی عەقلانیەت ناوەرۆکی هەوڵێکی سەرکەوتوو بۆ پاراستنی خۆی دەگرێتەوە کە لە ڕێگەی هەڵسوکەوتێکەوە کە لەسەر بنەمای مەعریفە لەمەڕ ژینگەی دەورووبەری و هاوجووتی (تطابق) هۆشیارانە لەگەڵیدا بەدەست دێت».[215] کردەیەکی ئاراستەدار بەرەو ئامانج تەنیا کاتێ دەتوانێ عەقلانی بێت کە بکەر(فاعل) مەرجە پێویستەکانی ئەنجامدانی نیەتی خۆی بە ئاراستەی دەستێوەردانێکی سەرکەوتووانە لە جیهاندا دابین بکات. ڕەنگە هەردوو هەوڵەکە شکست بخۆن، ڕەنگە کۆدەنگی(اجماع) بەدەست نەیەت، لەوانەیە دەرەنجامی خوازراو نەیەتە ئاراوە، بەلاّم تەنانەت خودی ئەوشکستانە نیشانەی عەقلاّنیەتی ئەم تەعبیرانەن دەتوانرێت شکستەکان ڕوون بکرێنەوە.[216]

بە پێی بۆچوونی هابرماس لەم مۆدێلەی عەقلاّنیەت دا پەیوەندیەك لە نێوان بکەر و جیهان کە لە "فاکتەکان" پێکهاتووە دەخرێتە ڕوو کە یان ئێستا بوونی هەیە یان لە ڕێگای کردەوە دەشێ دابین بکرێت. بکەر بە شێوەیەکی مەعریفی لە میانی بیروباوەڕەکانی سەبارەت بە جیهان و بە شێوەیەکی ئیرادی لە ڕێگای مەبەستەکانیەوەو و بەهۆی دەستێوەردان لە کاری جیهان، پەیوەندی پێوە دەکات.[217]

عەقلاّنیەتی ئامرازی و عەقلاّنیەتی ستراتیژیی پیوەستن بە مۆدێلی کردەی ئامانجدارەوە. کەواتە بۆچارەسەرکردنی گرفت و کێشە تەکنیکیەکان ودۆزینەوەی ڕێگەچارەی کردەکی بە بێ گرنگی دان بە بەهای پەیوەندی نێوان تاکەکان. کەواتە عەقلاّنیەتی مەعریفی_ئامرازی چالاکیەکە بە ئاراستەی ئامانج و بەدەست هێنانی قازانج و مەعریفەی تێدا دەخرێتە خزمەت سەرکەوتن و مرۆڤ ئەم جۆرە چالاکیە بۆ ناسینی ژینگەی دەوروبەری خۆی بەکار دەهێنێت. هابرماس پەیوەندی نێوان عەقلاّنیەت و مەعریفە بەم جۆرە دیاری دەکات کە «عەقلاّنیەت گرنگیەکی زۆر بە هەبوونی مەعریفە نادات هێندەی گرنگی بە ڕێگاکانی بەکار هێنانی ئەو

---

٢١٤. شاهروخ حقیقی، گذار از مدرنیته، مؤسسة انتشارات آگه،چ٣،تهران، ١٣٨٣(٢٠٠٤)، ل ٢٤.

٢١٥. یورگن هابرماس ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٤.-Ibid.,10.

٢١٦. هەمان سەرچاوە، ل ٦٥.-Ibid.,11.

٢١٧. استیون وایت، خرد، عدالت و نوگرایی- نوشتەهای اخیر یورگن هابرماس ، ت: محمد حریری اکبری ، نشر قطره ،تهران، ١٣٨٠(٢٠٠١) ،ل ٨٨.

مەعریفەیە دەدات کە لەلایەن ئەو خودانــە(ذات) بــەکاردێت کــە توانــای گوتــە و کــردەوە و چۆنیەتی پیادە کردنیان هەیە».[218] لە عەقلانیەتی ئامرازی دا، جیهانی بابەتی نەك هەر شــتە فیزیکی و ئەو رووداوانەی بەشێوەیەکی سروشتی روودەدەن لەخۆدەگرێت، بــەڵکو مەبەســت ، ستراتیژ ، بڕیار و سەرجەم تاکەکانی تریش- دەگرێتەوە کە بکەر وەك "شــت " پەیوەنــدییان پێوە دەکات . واتە تەنیا بەهۆی کاریگەرییان لەسەر سەرکەوتن یان ســەرنەکەوتنی بکــەر لــە بەرێوەبردنی دۆخەکان دا حسێبیان بۆ دەکرێت.[219] « عەقلانیەتی مەعریفی- ئامرازی یان لــە پێوەرە پراگماتیە تایبەتیەکانی سەرکەوتن دا خۆی دەنوێنێ، یان لە چۆنیەتی کۆنترۆل کردنــی تەکنیکەکانی دۆخێکی دیاریکراو، کەواتە ئەم شێوازە، گەڕان بەدوای کەرەستەی بــەدیهێنانی عەقلانیەتی واقعی بەرجەستە دەکات».[220] واتە بە پێی حساباتێکی عەقلانی هەوڵ دەدرێــت بۆ ئەوەی ئامرازی گونجاو بۆ گەیشتن بە ئامانجەکە هەڵبــژێردرێت، بــەلآم ئاســتی پەیوەنــدی و رادەی کاریگەری لەسەر لێك تێگەیشتن و پەیوەندی نێوان ئامراز و ئامــانج و بەرەنجامــەکانی لێك نادرێتەوە.

### ب- عەقلانیەتی نۆرماتیڤ و تەعبیری:

بێگومان ڕادەربڕین بــەپێ بەڵگــە و کــردەوەی کــارا نیشــانەی عەقلانیەتــە، ئێمــە ئــەو ئەکتەرانەی وەك قسەکەرو بکەر دەردەکەون بە عاقڵ وەسف دەکەین کە تا ئەو شوێنەی بۆیــان دەلوێت، لە پەیوەندی لەگەڵ فاکت و لە پەیوەندی لەگەڵ ئامانج_ئــامرازدا خۆیــان لــە هەڵــە بەدوور دەگرن، بەلاَم بێگومان جۆری تری تەعبیرمان هەیە کە بەڵگەی باشمــان بۆیــان هەیــە ، هەرچەندە پەیوەندیان بە بانگەشەی ڕاستگۆیی(ادعاء الصدق) یان سەرکەوتنەوە نیە.[221] ئەمە سەبارەت بەو بکەرانە ڕاستە کە دەتوانن لە نێو جیهانی بابەتی دا و بە پشت بەستن بە زمانی هاوبەش و لە پەیوەندی لەگەڵ ئەوانیتردا لە رێگەی بەڵگەو بەپشت بەستن و پەیڕەوی کردن لــە نۆرمەکان راستی گوتە یان کردەوەکەی بسەلمێنێ.

---

٢١٨. د.عطیات ابو السعود، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٢٠.

٢١٩. استیون وایت ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٨.

٢٢٠. د. عمر مهیبل، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٣٦١.

٢٢١. یورگن هابرماس ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٩- ٧٠. - Jurgen Habermas ,op. Cit.,p. 15.

هابرماس دەڵێت بەلاّم ئێمە تەنانەت کاری ئەو کەسانەش کە ئارەزوو یان نیەتێکیش ئاشکرا دەکەن، هەست یان حاڵەتێك دەردەبڕن و نهێنیەك بە کەسێك دەڵێن و دان بە کارێك دادەنێن و شتی لەم جۆرە و پاشان دەتوانن بە وەرگرتنی دەرەنجامی کرداری و ئەنجامدانی رەفتار گونجاو لەگەڵیدا وەلاّمی ڕازیکەر بە ڕەخنەگرەکانی بداتەوە، ئەوا ئەو کەسانەش بە عەقلاّنی لەقەڵەم دەدەین.[٢٢٢]

لێرەش دا ئەگەرچی ئەم جۆرە لە کردەوە پەیوەستە بە جیهانی خودی و زەینی بکەرەوە بەلاّم لە دوو ئاست دا لە یەکتر جیا دەکرێتەوە کە یەکیان بە هۆی ئاستی بەرزی داهێنان کە لە بواری ئیستاتیکی کاری هونەری دا خۆی دەردەخات بەهایەکی بەرزی هەیە و هەندێکیشیان وەك نەخۆشی تایبەتی دەردەکەون. لەم مۆدیلە دا بکەر نەك هەر پەیوەندی لەگەڵ شتەکان بەڵکو لەگەڵ جیهانی کۆمەلاّیەتیش دا هەیە. « جیهانی کۆمەلاّیەتی زەمینەی ئەو نۆرمانە لەخۆدەگرێت کە ئەمە دیار دەکەن کام کردەوە لە بەرانبەر هیکەلی پەیوەندی نێوان تاکی *interindividual* دەشێ پاساویان بۆ بهێنرێتەوە. تا ئەو کاتە کە بکەرەکان لەم زەمینەیە دا شەریك بن، لە جیهانی کۆمەلاّیەتیش دا شەریك دەبن».[٢٢٣] عەقلاّنیەتی نێو ئەم کردارانە لەم ڕاستیەدا دەبینرێت کە دەبێ ڕێککەوتنێکی بەرهەم هاتوو بە شێوازی پەیوەندیکارانە دواجار لەسەر بنەمای بەڵگە بەدەست بێت . «عەقلاّنیەتی ئەو کەسانەی کە لەم جۆرە کردارە پەیوەندیکارانەیەدا بەشدارن پشت بەوە دەبەستێ کە ئایا لە کاتی پێویست دا، دەتوانن لە ڕەوشێکی گونجاودابەڵگە بۆ تەعبیرێك بخەنە ڕوو.»[٢٢٤] بەمانایەکی تر کردەی عەقلاّنی لە میانی زمان و تەعبیر و بانگەشەی دروستی (الصلاحیة) جا چ پەیوەندی بە شتەکانەوە هەبێت یان بە نۆرمەکان بۆ پشت پێ بەستن و خستنە ڕوو هەمیشە پێویستی بە پرۆسسی ئەرگۆمێنت خوازی هەیە لە نێو کردەی پەیوەندیکاری دا وەك کردەوەیەك کە دەتوانێ داکۆکی لە بانگەشەکانی خۆی بکات و وەلاّمی هەموو شێوازەکانی ڕەخنە بداتەوە کە ڕەنگە ئاراستەی بکرێن[٢٢٥] .

---

٢٢٢. هەمان سەرچاوە ،ل٧٠.  -Ibid.,p. 15.

٢٢٣. استیون وایت ،سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٨.

٢٢٤. یورگن هابرماس ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٧٢-٧٣ - Jurgen Habermas ,op. Cit.,p.17.

٢٢٥. محمد نورالدین افایە ، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٤٥.

هەر کەسێك کە لە ئەرگۆمێنت خوازیە (المحاججه) دا بەشداری دەکـات عـەقلانیـەت یـان کەمی عـەقلانیەتەکەی لەو شێوازە دەردەکەوێت کە لەمەڕ خستنە ڕووی بەڵگـەی رازی بـوون یان دژایەتی کردنی بانگەشەیەك پێشانی دەدات. ئەگەر ئەو لایـەنێکی "قبووڵکـاری بەڵگـە خوازی" بێت یان بەڵگەکان قبووڵ دەکات یان هەوڵ دەدات وەڵامیـان بداتـەوە و لـە هـەردوو حاڵەتەکەدا بە شێوازێکی "لۆژیکی" مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات. لەبەرانبەردا، ئەگەر" لەمەڕ بەڵگەکان گوێی دابخات" یان لەوانەیە ئەو بەڵگانە لەبەرچاو نەگرێت کە پێچەوانەی بۆچـوونی ئەون یان ئەگەر وەڵامێکی دۆگمایان بداتەوە ئـەوا لـە هـەردوو حاڵەتەکـەدا ئـەم کەسـە بـە شێوازێکی ناعەقلانی لەتەك پرسەکان دا هەڵسووکەوتی کردووە[٢٢٦].

کەواتە هەم چۆنەیتی چوونە ناو دیالۆگ و هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەویتر و هەم هەوڵـدان بـە شێوەی بەڵگەخوازی و بەپشت بەسـتن بـە بانگەشـەی دروسـتی و ڕازی کردنـی بەرانبـەر لـە گفتوگۆیەکی کراوەدا نیشانەی عەقلانی بـوونی ئـەو کەسـە پێشـان دەدەن و بـە پێچـەوانەوە نەچوونە ناو پرۆسسی ئەرگۆمێنت خوازی و لەبەرچاو نەگرتنی بەرانبەرلە ژێر هـەر بیانویـەك بێت بە کارێکی ناعـەقلانی لەقەلەم دەدرێت، لێـرەدا دەردەکـەوێت کـە هابرمـاس پشـت بـە ڕوانگەیەکی ئیجرائی دەبەستێ سەبارەت بە عـەقلانیەت، واتە عـەقلانیەت و ناعـەقلانیەت لـە نـاو پرۆسسـی سیاسـی وکۆمەلایـەتی و لـە چوارچـێوەی تێگەیشـتن و تێگەیانـدن دا خـۆی دەردەخات، نەك لەبەر ئەوەی لە خودی خۆیدا خاوەن ماهییەتێکی نـەگۆڕ بێـت. بەبۆچـوونی هابرماس «چەمکی "بەڵگە *grounding*" پەیوەندییەکی ناوەکی لەگەڵ چەمکی " فێربوون *learning*" دا هەیە».[٢٢٧] هەر بۆیە پێیوایە ئەو کەسەی خۆی لەمەڕ خۆیەوە بە شـێوەیەکی سیستماتیك هەڵبخەڵەتێنێ ئەوا کارێکی ناعەقلانی کردووە، بەلاّم ئەو کەسەی ئامادەیـە دان بە کارە ناعەقلانیەکانی خۆی دا بنێت ئەوا نەك هەر خودان عـەقلانیەتی بکـەرێکی ناسـکارە کـە سـەلاّحیاتی حوکمـدانی هەیـە لەسـەر واقیـع، بـەڵکو کەسـێکە کـە بـە شـێوازێکی عـەقلانی_ئامانجدار دەجوولێتەوە، کەسێکە کە لـە ڕووی ئەخلاقییـەوە عـەقلانی و لـە ڕووی کردەییەوە جێگەی متمانەیە، کەسێکە کە بە تیژبینیەوە پرۆسەکان هەڵدەسەنگێنێ و لە ڕووی ئیستاتیکەوە خاوەن زەینێکی کراوەیە، «سەرەڕای ئەمانە خاوەن ئەم توانستەیە کە دەتوانێـت

---

٢٢٦. یورگن هابرماس ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٧٣.   Ibid.,p.18-

٢٢٧. هەمان سەرچاوە ، ل ٧٤ .   Ibid.,p.18-

سەبارەت بە زهنیەتی خۆی بە شێوەیەکی تەئەمولی *Reflexive* بجولێتەوە و ئەو ئاستەنگە ناعەقلانیانە دەست نیشان بکات کە کاریگەری لەسەر تەعبیرە ئەخلاقی و ئیستاتیکیەکان دادەنێت».[٢٢٨]

## ج- عەقلانیەتی پەیوەندیکاری و تیۆری ئەرگۆمێنت خوازی

بەم جۆرە بۆ دارشتنی مۆدێلێکی دیموکراتیانەی عەقلانیەت کە پشت بە فەلسەفەی نێوانخودی ببەستێت و بۆ دەرچوون لە عەقلانیەتی تەکنیکی و ئامانجدار مۆدێلی عەقلانیەتی پەیوەندیکاری دەخاتەڕوو و ئەمە « لە لایەکەوە تەجاوزی ئەو عەقڵە دەکات کە بە دەوری خۆیدا چەقیبەستووە و لە لایەکی تریشەوە ئەو عەقڵە گشتگیر و داخراوەی کە بانگەشەی ئەوە دەکات هەموو شتێ لە خۆدەگرێت».[٢٢٩] هەر بۆیە ئەمە پەیوەست دەکات بە پرۆسسی ئەرگۆمێنت خوازی لای تاکەکان و دەڵێت: « چەمکی عەقلانیەت کە من بە شێوازێکی حەدسی خستوومەتە ڕوو پەیوەستە بە سیستەمێك لە بانگەشەی دروستی و دەبێ لە ڕێگوزەری تیۆری ئەرگۆمێنت خوازیەوە رۆشن بکرێتەوە».[٢٣٠] تیۆری ئەرگۆمێنت خوازی گرنگیەکی تایبەتی هەیە، ئەگەر نەڵێین شتێکی میحوەرییە، چونکە ئەرکەکەی لەبنەڕت دا بەدەوری بنیاتنانەوەی ئەو گریمانە و مەرجە پراگماتی و شکلیانە دا دەسورێتەوە کە پەیوەستن بە رەفتاری دیاردەیەکی دیاری کراو.[٢٣١] بە رای هابرماس لە ئەرگۆمێنت خوازی دا هەوڵ بۆ ئەوە دەدرێت شتێك کە لە ڕوانگەی دەستەجەمعیەوە جێگەی مشتومڕە بۆ شتێ بگۆڕدرێت کە لە روانگەی دەستەجەمعیەوە دروستە. دەتوانین لە گوتاری ئەرگۆمێنت خوازی دا سێ رەهەند یان سێ لایەن لە یەکتر جیا بکەینەوە. ***یەکەم***، لە ئاخاوتنی ئەرگۆمێنت خوازی دا ئێمە وەك پرۆسسێك بە ناچار لەگەڵ جۆرێك لە پەیوەندی سەروکارمان هەیە. تەنیا تا ئەو شوێنە دەتوانین حوکمێك بە عەقلانی لەقەڵەم بدەین کە قسەکەر مەرجی پێویست بۆ گەیشتن بە ئامانجی پەیوەندیکارانەی بەدەست هێنانی ڕێککەوتن لانیکەم لەگەڵ بەشداربوویەکی تردا

٢٢٨. هەمان سەرچاوە ، ل ٧٧. -Ibid., p.21.

٢٢٩. ابوالنورحمدي، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣٥.

٢٣٠. هەمان سەرچاوە ، ل ٧٩. - Jurgen Habermas ,op. Cit.,p.22.

٢٣١. د. عمر مهيبل ، من النسق الى الذات، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٤٩.

سەبارەت بە شتێك دەستەبەر بكات. بەشدارانی ناو ئەرگۆمێنت خوازیـەك ناچـارن بـە شـێوەیەكی گشتی وەك پێش گریمانە سەیری ئەمە بكەن كە بونیادی پەیوەندییەكەیان بە هۆی هەنـدێ سـیماوە كە تەنیا فۆرمالین دەشێ شی بكرێنەوە و هەموو هێز و تووندوتیژییـەك لـە پانتـایی كارەكـە دوور دەخاتەوە_ جا چ ئەم هێزە لە هەناوی پرۆسسی بەدەستهێنانی رێككەوتن سەرچـاوەی گـرتبێ یـان لەدەرەوە كاریگەری لەسەر دانابێت، جگە لە هێزی باشترین بەڵگە خوازی (و ئەمە بەمانای بـەلاوە نانی هەموو هاندەرێكە جگە لە هاوكـاریكردن لـە پێنـاو حەقیقـەت دا) لـەم ڕوانگەیـەوەدەتوانین ئەرگۆمێنت خوازیوەك بەردەوام تاملی كردەی ئاراستەكراو بەرەو بەدەسـت هێنـانی كـۆدەنگی بـە كەرەستەی جیاوازەوەسەیر بكەین[232]. ***دووەم***، كاتێ وەك كارنامەیەك سەیری ئەرگۆمێنت خوازییەك دەكەین بەناچار سەروكارمان لەگەڵ قالبێك لە كارلێك *interaction* دا هەیە كە پاشكۆی ڕێسـای تایبەتە، پرۆسسی گەیشتن بە كۆدەنگی بە شێوەی دابەشكردنی كـاری هاوكارانـە لـە نێـوان یـار و نەیارەكان دا. ***سێیەم***، سەرەنجام ئامانج لە ئەرگۆمێنت خوازی بریتیە لـە خسـتنە ڕووی بەڵگـەی بەهێز كە لە ڕووی تایبەتمەندی ناوەكی خۆی ڕازیكەر بێت و بەهۆیەوە دەشـێ بانگەشـەی دروسـتی پشت ڕاست یـان ڕەد بكرێتـەوە.[233] بـەم جـۆرە عەقلانیـەتی پەیوەنـدیكاری بریتیـە لـە شـرۆڤ و بنیاتنانەوەی چەمكی نائامرازی عەقڵ و شیكردنەوەی ئەو ئاراستە و دەزگایانەی كە لە كۆمەڵگای هاوچەرخ دەربڕی عەقلانیەتی سـتراتیژین لـە پێنـاو گەشـەدان بـە دەزگـا دیموكراتیـەكان و سـوود وەرگرتن لە میكانیزمی بڕیاری جـەماعی.[234] كەواتـە دواجـار ئـەم فۆرمانـەی عەقلانیـەت لـەم پانتاییانەی خوارەوە دەردەكەون: عەقلانیەتی مـەعریفی –ئـامرازی لـە زانسـت دا، عەقلانیـەتی نۆرماتیڤ-تەعبیری لە ئەخلاق و عەقلانیەتی نمایشی لە هونەر دا.[235] و عەقلانیەتی پەیوەندیكاری لە جیهانی ژین دا، چونكە ئەم جۆرە عەقلانیەتە عەقلانیەتی هەڵبژاردنیشە، ئەمـەش بـە دەسـت نیشان كردنی دروسترین وتە یان كردەوە لەناو كۆی ئەلتەرناتیڤە جیاوازەكان دا. هـەموو ئەمانـەش پەیوەستە بە بوارێكی هاوبەش كە دەسپێكەكەی لانیكەمی لەیـەك گەیشـتنی تێـدا بێـت و هـیچ لایەنیك هەوڵ نەدات هێز و زەبروزەنگ بەكار بێنێت و تەنیا باشترین بەڵگە حوكم بكات.

---

٢٣٢. یورگن هابرماس، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٨١-٨٢. -Ibid.,p.25.

٢٣٣ .هەمان سەرچاوە، ل ٨٢.-Ibid.,p.25.

٢٣٤. شاهروخ حقیقی، سەرچاوەی پێشوو،ل ٢٨.

٢٣٥. رابرت هولاب، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٨٤.

## تەوەری دووەم: مۆدێلەکانی کردەوە

بەڕای هابرماس لەسەردەمی ئەرستۆوە کردەی ئامانجدار لە ناوەنـدی تیـۆری فەلسـەفی کـردەوەدا جێگای گرتووە.بنەمای ئـەم چـەمکەی کـردەوە هەوڵـدانی بکەرێکـە بـۆ گەیشـتن بـەئامانجێك یـان رەخساندنی حالەتێکی گونجاوە بە سوود وەرگرتن لە ئامرازێك کە لە ڕەوشـێکی دیـاریکراودا کارایـە. چەمکی ناوەندی و سەرەکی لەم جۆرە تێگەیشتنە دا بریتیە لە بڕیار، واتـە هەڵبـژاردنی رێرەوێـك لـە نێـوان رێـڕوە جیاوازەکـان دا بـە وەبەرچـاوگرتنی سـازگارییەکەی بـۆ بـەدیهێنانی ئامانجـە دیـاری کراوەکە.[٢٣٦] هابرماس هەوڵدەدات چوار جۆر کردەوە لە یەکتری جیا بکاتەوە کە بـریتین لـە : کـردەی ئامانجدار (الفعل الغائی) کردەی رێکخستنی نورماتیڤ و کردەی نمایشی (دراماتیـك) *dramatic* و کـردەی پەیونـدیکاری *communicative action* کـە هـەر کامێکیـان لـە لایـەن بیرمەنـدێکی دیاریکراوەوە ئیشی لەسەر کراو( وەك مید و پارسۆنز و...). هەروەك پێشتر ئاماژەمان پێکـرا کـردەی ئەمانجدار پەیوەستە بە دیاریکردنی ئامرازی عـەقلانی بۆ وەدەست هێنـانی مەبەسـتێکی دیـاریکراو، بەلاّم ئەگەر لانی کەم ئەکتەرێکی تری ئامانجدار لە سەرکەوتن یان شکست دا هاتـە نێـو کردەوەکـە، ئەوا لەم حاڵەتـەدا مـۆدێلی کـردەی ئەنجامـدار دەگۆرێـت بـۆ مـۆدێلی کـردەی سـتراتیژی. کـردەی رێکخستنی نۆرماتیڤ لە بنەڕەتدا پەیوەست نییە بە بکەری تاك وتـەراوە کـە لـە ژینگـەی خۆیانـدا لەگەڵ بکەری تردا سەروکاریان هەیە بەڵکو پەیوەندی بە ئەندامانی گروپێکی کۆمەلاّیەتیەوە هەیە کـە کردەوەکانی خۆیان بەرەو بەهایەکی دیاریکراو ئاراستە دەکەن و بەیەکەوە ڕێز لە نۆرمـە گشـتییەکان* دەگرن و هەندێك کردە ئەنجام دەدەن و هەندێکی تر ئەنجام نادەن، بەلاّم کـردەی نمایشـی (درامـاتیکی) نە ئاماژەیە بۆ بکەرێکی تاك وتـەرا و نـە ئەنـدامی گروپێکـی کۆمەلاّیـەتی بـەڵکو پەیوەسـتە بـە بکەرێکەوە کە ئامادەیە بۆ کارلێکی دوو بکەر یان زیاتر کە لە ڕێگای توانستی ئاخاوتن یان کـردارەوە دەتوانن پەیوەندیەکی نێوان کەسـایەتی *Interpersonality* یـان نێـوان خـودی لـە نێـوان خۆیانـدا دروست بکەن و دواجار کردەی پەیوەندیکاری دێت کە بە ئاراستەی لێك تێگەیشتن دەڕواتەپێش.

---

٢٣٦. یورگن هابرماس ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٥٥. -Ibid.,p.85.

* نۆرمەکان ( المعاییر) دەربڕی ئەو رێککەوتنەیە کە لە گروپێکی کۆمەلاّیەتی دا هاتۆتە ئاراوە. (هەمان سەرچاوە، ل ١٥٦. Ibid.,p.85.)

### ١- كردەی ئامانجدار: Purposive Action

عەقڵانیەتی کردەی ئامانجدار لە ڕاستیدا کردەیەکە مەبەست لێی گەیشتن بە ئامانجە و زۆربەی کاتەکان ئەم کارە لە ڕێگای هەڵبژاردنی ئامرازی گونجاو بە ئەنجام دەگات. هابرماس لە پێناسەیەکی تری خۆیدا سەبارەت بە کردەی ئامرازی یان ئامانجدار بەم جۆرە ئاماژەی بۆ دەکات کردەی ئامرازی و دەڵێت:

**کردەی ئامرازیی پاشکۆی ئەو ڕێسا تەکنیکیانەیە کە لەسەر بنەمای مەعریفەی ئەزموونی دامەزراوە و ئەم ڕێسایانەش لە هەردوو حاڵەتەکەدا پێشبینی مەرجدار سەبارەت بە ڕووداوە بۆ بینین شیاوەکان لەخۆ دەگرن...کردەی ئامرازی ڕێکخەری ئەو ئامراز و کەرستانەیە کە بە پێی پێوەری کۆنترۆڵی کاریگەری واقعییەت ڕەنگە گونجاو بن یان نا.**[٢٣٧]

هابرماس پێیوایە کە کردەی ئامانجدار پێش گریمانەی پەیوەندی نێوان بکەرێك و جیهانی فاکتەکان لە خۆدەگرێت، ئەم جیهانە بابەتیە وەك هەمەکییەتی ئەو بوارانە پێناسە دەکرێت کە بە هۆی دەست تێوەردانی مەبەستدار دەتوانرێت بە دەست بهێنرێت یان دروست بکرێت.[٢٣٨] لەم کردەیە پێویستە هەڵبژاردن و حسێب کردنی کەرەستە و ئامانجەکانی لەو ڕووەوە بێت کە زۆرترین قازانج دەستەبەر بکات.[٢٣٩] بەڵام هەر لە کردەی ئامانجدار دا ئەگەر هاتوو زیاتر لە بکەرێك لە سەر ئەنجامێکی دیاریکراو بۆ مەبەستێك هەوڵی وەدەست هێنانی سەرکەوتنیان دا ئەوا لەم حاڵەتەدا کردەی ئامانجدار دەگۆڕێت بۆ (کردەی ستراتیژی - *Strategic Action*). مۆدێلی کردەی ئامانجدار دەگۆڕێت بۆ مۆدێلی کردەی ستراتیژی ، کاتێ بکەرێك لانیکەم-بە پێی حساباتی بردنەوە و دۆڕاندن — بڕیارەکانی ئەکتەرێکی دیکە وەبەرچاو بگرێت کە لەپێناو ئامانجێکی دیاریکراو دا کار دەکەن. ئەم مۆدێلەی کردەوە ڕۆربەی کاتەکان راڤەیەکی قازانجگەرایانەی بۆ دەکرێت.[٢٤٠]

---

٢٣٧. یورگن هابرماس ، علم وتکنولوژی در مقام ایدولوژی ، ت: علی مرتچویان، مجله ارغنون ، شماره ١، بهار ١٣٧٣(١٩٩٤)، ل٧٠.

٢٣٨. یورگن هابرماس ، نظریەی کنش ارتباطی ،هەمان سەرچاوە ، ل ١٥٨. - Jurgen Habermas .,op. Cit.,p.87

٢٣٩. د.عطیات ابو السعود، ل ٣٢٦.

٢٤٠. د. عمر مهیبل ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٥٤.

هەروەك ئاماژەی بۆكرا لە كردەی ستراتیژی دا ئێمە لانیكـەم دوو بكـەرمان هەیـە كـە بـە دوای مەبەستێك دا دەگەڕێین كە ئامانجەكانی خۆیان لە ڕێگای ئاڕاستە بڕی لـە هەمبـەر بكـەرەكانی تـر و بەمەبەستی دروستكردنی كاریگەری لەسەریان بەرەو پـێش دەبـەن.[٢٤١] مانـای ناڕاسـتەوخۆی وتـەی هابرماس ئەوەیە كە لە كردەی ستراتیژیدا بكەر تەنیا بە ئاڕاستەی گەیشتن بە ئامانجەكەی بەرەو پـێش دەچێت و هەر بۆیە هەموو كەرەستەیەك بەكار دەهێنێت لە پێناو ئەم مەبەستەدا، هابرمـاس پێیوایـە سەركەوتن لەم كردەیـەدا پەیوەسـتە بـە سـەرجەم بكەرەكانـەوە كـە هـەر یـەكێكیان بـە ئاڕاسـتەی سەركەوتنی خۆی هەوڵدەدات تەنیا بەو ڕادەیە هاوكـاری یـەكتر دەكـەن كـە لەگـەڵ حیسـاباتی خـۆ پەرستانەی خۆیان سەبارەت بە سوودمەندی دا بگونجێت.[٢٤٢] لە بەر ئەوەی پەیوەندی نێـوان بكـەرەكان لە پێناو ئامانجدا ڕێكناخرێت تەنیا لە میانی ئـاڵوویر و دەسـەڵات نـەبێت ،هەربۆیـە كۆمـەڵگا وەك سیستەمێكی ئامرازی دەردەكەوێت، واتە ئـەم سیسـتەمە ڕێنماییـە كرداریـیـەكانی گفتوگـۆ كـورت دەكاتەوە بۆ پارە ولە پێناو دەسەلآت دا بەكاری دەهێنێت و بەپشت بەستن بە پەیوەندی تایبـەتی بـازاڕ و كۆنترۆڵ، بڕیارەكان هەماهەنگ دەكات.[٢٤٣] كەواتـە لـەم سیسـتەمە دا و لـە كـردەی ئامانجـدار و ستراتیژی دا پارە و دەسەلآت وەك ئامانجی بالآ سەیر دەكرێن و تاكـەكانی كۆمـەڵگا وەك ئـامراز لـە پێناو ئەم مەبەستانە دەخرێنە گەڕ وئیدی وەك خودێكی ئۆتۆنۆم سەیریان ناكرێت كـە خـاوەن ئاگـایی وئیرادەن.

## ٢- كردەی ڕێكخستنی نۆرماتیڤ: Normatively Regulated Action

بە پێچەوانەی كردەی ئامانجدار، كردەی ڕێكخستنی نۆرمـاتیڤ پەیوەنـدی نێـوان بكـەرێك و دوو جیهان لە خۆدەگرێت سەرەڕای جیهانی بابەتی فاكتەكان، جیهانێكی كۆمەلآیەتیش بـوونی هەیـە كـە بكەرەكان وەك ڕۆڵگێڕ پەیوەستن پێیەوە، هـەروەها ئەكتـەرەكانی تـریش كـە بەشـدارن لـە كـارلێكی كۆمەلآیەتییەكان دا سەربەم جیهانەن، «هەموو ئەو بكەرانـەی سـەر بەیـەك جیهـانن كـە نـۆرمێكی هاوشێوە بۆ هەموویان ڕەوایەتی هەیـە و وەك نـۆرمی دروسـت قبوڵیـان كـردووە».[٢٤٤] ئـەم مۆدێلـە

---

٢٤١. یورگن هابرماس ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٥٨ .Ibid.,p87.

٢٤٢. د.منصور انصاری ،سەرچاوەی پێشوو ، ل ٣٠١.

٢٤٣. محمد نورالدین افایە، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٨٧.

٢٤٤. یورگن هابرماس ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٥٩. - Jurgen Habermas ,op. Cit.,p.88.

ئاماژە نییە بۆ ڕەفتاری تاکە گۆشەگیر و دوورە پەرێزەکان کە بە شێوەی ڕێکەوت لە ژینگەی خۆیاندا بە تاکەکانی تر دەگەن، بەڵکو ئاماژەیە بۆ ڕەفتاری ئەندامانی گروپێکی کۆمەلآیەتی کردەوەکانی خۆیان بەرەو بەهایەکی هاوبەش ئاڕاستە دەکەن . بکەر بە پێی نۆرمە دیاریکراوەکان دەجولێتەوە و هەموو ئەندامانی ئەو گروپەی بڕوایان بە دروستی نۆرمە دیاریکراوەکان هەیە ، چاوەڕوانی ئەوەیان لێ دەکرێت کە کردەوە خوازراوەکان ئەنجامبدەن یان خۆیان لە هەندێ کردار ببوێرن کاتێك هەلوێستێکی دیاریکراو حوکمی کرد.[٢٤٥] هابرماس پێیوایە کاتێك نۆرمێك بە شێوەیەکی ئایدیالی دروستی خۆی سەلماند ئەوا مانای وایە کە شایستەی ڕەزامەندی هەموو ئەو کەسانەیە کە دەکەونە ژێر کاریگەریەکەیەوە چونکە ئەم نۆرمە پرسەکانی کردوە لە پێناو سوودی هاوبەش ڕێکدەخات. لەم کردەوەیە دا بکەرەکان بەشێوازێکی عەقلانی ئامرازەکان (بۆگەیشتن بە ئامانجێك) لەگەلّ یەکتری دا هەڵدەسەنگێنن، واتە کام ئامراز یان کەرەستە بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکە باشترە.[٢٤٦] بەلاّم ئیشیان بە خودی ئامانجەکە نییە و ئامانجەکە بەشێوەیەکی بێ ئەملاوئەولا پەسند و قبولّ کراوە لە لایەن هەمووانەوە، گومانیان لێی نییە و وەك ئامانجێکی بەلگەنەویست و ئیلزامی و بنبڕ و رەها قبولّیانە.

### ٣- کردەی نمایشی(درامی) : Dramaturgical Action

لەڕوانگەی کردەی نمایشەوە، ئێمە کردەی کومەلاّیەتی وەك ڕوبەڕوبوونەوەیەك دەرك دەکەین کە تێیدا بەشدارەکان دەبن بە گوێگری یەکتری و کردەی درامی بۆ یەکتری ئەنجام دەدەن. بەڕای هابرماس چەمکەکانی (ڕووبەروو)و (نمایش) لێرەدا چەمکی سەرەکین. نمایشی گروپێك لە بەرامبەر کەسی سێیەمدا حالّەتێکی تایبەتە. نمایش ئەو دەرفەتە بە بکەر دەدات کە بە شێوەیەکی دیاریکراو خۆی بۆ گوێگرەکان بخاتە ڕوو، ئەو لە زەینیەتی خۆیدا حەزدەکات لە لایەن گوێگرێکەوە بە شێوەیەکی تایبەتی ببینرێت.[٢٤٧] لێرەدا عەقلانیەت بەپێی "ڕاستگۆیی" یان "دووڕوویی" تاکەکەسەکە لەهەمبەر تاکەکانی دیکە دا هەڵسەنگاندنی بۆ دەکرێت....واتە ئایە ئەو هەستو سۆز و نیازانەی کە دەردەبڕدرێن هەمان ئەو سۆز و نیازانەن کە بەڕاستی تاکەکە هەیەتی[٢٤٨].

---

٢٤٥. د.عطیات ابو السعود ، سەرچاوەی پێشوو،ل ١٠٧.

٢٤٦. حسینعلی نوزری ، بازخوانی هابرماس، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٥١.

٢٤٧. یورگن هابرماس ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٦٢. -Ibid.,p.90.

٢٤٨. استیون وایت ،سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٢.

چەمکی کردەی درامی بە پلەی یەکەم ئاماژە نییە بۆ بکەرێکی تاك یان ئەندامێك لە گروپێکی کۆمەلاَیەتی دا، بەلَکو ئاماژەیە بۆ کردەیەکی هاوبەش کە لە بەرامبەر جەماوەر دا خۆیان نمایش بکەن، بکەر لێرەدا وێنە یان هەستێکی دیاریکراو لای جەماوەر دەوروژێنێ و ئەمەش بە کەشفکردنی بە ئەنقەست یان نائەنقەست خودییەتی (الذاتية) خۆی. لە کردەی درامی دا بەشداربووان ئەم دەرفەتە دەقۆزنەوە بۆ ئەوەی لە ڕێگای کردەوە هاوبەشەکەیان جیهانی خودی خۆیان بناسێنن.[٢٤٩]

لە کردەی نمایشدا بکەر ناچارە بۆ خستنەڕووی خۆی پەیوەندی بە جیهانی خودی (الذاتي) خۆیەوە بکات. هابرماس ئەم جیهانە وەك هەمەکیەتی ئەزموونی خودی (زینی) پێناسە دەکات کە بکەر بۆ دەست پێڕاگەیشتن پێی بە بەراورد لەگەلَ ئەوانی تردا خاوەن پێگەیەکی تایبەتیە. هابرماس دەلَێت «بێگومان کاتێك پانتایی زەینیەت شایانی ئەوەیە وەك جیهان حسێبی بۆ بکرێت کە بتوانین گرنگی دونیایی خودی بە هەمان ئەو ڕێگایە ڕوون بکەینەوە کە لە گرنگی جیهانی کۆمەلاَیەتی دا ئاماژەمان بۆ کردن واتە بوونی نۆرمی هاوشێوە و بوونی فاکت لە جیهانی بابەتی دا».[٢٥٠] خالَی سەرەکی لێرەدا لە سەر ئەوە نیە کە تاك چۆن پەیڕەوی لە ستراتیژێك دەکات یان بەدوای کۆمەلێك نۆرم دا دەچێت، بەلَکو قسە لەسەر ئەوەیە کە ئەنجامدانی هەر کردەوەیەك چۆن هەندێ شت سەبارەت بە تاکایەتی (الفردانیة) بکەرەکە ئاشکرا دەکات.[٢٥١] بە شێوەیەکی ڕوونتر، لە ئەنجامی کردەوەکان، بکەر جیهانی تاکەکەسی خۆی بەشێوەیەکی تایبەت بۆ بینەر و سەرجەم بکەرەکانی دیکە نمایش دەکات و ئەمەش لە بەرهەمە هونەری و ستاتیکیەکان و هەندێجاریش لە تێکچوونی دەروونی دا دەردەکەوێت.

## ٤- کردەی پەیوەندیکاری: Communicative Action

هابرماس جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە هەر کاتێك کردەی ئەکتەرەکان نەك لە ڕێگای خۆپەرستانە و لە پێناو سەرکەوتن بەلَکو لەڕێگای کرداری بەدەست هێنانی لێك تێگەیشتن هەماهەنگ بکرێت ئەوا باسی کردەی پەیوەندیکاری دەکەین. لە کردەی پەیوەندیکاری بەشدارەکان بە پلەی یەکەم بە ئاراستەی سەرکەوتنە تاکەکەسیەکانی خۆیان هەنگاو هەلَناهێنن بەلَکو بەدوای

---

٢٤٩. د.عطيات ابو السعود ، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٨ .

٢٥٠.یورگن هابرماس ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٦٣. -Ibid.,p.91.

٢٥١. استیون وایت ، سەرچاوەی پێشوو ،ل٩٠ .

شوناسی هاوبەش دا دەگەڕێن لە پێناو ڕێکخستنی ئامانجەکانیان دا هەر بۆیە پێیوایە تاکەکان لە ژێر سایەی هەلومەرجێك دا بە دوای ئامانجە تاکەکەسییەکانی خۆیانادا دەگەڕێن کە بتوانن نەخشەکانی کردەی خۆیان لە سەر بنەمای پێناسەی هاوبەش لەبارەی ڕەوشەکە هەماهەنگ بکەن، لەم ڕووەوە دانوسان سەبارەت بە پێناسەی بارودۆخ و ڕەوشەکان توخمی سەرەکی ئیشی تەئویلی پێك دەهێنێت کە بۆ کردەی کۆمەلایەتی پێویستە.[252]

لێرەوە دەردەکەوێت کە کردەی پەیوەندیکاری لانیکەم ئاماژەیە بۆ هەڵسوکەوتی دوو ئەکتەر کە توانای قسە کردنیان هەیە ... و پەیوەندی تاکە کەسی دروست دەکەن ... بکەرەکان لە هەوڵی دەرك کردنی ڕەوشی کردەوە و نەخشەی کردەوەکانی خۆیان دان، بۆ ئەوەی کارەکانیان لە سەربنەمای کۆدەنگی هەمامەنگ بکەن.[253]

چەمکی کۆدەنگی کە لە فەلسەفەی سیاسی هابرماس دا بە چەمکێکی سەرەکی لەقەڵەم دەدرێت و بە داوا ئامانجی هەموو کردەیەکی عەقلانی و پەیوەندیکاری دادەنرێت، لە لایەن هەندێ لە بیرمەندەکانەوە دراوەتە بەر رەخنە. یەکێك لەو فەیلەسوفانە ژان فرانسوا لیوتار ، ئەو پێیوایە « کۆدەنگی تەنیا حالەتێکی تایبەتی گفتوگۆیە، نەك ئامانجی گفتوگۆ و بە پێچەوانەوە ئامانجەکەی هەڵەسازییە (مغالطة) » ئەگەر ئەمە پەیوەست بکرێت بە دادپەروەرییەوە کە یەکێك لە ئایدیا سەرەکییەکانی هابرماسە ئەوا لیوتار پێیوایە «کۆدەنگی فۆرمێکی بەهایی لەمۆدێل کەوتوو و گوماناوییە، بەلام دادپەروەری وەك بەهایەك نە لە مۆدێل کەوتوە ونە گوماناوییە، هەربۆیە دەبێ بگەین بە تیۆر و پراکتیکێك بۆ دادپەروەری کە پەیوەست نەبێت بە تیۆر و پراکتیکی کۆدەنگی».[254] بەلام هابرماس بە شێوەیەکی سەرەکی پرسی دادپەروەری تەنیا نا بەستێتەوە بە کۆدەنگی بەلکو دەبێ ئەمە لە ڕێکاری ئەخلاقی یونیڤێرسالێ دا بەدی بێت. دەبێ ئەم کردەوەیە لەسەر بنەمای لێك تێگەیشتنی نێوانخودی بەدەر لە هێز، واتە لەسەر بناغەی رادەی بەرفراوانبوونی پانتایی کردەوەیەك کە کۆدەنگی لە سەر دروست بووە و هاوکات بەهۆی بەستنی پەیوەندی لێك تێگەیشتنی

---

٢٥٢. یورگن هابرماس ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٣٩٠. -Ibid.,p285-286.

٢٥٣. مایکل لسناف، فیلسوفان سیاسی قرن بیستم ، ت: خشایار دیهیمی، نشر کوچك، تهران، ١٣٧١(١٩٩٢)، ل٤٤١ .

٢٥٤. ژان فرانسوا لیوتار، وضعیت پست مدرن — گزارشی دەربارە دانش ، ت: حسینعلی نوزری، گام نو ، چ٢، تهران، ١٣٨١( ٢٠٠٢)، ل ١٧٦.

بەدەرلــەفرتوفێڵ بپێورێــت.[255] هابرمــاس جــەخت لەســەر ئــەوە دەکاتەوەکــە بەدەســتهێنانی لێــك تێگەیشتن بریتییە لە پرۆسسی گەیشتن بە ڕێککــەوتن لــە نێــوان بکەرەکانــدا لــە ئاســتی قســەکەرو ئەنجامدەری کار دا.... پرۆسسی بەدەستهێنانی لێکتێگەیشــتن بــە ئاراســتەی ڕێککــەوتنێك دەڕواتــە پێش کە مەرجەکانی قبــوڵکردنی نــاوەڕۆکی گوتەیــەك لــە خۆدەگرێــت کــە هانــدەری عــەقڵانی لــە پشتیەوەیە. ئەو کۆدەنگیەی کە بە شێوازی پەیوەندیکاری بەدەست دێت بونیادێکی عــەقڵانی هەیــە، هیچ لە لایەنەکانی ناتوانن، چ بەشێوەی ئامرازی لە ڕێگای دەستێوەردانی ڕاستەوخۆ لــە بارودۆخــەکان و چ بە شێوەی ستراتیژی بە کاریگەری دانان لە سەر نەیارەکان بیسەپێنن.[256]

لە مۆدیلی پەیوەنــدیکاری دا بکــەرەکان وەك گەیەنــەری بــەتوانای هــەر ســێ جیهانی(بابــەتی و کۆمەڵایەتی و تاکەکەسی) لەیەك کات دا وێنــا دەکــرێن. ســەرەڕای ئەمــە، بکــەرەکان هەوڵــدەدەن پەیوەندی بەم سێ جیهانەوە بکەن و یەکێکیان وەك گونجاوترین مەوقعیــەتی تایبــەتی هەڵبــژێرن و بــۆ گەیشتن بە کۆدەنگی(اجماع) لەهەمبەر پێناسەیەکی هاوبەش.[257] بە رای هابرماس « دەشێت لــە ڕووی بابەتییەوە ڕێککەوتن لە ڕێگای هێزەوەبەدەست بهێنرێت، بەڵام ئــەوەی لــە ڕێگــای کاریگــەری دەرەکی یان بەکارهێنانی هێزەوە وەك ڕێککەوتن بە دەست دێــت، لــە ڕووی خودییــەوە بــە ڕککــەوتن ناژمێردرێت ».[258] بە بۆچوونی هابرماس تەنیا ئەو کردەوانەی کە لە ڕێگای زمانەوە ئــەنجام دەدرێــن یان هەموو بەشداربووەکان بە هۆی کردەوەکانیان تەنیا بە دوای مەبەستی پەیوەندیکارانەوە پلانە تاکــە کەسیەکانی خۆیان بە بێ هیچ کۆت و بەندێك لە سەر بنەمای ڕێککەوتن و کۆدەنگی بەدەستی دێــنن بە کردەی پەیوەندیکارانە لە قەڵــەم دەدرێــن و ئەمــەش مــۆدێلی ئایــدیالی هابرماســە بنچــینەیەکی فەلسەفی دیموکراتی بونیادی بۆ دامەزرانــدنی یاســا و دەزگاکــان و پرۆســسی سیاســی ســەبارەت بــە چارەنووسی هاووڵاتیان بنیــات دەنێــت. بــەڵام لای (لیوتــار) بنچــینەی کــۆدەنگی وەك پێوەرێــك بــۆ دروستی (الصلاحیة) بنچینەیەکی نەشیاوە، چــونکە خــاوەن دوو فورمۆلبەندییــە: یەکــەم، کــۆدەنگی ڕێککەوتنێکە لە نێوان مرۆڤەکان، بەمانای خودە ناسکار و زانیار و ئیرادە ئازادەکان کــە لــە ڕێگــای گفتوگۆ و دیالۆگەوە دێتەدی. دووەم، کۆدەنگی بە بەشی پێکهێنەری سیستەم لەقەڵــەم دەدرێــت، کــە

---

٢٥٥. رابرت هولاب ، سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٧ .

٢٥٦. یورگن هابرماس، سەرچاوەی پێشوول ٣٩١-٣٩٢. Jurgen Habermas ,op. Cit.,p.286-287.

٢٥٧. استیون وایت ، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٢.

٢٥٨. یورگن هابرماس ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٩٢. Ibid.,p. 287. -

لــە پێنــاو پاراســتن و چــاککردنی کــردەی جێبەجێکارانــەی سیســتەم خــەریکی بــەرێوەبردنی کاروبارەکانیانە.[259] واتە لێرەدا کۆدەنگی تەنیا وەك ئامرازێك بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی واقیعــی واتــە بەدەست هێنانی دەسەلاٚت و شەرعیەتی سیســتەم بــەکاردێت. لێرەدایــە چــەمکێکی ســەرەکی تــری سیستەمی فەلسەفی هابرماس دەردەکەوێت کە ئەویش جیهــانی ژیــن *World-life*ە کــە دەکەوێتــە بەرانبەر چەمکی سیستەم *System* و هابرماس ئاماژە بەوە دەکات کە کۆمەڵگا هاوکات لەم دووانــە پێك هاتووە.[260]

**جیهانی ژین ئەو شوێنەیە کە کــردەی پەیوەنــدیکاری تێــدا ئــەنجام دەدرێــت و بەبۆچوونی ئەو ئەمە لە پشت ئاگایی بەشدارەکان و لە گوتار دا دەمێنێتەوە... لــە هەموو کلتورێکی تایبەتی وەك بەڵگەنەویست سەیر دەکرێت و تاکە بەشدارەکان لە هەڵسوکەوتی پەیوەنــدیکاری و لــە هەوڵــەکانی خۆیــان بــۆ لێکدانــەوەی شــتەکان نموونەیەکی لێ هەڵدێنجن بۆ لێکدانەوەی رێککەوتنی خۆیان.**[261]

لە روانگەی ناوەکی جیهانی ژینەوە کۆمەڵگا وێڕای بوونی هەندێ پچڕان، وەك تۆڕێك لــەهاوکاری دەردەکەوێت کە لەسەر بنەما نێویەندی پەیوەنــدیکاری دامــەزراوە، واتــە ئــەوەی تاکــەکان یــەکانگیر دەکات تۆڕێکی پەیوەندیکارییە کە تەنیا لــە ژێــر ســایەی نەریتــە کلتورییــەکان دا گەشــە دەکــات و هەموو پرۆسسەکان لەســایەی  پرۆسســی ســۆلیدارێتی راڤــە دەکــرێن و ئەمــەش دەبێتــە هــۆی: ۱) ئۆتۆنۆمی بکەرەکان ۲) سەربەخۆیی کلتور ۳) رۆشنی پەیوەندییەکان.[262] بــەم جــۆرە لای هابرمــاس جیهانی ژین، جیهانی ئاگایی و کردەی پەیوەندیکارییە کە بونیادەکەی بریتیە لە زمــان و پەیوەنــدی و ئاگایی ئەخلاقی و لەسەر بنەمای بایەخدان بە ئازادی و رزگاری دامەزراوە، چونکە ئــازادی بنچــینەی ژیانی کۆمەلاٚیەتیە.[263] هەروەك ئاماژەمان بۆ کرد جیهانی ژیــن Life-World دەکەوێتــە بەرانبــەر

---

٢٥٩. ژان فرانسوا لیوتار، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٦٧.

٢٦٠ . یورگن هابرماس ، نظریەی کنش ارتباطی - جهان زیست و نظام ، جلد ٢، بەرگی ٢، ت: کمال، انتشارات موسسە ایران ، تهران ،١٣٨٤(٢٠٠٥)، ل ١٧٠.

٢٦١. یورگن هابرماس،  راه برون رفتنی از فلسفەی سوژە، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦١٢.

٢٦٢. یورگن هابرماس ، نظریەی کنش ارتباطی - جهان زیست و نظام ،  سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٠٨-

٢٦٣. جون لیشتە ، خمسون مفکراً اساسیاً معاصراً- من البنیویة الی مابعدالحداثیة ،ت: د. فاتن البستاني، المنظمة العربیة للترجمة، بیروت، ٢٠٠٨، ل ٣٧٩.

سیستەم کە بەبروای هابرماس شوێنی کردەی ئامرازی ئامانجدارە و توخمـە سـەرەکییەکانی بـرتین لـە دەسەلاّت و پارە و بۆتە هۆی لاوازکردنی کلتور. سیستەم « لەخۆیدا رێککارە کە فـەرمانی ناچـارەکی بەسەر ئاگایی ئەندامە یـەکگرتووەکانی دا دەسـەپێنێت». [٢٦٤] و پێیوایـە میکانیزمـەکانی سیسـتەم فۆرمەکانی یەکانگیری کۆمەلاّیەتی تەنانەت لەو پانتاییەش دا سـەرکوت دەکـات کـە سـۆلیدارێتی پشتی بە کۆدەنگی بەستووە و بەدیلی نییە، واتە لـەو شـوێنەی کـە بەرهـەم هێنانـەوەی سـیبولیکی جیهانی ژین لەئارادایە و لەم پانتاییە دا بە نێوەنـدکردنی جیهـانی ژیـن فـۆرمی "بـەکۆلۆنی کـراو" وەردەگرێت. [٢٦٥]

رەخنەگرانی هابرماس پێیانوایە عەقلاّنیەت و کردەی پەیوەندیکاری روانگەیەکی یۆتۆپیە و پشـت بەست بە کۆدەنگی لەمەڕ حەقیقەت راست نییە، چونکە دەشیٚ لە دەرەوەی رێککەوتن و کـۆدەنگیش حەقیقەت بوونی هەبێت و پاشان فەلسەفەی نێوانخـودی نـاتوانیٚ لـە چوارچـێوەی فەلسـەفەی خـودی دەربچێت، بەلاّم لە دیدی هابرماس حەقیقـەت وەك هەبوویـەکی رەهـای میتـافیزیکی جیـاوازە لـە پرۆسسی دروست کردنی حەقیقەت، کە پرۆژە فەلسەفیەکەی جـەخت لەسـەر دووەمیـان دەکاتـەوە و پێیوایە لەدووتوێی رێکاری دیموکراتی و لە میانی دیالۆگێکی بەردەوام و عەقلاّنی دەشێت بـە دەسـت بێت.

بەم جۆرە بەرای هابرماس بۆ ئەوەی تاکەکان وەك بکەری چالاك بتوانن لـە کـردەی پەیوەنـدیکاری دا و بەمەبەستی لێك تێگەیشتن و هێنانەئارای فەزایەکی ئـازاد بـۆ یـەکانگیری کۆببنـەوە، پێویسـتە جیهانی ژین لە هەژموونی دەسەلاّتی زۆرەملیٚ رزگار بکرێت و تەنیا سـەرکەوتن و بەدەسـت هێنـانی ئامانج نەبێتە پێوەری درست کردنی پەیوەندی مرۆیی بەلّکو گەشەدان بە کلتور و بـەها ئەخلاقیـەکان لە چوارچێوەی کۆدەنگی بەشداران و لە پرۆسسی گفتوگۆ دا ئامانجی کۆمەلّگایەکی دیموکراتی بێت.

---

٢٦٤. هەمان سەرچاوە، هەمان لاپەڕە.

٢٦٥. یورگن هابرماس ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٧٣.

# باسی چوارەم

## "پانتایی گشتی"
## وەك بوارێك بۆ گفتوگۆی رەخنەیی- عەقلانی

لێكۆڵینەوەی هابرماس سەبارەت بە پانتایی گشتی *public sphere*[*] بریتیە لە«شیكردنەوەی بونیاد، ئەرك، سەرهەڵدان و گۆڕانی مۆدێلی لیبرالی پانتایی گشتی بۆرژوازی » كە بوو بە بەدیلی مۆدێلی "پانتایی گشتی عامەپەسەند-*plebeian public sphere* كە بۆ ماوەیەك لە سەردەمی شۆڕشی فەرەنسی دا بالادەست بووە و زیاتر لە خەڵكی نەخوێندەوار و نارۆشنبیر پێك هاتبوو. كەواتە ئەم توێژینەوەیە قۆناغیكی مێژوویی دیاریكراو دەكاتە بابەتی خۆی وهەروەك هابرماس دەڵێت پانتایی گشتی *Öffentlichkeit* «چەمكێكی تەواو مێژووییە».[٢٦٦] باسی سەرهەڵدانی ئەم پانتاییە دەكات لەسەدەی حەڤدە و هەژدە لە ئەوروپا وەك قۆناغێكی مێژوویی و ئەم توێژینەوەیە لە یەك كاتدا رەهەندی تیۆری ئەبستراكت و ئەزموونی لەخۆگرتووە كە لە نێوان فەلسەفە و زانستە كۆمەڵایەتییەكان دا،

---

* كتێبی (گۆڕانی بونیادیی پانتایی گشتی – توێژینەوەیەك لەسەر كۆمەڵگای بۆرژوازی)، لە بنەڕەت دا بریتیە لە تێزی دووەمی یورگن هابرماس كە لە كۆلێژی ماف بەسەرپەرشتی ئەبندروس Abendroth ئامادە كراوە بۆ بە دەست هێنانی ئەهلیە لە زانكۆی ماربۆرگ لە سالی ١٩٦٢. ئەمە دەقە ئەڵمانی و ئینگلیزیەكەیەتی:

- Jürgen Habermas, Strukturwandel der Offentlichkeit,F /M ,1990.
- Jürgen Habermas ,The Structural Transformation of the Public Sphere ,translated by Thomas Burger with the assistance of Frederick Lawrence ,MIT Press ,Fifth printing ,Massachusetts, USA ,1992.

٢٦٦ . یورگن هابرماس، دگرگونی ساختاری حوزە عمومی - كاوشی در باب جامعە بوژوایی ، ت: جمال محمدی، نشر افكار، چاپ ٣، تهران، ١٣٨٨(٢٠١٠)، ل١٠.

- Jürgen Habermas, op.Cit., p.xviii.

بەتایبەتی سۆسیۆلۆژیا و ئابووری و زانستی سیاسەت و یاسای گشتی و مێژووی کۆمەلآیەتی ومێژووی ئایدۆلۆژیاکان.[٢٦٧] ئەمەش کۆکە لەگەڵ پرۆژەی فەلسەفی هابرماس کە هەوڵدەدات بۆ نەهێشتنی سنووری نێوان زانستەکان.

### تەوەری یەکەم: سەرهەڵدان، بونیاد و ئەرکەکانی پانتایی گشتی

هابرماس بۆ گەڕان بەدوای رەگەکانی چەمکی "تایبەتی و گشتی"دا بۆ یونان دەگەرێتەوە و بەبۆچوونی ئەو لە نەریتی یۆنانی دا خاڵی بەرانبەری پانتایی *oikos*(خێزان) بریتی بوو لە پانتایی گشتی کە پانتایی ئازادی و تەنیا لێرەدا بوو کە کاروبارەکان دەخرانەڕوو و هەموو شتێ بۆ خەڵك ئاشکرا دەکرا، لەم پانتایە دا هاوولآتیان سەبارەت بە بابەتی جۆراوجۆر دەدوان و شتەکانیان رێکدەخست.

> **پانتایی گشتی *police* وەك فەزای کراوەی چالاکی هاوولآتیان حسێب دەکرا: ئەوان لەم پانتایە دا لە لایەکەوە وەك تاکی یەکسان *homoioi* هەڵسوکەوتیان لەگەڵ یەکتر دەکرد و لە لایەکی ترەوە هەموو هاوولآتیەك* هەولی دەدا پێش ئەویتر بکەوێت.**[٢٦٨]

بەلآم ئەمە لە قۆناغێکی تری مێژوویی دا گۆڕانکاری بەسەر دا دێت و بەبڕوای هابرماس بەدرێژایی سەدەکانی ناوەراست چەمکەکانی گشتی، تایبەتی و پانتایی گشتی لە ژێر زاراوەی *res publica* (بواری گشتی، کۆماری) دا دەخرانەڕوو. ئەم پانتاییە بەمانای دەوڵەت و دەوڵەتی بووە واتە هەموو ئەوەی لە سنووری دەوڵەت دابوو بە بە گشتی و ئەوەی دەرەوە بە

---

٢٦٧ . علاء طاهر، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٩.

* لە شارە- دەوڵەتە پەرەسەندووەکانی یۆنان دا پانتایی پۆلیس police کە لە نێوان هاوولآتیە ئازادەکان دا هاوبەش بوو بە تەواوی لە پانتایی oikos جیا بوو. لەم پانتاییە دا هەموو تاکێك سنووری تایبەت idia بە خۆی هەبوو، ژیانی گشتی (bios politikos) لە بازاڕ agora رووی دەدا و ئەمە بەو مانایە نییە کە تەنیا لە سنووری ئەم بوارە دا بەرتەسك دەبۆوە، پانتایی گشتی لە سەربنەمای گفتوگۆ lexis دامەزرابوو کە جۆرەها راوێژ ، دانوسان لە مەڕ یاساکان و کردەی بەکۆمەڵ praxi — وەك خەرجیە گشتیەکان و رکەبەرایەتی لە یارییە پاڵەوانیەکانی لەخۆدەگرت. سەرچاوەی پێشوو، ل ١٨-١٩. Jürgen Habermas, op Cit.,PP.3-4-.

٢٦٨. سەرچاوەی پێشوو، ل ١٩. ٤. Ibid., p-.

تایبەتی ناودێر دەکرا.[269] بەلاّم ئەم جیاکارییە هیچ جۆرە بەکارهێنانێکی ڕێك و پێك نەبووە ، هەر بۆیە هابرماس پێی وایە لە قۆناغی فیۆدالی ئەوروپا دا ناتوانین باس لە جیاکردنەوەی پانتایی گشتی وتایبەتی بکەین و « لۆژیکی تره ئەگەر بڵێین، دەسەلاّتی "گشتی" و"تایبەتی"بەجۆرێك تێکچڕژابوون کە هەر دووکیان یەك دەسەلاّتبوون ولە ڕاستی دا دەشێت ئەم قۆناغە بە قۆناغی مافی تایبەتی شەرعی لەقەڵەم بدرێت».[270] لەم قۆناغەدا پاشاکان لەرێگای بەخشینی زەویی بە کەسانی دەرباری (حاشیە) خۆیان جۆرە بوارێکی تایبەتی دەبەخشی بەلاّم هەمیشە لەژێر سایەی خۆیدا بوو. بەم جۆرە لەسەدەکانی ناوەڕاستدا پاشا دەبێتە (نوێنەری گشتییەت *Publicity*) و کۆی هەموو هێز و ئیرادەکان لە خۆیدا گرد دەکاتەوە و بۆنەو مەراسیمەکان کە بەردەوام لە کەرنەڤاڵی گەورەی جەماوەری دا نمایش دەکران هەمویان تەعبیریان لە گشتیەتێك دەکرد کە پاشا نوێنەراتی دەکرد. بە رای هابرماس «گشتیەتی نوێنەرانە بریتی بوو لە پلەوپایە -نەك بوارێك - کە دەسەلاّتدارەکان ئەم پلەوپایەیان لەبەر دیدی گشت دەنواندەوە».[271] بەلاّم لە کۆتاییەکانی سەدەکانی ناوەڕاست ئاهەنگ وجەژنەکان خەسڵەتی گشتی خۆیان لەدەست دا و لە شوێنە گشتیەکانی دەرەوە بەرەو ناو پارکی کۆشك چوون، بەم جۆرە دواین شێوازی " گشتییەتی نوێنەرانە *representative publicness*" کە بەتەواوی لە دەرباری پاشادا سنووردار بوو، گۆڕا بۆ پانتایەکی داخراوی ناو کۆمەڵگا کە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر لە دەوڵەت جیا دەبۆوە . لەم سەردەمەدا بوو کە بۆ یەکەمین جار پانتایەکی گشتی و پانتایی تایبەتی بەمانای مۆدێرنی وشە لە یەکتر جیا بوونەوە. ئەو پانتایەی کە لەو سەردەمە دا لەژێر ناوی دەوڵەتی ڕەهادا بوونێکی سەربەخۆی بەدەست هێنابوو، لە کەسی دەسەلاّتدار جیا و سەربەخۆ بوو.[272] هابرماس پێیوایە سەردەمی ڕۆشنگەری و ڕووداوەکانی کۆتاییەکانی سەدەی هەژدە بووە هۆی ئەوەی ئەو توێژانەی لەگەڵ پاشا دا هەڵگری گشتیەتی نوێنەرانە بوون لەبەر یەك هەڵوەشێت، بەشێکیان بۆ هێزی تایبەتی

---

٢٦٩. عوضعلي سعادت، هابرماس در دگرگونی حوزە عمومی، ل ٢ لە ١٣. لەم سایتەی خوارەوەلە ڕێکەوتی ٢٠١٠/٧/٢٢ وەرگیراوە:http://www.sociogroup.parsiblog.com/-315834.htm

٢٧٠ . یورگن هابرماس، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٢.. ٦ -Ibid., p.

٢٧١ . عوضعلي سعادت، سەرچاوەی پێشوو، هەمان لاپەڕە.

٢٧٢ . یورگن هابرماس، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٩. . ١١Jürgen Habermas, op. Cit- p.,

وبەشەکەی تریان بۆ هێزی گشتی دابەش بوون و بۆ نموونە ئـاین بـوو بـە شـتێکی تایبـەتی و تاکەکەسی. دەزگاکانی دەسەلاتی گشتی وێڕای بیرۆکراسی وسـوپا ولەهەنـدێ حالـەدا وێـڕای دەزگا یاساییەکان جەختیان لەسەر سەربەخۆیی خۆیان لـە پانتـایی تایبـەتی دەربـارەی پاشـا دەکردووە، پاشان توێژە فیوداڵەکانیش بەهەمان شێوە گۆڕان: خانەدانەکان بوون بەبەشـێك لـە ئۆرگانی دەسەلاتی گشتی واتە پەرلەمان ودەزگا یاساییەکان و ئەوانەی خـەریکی بازرگـانی و پیشەسازی بوون تا ئەو جێگەیەی توانیان ئەنجوومەنی شاری و ڕێکخراوی لۆکـالی دابمـەزرێنن وسەقامگیری بکەن گۆڕانیان بەسەرداهات و وەك بوارێکی پوخـت لـە سـەربەخۆیی تایبـەتی، بوون بە پانتایەك لە کۆمـەڵگای بـۆرژوازی و لـە دەولـەت جیابوونـەوە.[٢٧٣] هاوکـات لەگـەڵ سەرهەڵدانی سـەرمایەداری بازرگـانی، بنـەمای شـێوازی سیسـتەمێکی کۆمەلایـەتی نـوێ دروستبوو. بەش وتوخمەکانی پەیوەندی بازرگانی نوێ بریتی بوو لە: ئـالۆێری کـالا و هـەواڵ. لەگەڵ فراوانبوونی ئـالۆوێری کالاکـان، ئـالۆوێری هـەواڵیش بـەرفراوان دەبـوو وهـەردووکیان پەیڕەویان لە مۆدێلێکی یەکسان دەکرد.[٢٧٤]

**سەرهەڵدانی ئەم سیستەمە نوێیە ئابووریە راستەوخۆ کاریگەری لەسـەر سیستەمی کۆمەلایەتی و سیاسیش دانا و جۆرێك لەسەربەخۆیی دروست کرد. هەرلەم سەردەمەدا لاواز بوونی "گشتیەتی نوێنەرانە" هاوکات بـوو لەگـەڵ لەناوچوونی دەسەلاتە فیوداڵیەکان بەدەستی سەروەری نەتـەوەیی و دروسـت بوونی دەوڵەتی مۆدێرن، ئەم وەرچەرخانە بووە هۆی سەرهەڵدانی پانتایەکی تر کـە بـەمانای مـۆدێرنی وشـە پانتـایی گشـتی بـوو: پانتـایی ئۆتوریـەتی دەوڵەت*.[٢٧٥]**

---

٢٧٣ . یورگن هابرماس، سیطره عمومی ، ت: هاله لاجوردی، فلنامه فلسفی، ادبی، فرهنگی ارغنون، شماره ٢٠، تهران، تابستان ١٣٨١(٢٠٠٢)، ل ٢٦٨.

٢٧٤ . یورگن هابرماس، دگرگونی ساختاری حوزه عمومی ، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٦. -Ibid., p. 16.

* ئەم پانتایە لە دوو شوێندا دەرکەوت، یەکیان لە فەرمانگە هەمیشەییەکانی دەوڵەت وئەویتریان لە سوپای هەمیشەییدا بوو. هابرماس، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٩. .١٨ -Ibid., P.

٢٧٥ . سەرچاوەی پێشوون ل ٣٨-٣٩. .١٨ -Ibid., P.

بەم جۆرە جارێکی تر پانتایی گشتی وپانتایی تایبــەتی لێــك جیابوونــەوە، ئــەم جارەیــان پانتایی گشتی کەوتە بەرانبەر ئەو بەشــەی کۆمــەڵگا کــە تاکــەکان هــیچ پۆســتێکی ڕەسمــی حووکمیان نەبوو و بەئیشی تاکەکەسی خۆیانەوە خەریك بوون وئەمەش بەتەواوی جیــاواز بــوو لە گشتیەتی نوێنەرانە. تایبەتمەندی (گشتی) ئیدی ئاماژە نەبوو بۆ دەربار یان پاشــایەك کــە دەسەلاتیان پیێ ببەخشێت بەڵکو هێما بوو بۆ دەزگایەکی کارا کە خاوەنی پانتایی دادپەروەری ڕێك ومافی مۆنۆپــۆلی بــەکارهێنانی هێــزی شــەرعی بــوو. « ئــالۆوێری هەوڵــەکانیش واتــە چاپەمەنی، کەبە "جۆرناڵی سیاسی" ناوزەد کرا»[٢٧٦]، توانی سەرەڕای رۆڵی زانیاری بەخشــین رۆڵی سیاسیش بگێــڕێ و لــە لایــەن بازرگانەکانــەوە دەردەکــرا و هــەر لەلایــەن ئەوانیشــەوە پشتیوانیان لێدەکرا، بەلاّم هێدی هێدی دەوڵەت دەستی بەسەر چاپەمەنی داگرت ولە خزمەت ئامانجەکانی خۆی دا بەکاری هێنا و تەنانــەت کۆنترۆڵیشــی کــرد، کاربەدەســتە دەوڵەتیــەکان فەرمان و ڕاگەیاندراوەکانی خۆیان بۆ گشت جەماوەر یان هەموو ژێر دەستەکان دەردەکر، بەلاّم ئەم ڕاگەیاندراوانە نەدەگەیشتە دەست "خەڵکی ئاسایی" بەڵکو لە باشترین حاڵەتدا دەکەوتــە دەست توێژی ڕۆشنبیر. بەم جۆرە هاوکات لەگەڵ بەرفراوانبوونی دەوڵــەتی مــۆدێرن توێــژێکی نویێ لەناو بۆرژواکان سەری هەڵــدا کــە کرۆکــی ســەرەکی "گشــت"ی دروســت دەکــرد، واتــە کارمەندە ڕەسمییەکانی دەوڵەت*.[٢٧٧]ئەم توێژە نوێیەی بۆرژواکان کــە هــەر لەســەرەتاوە "بــە جەماعەتی کتێب خوێن *Reading public*" لەقەڵەم دەدران، بوونە پارێزەر ودامەزرێنــەری پانتایی گشتی.[٢٧٨]بوون بە نەیاری دەسەلاتی دەوڵەت و هەموو دەستێوەردانێکی دەوڵــەت لــە ژیانی تایبەتی دا کەوتە بەر ڕەخنەی پانتایی گشتی و پەیوەندی نێوان کۆمەڵگاو دەوڵەت بوو بە پەیوەندییەکی ڕەخنەیی ولەم نێوەدا چاپەمەنی ڕۆڵێکی بەرچاوی گێڕا. بەم جۆرە لە کۆتایی سەدەی حەڤدەدا لە بەریتانیا و لەکۆتایی سەدەی هــەژدەدا لــە فەرەنســا « چــینی بــۆرژوازی

---

٢٧٦ . هەمان سەرچاوە، ، ل٤٢ . -Jürgen Habermas, op Cit.,18

*لەگەڵ سەرهەڵدانی ئەم توێژە خەڵکی ڕەسەنی شار کە خاوەن پیشە بوون لە ڕووی پلەی کۆمەلایەتییەوە ئاستیان دابەزی. مافپەروەران ئەندامی سەرەکی ئەم توێژە بوون. پزیشك ، قەشە ، ئەفسەر ، زانا و توێژەران ئەندامانی تری ئەم توێژەیان پێك دەهێنا. هەمان، ل ٤٥

٢٧٧. هەمان سەرچاوە، ل ٤٥. -Ibid., pp.22-23

٢٧٨. هەمان، ل٤٦.-Ibid., p.23

خودئاگایی بەدەست هێناو دەستی کرد بە داڕشتنی سەربەخۆیی تایبەتی خۆی لە بەرانبەر دەسەڵاتدا وئەمەش لە ڕێگای دامەزراندنی ڕێساو پرەنسیب بۆ دروستکردنی گفتوگۆ و مناقەشەی ئازادی گشتی و دادپەروەرانە». [٢٧٩] پانتایی گشتی کە پێشتر هاوواتای پانتایی دەسەڵاتی دەوڵەت بوو، گۆڕا بۆ تاکە شوێنێك کە تێیدا تاکە تایبەتیەکان لە دەوری یەکتر کۆدەبوونەوە و "گشت*" یان جەماعەتیان پێك دەهێنا. ئەم تاکانە دەوڵەتیان ناچار کرد لەبەر دەم رای گشتی دا پاساو بۆ شەرعیەتی خۆی بێنێتەوە. [٢٨٠]پانتایی گشتی بە پێچەوانەی ئەو دەزگایانەی کە لە ژێر کۆنترۆلی دەسەلآت دابوون یان خاوەن پەیوەندی دەسەلآتی ناوەکی بوون، توانی پرەنسیپی بەشداری وچاودێری دیموکراتی دروست بکات و بوارێکی یەکسان بۆ کفتوگۆ بڕەخسێنێ. کەواتە لەم قۆناغە دا مەیدانێکی دیموکراسی خولقا کە هەموو هاوولاتیان بەبێ جیاوازی چینایەتی دەیان توانی وەك گشت و نوێنەری بەرژەوەندی گشتی دەسەلآت بکێشنە ناو مشتومڕی رژد و ئازادانەوە و پەیوەندیەکی نوێ دروست بکەن کە لێیەوە بتوانرێ گفتوگۆ و راوێژ لە سەر کێشە و پرسە گشتیەکان ئەنجام بدرێت. لێرە دا خاڵی گرنگ ئەوە بوو کە «جیاوازی نێوان تاکە بەشدارەکان خرایە ناو" کەوانەوە".خرانە ناو کەوانەی جیاوازی پلەوپایە و شوێنگەی کۆمەلآیەتی شتێکی دەستکردی بەشدارانی گفتوگۆ بوو»[٢٨١]بۆ ئەوەی یەکسانی لە را و گفتوگۆ دروست بێت. لەناو هۆڵەکان دا خانەدان، بۆرژوا، شازادە و کۆنتەکان لە تەنیشت منداڵی پیشەساز و کاسبکارەکان کۆدەبوونەوە. [٢٨٢] لێرەوە هابرماس دەڵێت: پانتایی گشتی بە پلەی یەکەم بوارێکە لە ژیانی کۆمەلآیەتی ئێمە کە تیایدا شتێکی وەك ڕای گشتی دەتوانێت دروست بێت. دەستڕاگەیشتن بەم پانتایە بۆ هەموو هاولآتیان مسۆگەرکراوە، لە هەموو گفتوگۆیەك دا کەتیایدا تاکە تایبەتییەکان لە دەوری یەکتری کۆدەبنەوە بۆ ئەوەی

---

٢٧٩ . علاء طاهر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٩.

* لێرە دا پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە چەمکی گشت جیاوازیەکی بنەڕەتی هەیە لەگەڵ چەمکی جەماوەر و زیاتر بەمانای کۆمەڵێکی خودئاگا و رۆشنبیر دێت کە گوزارشت لە چۆنایەتی بەرژەوەندی و ئاگایی گشتی دەکات نەك چەندایەتی ئەندامەکانی.

٢٨٠. یورگن هابرماس، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٩.-Ibid., p.2.

٢٨١. د.منصور انصاری ، سەرچاوەی پێشوو ، ل٢٢٣.

٢٨٢. یورگن هابرماس، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢ . .Jürgen Habermas, op Cit-٣٣.,

جەستەی گشتی *Public body* دروست بکەن، بەشێك لە پانتایی گشتی دروست دەبێت.[٢٨٣]
کەواتە پانتایی گشتی، فەزای دەربڕینی بیروبۆچوونی ئازاد، دیالۆگ و گفتوگۆ و هەوڵدانە بۆ چارەسەرکردنی پرسە گشتیەکان. هەموو کەسێك ماف و دەسەلاتی بەشداری کردنی هەیە لەم بوارەدا و لە رووی تیۆری و ئایدیالیەوە لە بەرانبەر ئەویتر خاوەن ئیمتیازی تایبەتی نییە و *پانتایی گشتی نە دەزگایە** *نە سیستەم بەڵکو تۆڕێکە رێگە دەدات بە دروست کردنی پەیوەندیکاری لە نێوان خەڵك بۆ گوزارشت کردن لە را و هەڵوێستەکانیان و پانتایەکە خۆی بە پشت بەستن بە عەقڵی پەیوەندیکاری خۆی بەرهەم دێنێتەوە و لەرووی پرەنسیپەوە کراوەیە بەرووی هەموو بکەر و پێشنیارەکان دا.* [٢٨٤] لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە هەر لە یۆنانەوە تا سەردەمی مۆدێرن چۆن چەمکی "گشتی"و "تایبەتی" گۆڕانی بەسەر دا هاتووە و جێگۆڕکێی کردووە و لەناو گوتاری سیاسی دا مانای جیاوازی وەرگرتووە، تا لەسەدەی هەژدە بە سەرهەڵدانی "پانتایی گشتی بۆرژوازی" بوارێك رەخساوە کە توانیویەتی ببێتە پانتایەکی رەخنەیی کە دەکەوێتە نێوان پانتایی تایبەتی (کۆمەڵگای مەدەنی) و دەوڵەت.

## ١- بونیادە کۆمەلایەتیەکانی پانتایی گشتی:

هەروەك ئاماژەمان بۆ کرد بەبڕوای هابرماس پانتایی گشتی بە پلەی یەکەم بوارێك بوو کە تێیدا تاکە تایبەتیەکان لە دەوری یەکتر کۆدەبوونەوە و "گشتیان "دروست دەکرد. ئەم تاکانە وردە وردە توانیان پانتایی گشتی ژێر کۆنترۆلی دەوڵەت بخەنە ژێر دەستی خۆیان و تەحەدای دەسەلاتی دەوڵەت بکەن. جەستەی گشتی کە لە هاوولاتیان پێك هاتبوو، پێداویستیەکانی کۆمەڵگای بۆرژوازی بۆ دەوڵەت دەگواستەوە بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی ئایدیالی بتوانن بە هۆی ئەم پانتایە گشتییەوە، ئۆتوریتەی سیاسی (دەوڵەت) بگۆڕن بۆ ئۆتوریتەی"عەقلانی".[٢٨٥]

**جگە لەمە توانیان سەبارەت بەو رێسا گشتیانەی کە بەسەر پانتایی تایبەتی دا زاڵبوو واتە "ئالوویری کالا** *Commodity Exchange* **"و**

---

٢٨٣. یورگن هابرماس، سیطرە عمومی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٦٥.

* هەڵبەتە لە خودی خۆیدا دەزگا نیە، بەلام لە کۆمەڵێك دەزگا پێك هاتووە.

٢٨٤. محمد الأشهب ، سەرچاوەی پێشوو ، *ل ٢٦ ٤.*

٢٨٥. یورگن هابرماس، سەرچاوەی پێشوو، ٢٦٩.

**"کاری کۆمەڵایەتی** *Social labor* **"لەگەڵ دەسەڵاتدارەکان دا بکەونە مشتومڕ و گفتوگۆ. ئامرازی سەرەکیان لەم رووبەڕووبوونەوە سیاسیە دا ئامرازێکی نوێ و بێ پێشینەیی مێژوویی بوو: بەکارهێنانی گشتی عەقڵی بەکۆمەڵ (جماعي)***Räsonnement ffentlichestÖ*.[286]

ئەم پانتایە کۆمەڵێك کردەوە و دەزگای کلتوریی لەخۆدەگرێت کە هەڵبەتە خاوەن رۆڵی سیاسی و کۆمەڵایەتی و تەنانەت ئابووریشن، ئەم ئەرکانە لایەنی گشتیەتیان هەیە کە لەباشترین حاڵەتدا لە نفوزی هێز و دەزگا دەوڵەتیەکان سەربەخۆ و پارێزراون.[287] ئامانجی سەرەکی چالاکی ناو پانتایی گشتی گرتنە دەستی دەسەڵات یان دابەشکردنی دەسەڵات نەبوو، بەڵکو خستنە ژێر پرسیاری دەسەڵاتی دەوڵەت و دوورخستنەوەی بوو لە پانتایی تایبەتی، بە رای هابرماس «خەباتی بۆرژوا لە رێگای مشتومڕی گشتی عەقلانی - رەخنەیی ئەنجام دەدراو و خاوەن هیچ مەیلێکی دەسەڵاتخوازانە نەبوو».[288] ئەرگۆمێنتی عەقلانی تاکە داوەری کۆتایی بوو لەمەڕ هەموو پرسێکەوە ، لێرەوە ئەرگۆمێنتی عەقلانی پێوەری حوکم دان بوو نەك شوناسی قسەکەرەکە.[289] بە بڕوای هابرماس بەرلەوەی پانتایی گشتی بتوانێ رۆڵێکی بەرچاو بگێڕی بو تەحەدا کردنی دەسەڵات و جیاکردنەوەی کۆمەڵگا و دەوڵەت، لە پانتایی تایبەتی و دا لە ژیانی خێزانی و هەڵبەتە لە"شار"دا وەك ناوەندی کۆمەڵگای مەدەنی، جۆرە پانتایەکی ناسیاسی سەری هەڵدابوو کە «لەو مشتومڕانەوە گڕوتینی گرتبوو کە بەهۆی دەسکەوتی کلتوری گشتیی لە مۆزەخانە و هۆڵی خوێندنەوە و هۆڵی شانۆ و کۆنسێرتەکان سەرچاوەیان گرتبوو».[290] و بریتی بوو لە "پانتایی گشتی ئەدەبی". دەزگا سەرەکیەکانی بریتی بوون لە قاوەخانە (لە بەریتانیا)* و هۆڵ (لە فەرەنسا)و مەحفەلەکانی باس و گفتوگۆی ئەدەبی (لە

---

٢٨٦. یورگن هابرماس، دگرگونی ساختاری حوزە عمومی ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٣. . Ibid., p-٢٧.

٢٨٧. بابك احمدی ، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٨٩-١٩٠ .

٢٨٨. یورگن هابرماس، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٤ . Ibid., p.28-.

٢٨٩. د. منصور انصاری، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٣٣.

٢٩٠. یورگن هابرماس ، سەرچاوەی پێشوو، ل٥٦. Ibid., p.29-.

* بۆ نموونە لە دەیەکانی سەدەی هەژدە نزیکەی ٣٠٠٠ قاوەخانە لە لەندەن هەبووە کە هەموویان شوێنی وتووێژی ئەدەبی و سیاسی بوونە، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦١. . Ibid., p-٣٢.

ئەڵمانیا)کە لە سەرەتای سەدەی هەژدە ئەم محافلە سەریان هەڵدابوو و ئامانجەکەی بریتی بوو لە دروستکردنی پەیوەندی ویەکسانی لە نێوان تاکی خاوەن پلەو پایەی نایەکسان.[291] ئەم نەخشەیەی خوارەوە پانتایی گشتی بۆرژوازی نیشان دەدات:

| بواری تایبەتی | | پانتایی ئوتوریتەی دەوڵەت |
|---|---|---|
| کۆمەڵگای مەدەنی<br>*Civil Society*<br>(بواری ئاڵوێری کالاّ و کاری کۆمەلاّیەتی) | پانتایی گشتی<br>*Public Sphere* | دەوڵەت<br>(بواری "سیاسەت")<br>*Police* |
| | پانتایی گشتی ئەدەبی<br>(نادیەکان و چاپەمەنی)<br>*Clubs ,press* | |
| فەزایی خێزانی ناوەکی<br>(ئەنتەلجینسیای بۆرژوایی) | *Town* "شار"<br>(بازاڕی بەرهەمی کلتوری) | دەربار(بلاط) *court*<br>مەحفەلی خانەدانی-دەرباری |

سەرچاوە:هابرماس ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٧. -Jürgen Habermas, op. Cit p.30.

مەحافلی گفتوگۆ ، هۆڵ و قاوەخانەکای لەزۆر ڕووەوە لە یەکتری جیاواز بوون*، بەلاّم لەبەر ئەوەی هەرسێکیان شوێنی گفتوگۆ ومشتومڕی تاکە تایبەتییەکان بوون هەندێ تایبەتمەندی دەزگایی هاوبەشیان هەبوو :[292]

١. هەموویان پارێزگاریان لە پەیوەندییەکی کۆمەلاّیەتی تایبەت دەکرد کە تێیدا پلەو پایەی تاکەن بایبەخی پێنەدەدرا.

---

٢٩١. هەمان سەرچاوە، ل ٦٤. . Ibid., p- ٣٤.

٢٩٢. هەمان ، ل ٦٥-٦٤. -Ibid., pp.36-37.

٢.	باس و گفتوگۆی نێو ئەم پانتایە ( هۆڵ ، قاوەخانە، مەحافلی گفتوگۆ) بووە هۆی ئەوەی ئەو بوارانەی کە تا ئەو کات نەخرابووە ژێر باسوخواس، بکەونە بەر ڕەخنەو لێدوان. بە بڕوای هابرماس گفتوگۆ بە مانای بە کێشە کردنی *Problematization* هەموو ئەو پانتاییانە بوو کە تا ئەو کات نەخرابوونە ژێر پرسیارەوە.[٢٩٣]

٣.	پانتایی گشتی لەخۆگر *Inclusive* بوو. هەموو کەسێك بە هۆی دەست گەیشتن بە بەرهەمی کلتوری دەیتوانی تێیدا بەشدار بێت.[٢٩٤]

کەواتە لەگەڵ گۆڕانی سیستەمی ئابووری و سەرهەڵدانی تاکگەرایی و سەربەخۆیی تاکەکان، جۆرێك لە پەیوەندی و جیهانبینی هاتەئاراوە کە توانی نەخشەی سیاسی و کلتوری سەردەمی خۆی جارێکی تر ڕەنگڕێژ بکات و ماناکانی تاك و هاوولاّتی پەیوەست بێت بە رادەی بەشداری چالاکانە لە خستنەڕووی ئەرگۆمێنتی عەقلاّنی دا.

## ٢- ئەرکە سیاسیەکانی پانتایی گشتی:

گۆڕانی سیستمی سەرمایەداری بازرگانی بەرەو سەرمایەداری پیشەسازی لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدە، لەگەڵ خۆیدا ململانێی و ناکۆکی نێوان چین و توێژەکانیشی گۆڕی وئەمەش کاریگەری لەسەر هەموو کۆمەڵگا بۆرژوایی دانا. بۆ درێژەدان بە گفتوگۆی عەقلاّنی — ڕەخنەیی، سێ ڕووداوی گرنگ لە بەریتانیا لەساڵی ١٦٩٤- ١٦٩٥ خاڵی دەستپێکی ئەم گۆڕانکارییانە بوو:[٢٩٥]

***یەکەم،*** دامەزراندنی بانکی ئینگلەند ، ئەم بانکە لە بواری شێوازی بەرهەم هێنانی سەرمایەداری دا بووە هۆی تۆکمەکردنی سیستەمێك کە تا ئەوکات لەسەر بازرگانی بەند بوو. ***دووەم،*** کۆکردنەوەی دەزگای سانسۆر کە وەك قۆناغێکی نوێ لە گەشەپێدانی پانتایی گشتی - حسێب دەکرا. ئەم ڕووداوە بووە هۆی ئەوە کە ئاڕاستەی گفتوگۆی عەقلاّنی-ڕەخنەیی بەرەو چاپەمەنییەکان بچێت، ڕۆژنامەکان بوون بە ئامرازێك کە بڕیارە سیاسییەکانیان دەخستە ژێر حوکمدانی گشتییەوە. ***سێیەم،*** دامەزراندنی یەکەم حکوومەتی کابینەیی کە قۆناغێکی نوێی

---

٢٩٣ .د. منصور انصاری، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٣٤.

٢٩٤ . سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣٤.

٢٩٥ . یورگن هابرماس، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٠-١٠١.   . Ibid., p- ٥٨.

گەشەپێدانی پەرلەمان بوو. هابرماس ئاماژە بەوە دەکات کـە لەگـەڵ نـەمانی دامودەزگـای سانسۆر چەندین ڕۆژنامــەی و بلاۆکـراوە دامــەزران کـە هــەموویان بــەجۆرێك لــە جۆرەکـان خزمەتیان بە بەرفراوانکردنی پانتایی گشتی دەکرد و چـاپەمەنی بـوو بـە ئـامرازی سـەرەکی گفتوگۆی عەقلانی- ڕەخنەیی گشتی و بەتوندی ڕەخنەیان لە بڕیار و سیاسەتەکانی دەوڵەت و پاشا دەگرت. لەپاش ئەوە ئیدی ئەو بیرۆکە هاتە ئاراوە کە « هەرچەندە ڕووبـەڕوو بوونـەوەی نێوان حکومەت وچاپەمەنی زیاتر بێت پانتـایی گشـتی زیـاتر پـەرە دەسـێنبێت ». [296] لـە قۆناغی گەشەی چـاپەمەنی ئۆپۆزسـیۆن لـە بـەریتانیا ئاڕاسـتەیەکی تـر سـەری هەڵـدا بـۆ دروستکردنی پێکهاتەیەکی ئیداری ڕێك وپێك و پاشان پەرەسەندنی بە خۆوە بینی و گۆڕا بـۆ مەیلێکی دەزگاگەرا کە مەبەستەکەی هەڵسوڕاندنی واقع و کۆنترۆڵکردنی بوو بـە شـێوەیەکی گشتی بۆ ئەوەی خزمەتی پرۆژەی سەرمایەداری ئـابووری بکـات.[297] مـۆدێلی بـۆرژوایی لـە کاتیك دا پانتایی گشتی بە بەشێك لە هەموو کۆمەڵگای مەدنی دەزانی و بەتوندی باوەڕی بە جیاکردنەوەی ئەم پانتایە هەبوو لە دەوڵەت، یەکێك لە ئامانجە بەراییـەکانی بریتـی بـوو لـە شەفاف کردنی بڕیارە سیاسی و ئیداریەکان ئەمەش بە شێوەیەکی سەرەکی لە میدیای ئازاد دا دەردەکەوت.

**پانتایی گشتی « بـە پشـتیوانی رۆژنامــەوانی ئـازاد و گەشەسـەندوو، مایکێکی رەخنەییان دروست کردبوو کە تاکی سەربەخۆ لە دەربار و سەرجەم دەزگا سیاسیەکان دەیانتوانی تێیدا لەدەوری یەکتر کۆببنەوە».[298]**

بەڕای هابرماس ئەگـەر شـیکردنەوەی سـەرهەڵدانی پانتـایی گشـتی سیاسـی تـەنیا لـە توێژینەوە لەسەر پەیوەنی چاپەمەنی ، حزب، پەرلەمان، و" گشت"دا سنووردار بکـەین یـان تەنیا لێکۆڵینەوە لە هەمبەر پەیوەندی پێك ناکۆکی نێـوان دەسـەلاٚت وپانتـایی گشـتی وەك پرەنسیپی کۆنترۆڵی ڕەخنەیی حکوومـەت سـەیر بکـەین، ئـەوا لـە ئاسـتێکی ئەبسـتراکتدا خوێندنەوەمان بۆ دیاردەکە کردووە وباسی جۆری ئەرکی سیاسی پانتایی گشتی ناکات. تـەنیا بە تێگەیشتن لە جۆری ئەرکی پانتایی گشتیە کە « دەشێت شیکردنەوە بۆ قۆناغێکی تایبەتی

---

٢٩٦ . هەمان سەرچاوە، ل ١٠٤. . Ibid., p- ٦٠.

٢٩٧ . علاء طاهر ، سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٢.

٢٩٨ . ویلیام اوث وایت ، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٩.

له مێژووی پەرەسەندنی کۆمەڵگا ی مەدەنی بکەین ، واتا ئەو قۆناغەی کە تیایدا "ئاڵوێری کالا" و"کاری کۆمەلآیەتی" بەتەوای لەژێر فەرمانی حکوومەت ڕزگاری بوو». [299] ئەمە بووە هۆی ئەوە کە تاکەکان بتوانن جۆرێك سەربەخۆیی بەدەست بێنن لە ژیانی ئابووری و کۆمەلآیەتی دا کە کاریگەری ڕاستەوخۆی لەسەر بواری سیاسی هەبوو و پەیوەندی نێوان تاك ودەسەلآتی گۆڕی. پێشتر لە ئابووری دا یاسای ناوەکی بازاڕ بەبێ دەستوەردان کاری خۆی دەکرد وهێزی ئەم بیرۆکەیە لە بورای سیاسی وکۆمەلآیەتیشدا خرایە ڕوو بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی دەستووری.

بیرۆکەی کۆمەڵگای مەدەنی لەسەر ئەم گریمانەیە دامەزرابوو کە سیستمی بازاڕی ئازاد دەتوانێت خۆی ڕێك بخات. لەسەر بنەمای ئەم بیرۆکەیە، بازاڕی ئازاد تەنیا لە حاڵەتێکدا دەیتوانی لە خزمەت خۆشگوزەرانی ودادپەروەری دابێت – بەپێی توانا و لێهاتوویی تاکەکان- کە لە هەموو دەسوەردان ونفوزێکی دەزگا دەرەکییەکان ئازاد بێت. [300] بەم جۆرە هەر لەسەر ئەم بنەمایە دەوڵەتی دەستووری بۆرژوایی دامەزرا کە پشتی بە بواری دادوەری بۆ پاراستنی دەستوور دەبەست وهەموو تاکەکان لەبەردەم یاسادا یەکسان بوون وهیچ کەسێك خاوەن مافی تایبەت نەبوو، واتە ڕاستەخۆ ئازادی سیستەمی ئابووری و سەربەخۆیی تاك لەم بوارە دا ڕەنگدانەوەی لەسەر بواری سیاسەت هەبوو، واتە دەوڵەت بە مانا لۆکیەکەی تەنیا حەکەم و پارێزەری ماف و ئازادییەکان بوو لە بەر ڕۆشنایی دەستوور دا.

## تەوەری سێیەم :لە دەوڵەتی لیبرالی دەستوریەوە بەرەو دەوڵەتی خۆشگوزەرانی

لە بنەڕەت دا مەنزومەیەکی تایبەت بونیاد و کرداری پانتایی گشتی دەست نیشان دەکرد، کە لەمیانی ڕووبەڕووبوونەوەی نێوان دەوڵەتی ڕەها و تاکگەرایی بۆرژوازی ئابووری لە پرۆسسێکی ئازادیخوازانە سەری هەڵدابوو. [301] واتە ئازادی تاك لە ڕووی ئابووریەوە بوارێکی ئەوتۆی ڕەخساند کە بوو بە تەحەدایەك لەبەردەم دەوڵەتی ڕەها و لەم نێوە دا پانتایی گشتی بۆرژوازی لە گۆڕەپانی پڕ لە کێشەو ناکۆکی نێوان دەوڵەت وکۆمەڵگا گەشەی سەند، بەلآم

---

٢٩٩ . یورگن هابرماس، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٣ . Jürgen Habermas, op. Cit- .pp.73-74.,

٣٠٠ . سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣ . Ibid.,p.79-.

٣٠١ . پتر هوهندال، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٧٥.

شێوازی ئەم پەرەسەندنە بە جۆرێك بوو کە ئەم پانتایە بەردەوام وەك بەشێك لە هەموو بـواری تایبەتی (کۆمەڵگای مەدەنی) مایـەوە . جیاکردنـەوەی بنـەڕەتی دەوڵـەت و کۆمـەڵگا کـە زەمینەی سەرەکی دروستبوونی پانتایی گشتی بوو بەر لە هەموو شتێ بە مانای جیاکردنەوەی توخمەکانی بەرهەم هێنانەوەی کۆمەلآیەتی بوو لە دەسەلآتی سیاسی.[302] بەم جۆرە دەسـەلآتی سیاسی لە پانتایی تایبەتی کۆمەڵگا جیا بووەوە وبەرهەم هێنان کەوتە دەست تاکەکان، بەلآم بەبڕوای هابرماس لە چارەکی کۆتایی سەدەی نۆزدە دەستوەردانی دەوڵەت کاتێك سەری هەڵدا کە تایبەتمەندبوونی کۆمەڵگای مەدەنی کەوتە ژێر گومان ومەترسییەوە، لەبری ئەوە هێزەکانی کۆمەڵگا دەیانویست ڕۆڵ وئەرکی دەوڵەت بگێڕن. لەم نێوەدا دەستێوەردانگەرایی لەسەر ئـەم گریمانەیـە دامـەزرا بـوو کـە کۆمـەڵگای مـەدەنی ناتوانێـت دژایـەتی نێـوان بەرژەوەندییـە جیاوازەکان یەکلایی بکاتەوە ودەبێت دەوڵەت ئەم کارە ئەنجام بدات. بەلآم جارێکی تر لەگـەڵ دەسوەردانی دەوڵەت لەژیانی تایبەتی دا ڕەوتێکی نوێ سەری هەڵـدا کـە بـووە هـۆی ئـەوەی هەندێ ڕۆڵی دەوڵەت بدرێت بە بەشێك لە کەرتی تایبەت.

**کەواتە ئەم دیالێکتیکـە پێشڤەچـووەی "بەدەوڵـەتی بـوونی کۆمـەڵگا** *Stateification* ***of*** *Society*" **و"بەکۆمـــەڵگایی بـــوونی دەوڵـــەت** *"Societalization of the State"* **ئەو هۆکارە سەرەکییە بوو کە زەمینەی سەرەکی دروستبوونی پانتایی گشتی بۆرژوازی واتـا جیابوونـەوەی دەوڵـەت وکۆمەڵگای بەتەواوی وێران کرد.**[303]

بەم جۆرە دەوڵـەتی خۆشـگوزەرانی لـە ڕێگـای میکانزمـەکانی دەسـتوەردان لـە ژیـانی تاکەکەسی وچوونە ناو پانتایی تایبەتی توانی کـۆنترۆڵی خـۆی بەسـەر زۆربـەی بوارەکـان دا بسەپێنێت، دەوڵەت سەرەڕی ئەرکی ئیداری، دابین کردنـی خزمەتگوزاریشـی گرتـە ئەسـتۆی خۆی ئەمەش لە ڕێگای سپاردنی بە تاکە تایبەتیەکانی بەلآم خۆی چالاکیەکانی ڕێکدەخست واتە خۆی ڕۆڵی بەرهەم هێنەری دەگێڕا و دەوڵەتی دەستووریی لیبرالی لەناو برد.

---

٣٠٢ . یورگن هابرماس، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٧٧ .. Ibid.,p-١٤١.

٣٠٣ . سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢٩ . -Ibid.,p.142.

### ١- پرۆسسی لەناوچوونی پانتایی گشتی بۆرژوازی:

بەرای هابرماس لەگەڵ تێکەڵ بوونی دەوڵـەت و کۆمـەڵگای مـەدەنی، مـۆدێلی پانتـایی گشتی بۆرژوایی کارایی خۆی لەدەست دا و هەڵوەشایەوە، شوێنێك بـۆ گفتوگـۆی رەخنـەیی-سیاسی تاکەکان نەمایەوە. لەگەڵ نەمانی ئەمە، دوو دەزگـای تـر پەیامەکـەیان هـەڵگرت : یەکیان ئەو کۆمەلآنەی هەوڵیان دەدا لەژێر پـەردەی چـالاکی سیاسـی بەرژەوەنـدی تایبـەتی گرووپێك دابین بکەن و ئەویتریان ئەو حزبانە بوون کە لەگەڵ ئۆرگانەکانی دەوڵـەت گرێـدرابوون وبە توندی لەجەماوەر کەسەردەمیك نوێنەرایەتیان دەکرد دوور دەکەوتنـەوە.[٣٠٤] بـەم شـێوەیە جۆریك لە پانتایی شێواو ناراستەقینە سەری هەڵدا کە دەیەویسـت لـە رووکـەش دا وا خـۆی دەربخات کە گوزارشت کە گشت وبەرژەوەندی گشتی دەکات. « ئەو رۆڵەی پانتایی گشتی لە ژیانی فکری کۆمەڵگا دا دەیگێڕا، ئێستا گوێزرابـۆوە بـۆ دەزگاکـانی تـر کـە نوێنەرایـەتی فۆڕمێکی رواڵەتی لە پانتایی گشتی شێواو و چەواشە کراویان دەکرد».[٣٠٥] بەم جـۆرە گشـت کە سەردەمیك بەشێکی گرنگـی کۆمـەڵگای پێـك دێنـا و کاریگـەری راسـتەوخۆی لەسـەر دەرکردنی بڕیاری سیاسـی هـەبوو و لـە رێگـای گفتوگـۆی عـەقلانی- رەخنـەیی کارەکـانی حکومەتیان دەخستە بـەردەم هەڵسـەنگاندن و چـاوەدێریان دەکـرد، ئێسـتا تـەنیا لەبـەردەم بەشداریەکی رواڵەتی دا مابۆوە کە دەزگا سیاسی و ئابووریە گـەورەکان هـەڵیان دەسـوڕاند و لێرەوە جارێکی تر جیاوازی کۆمەلآیەتی و لەگـەڵ خۆیـدا جیاکـاری سیاسـی سـەری هەڵـدا، پرۆسسی سیاسی لە نێو ژمارەیەکی کەم لـە چـالاکوانە حزبییـەکان و جـەماوەری ناچـالاکی دەنگدەران بوو بە دوو بەش و چیتر راوبۆچوونی هاوولآتیان رای گشـتی نـەبوو، « رای گشـتی ئیتر سەرچاوەی حوکم دان و چاودێری رەخنەیی نەبوو و تەنیا گۆڕاوێکی کۆمەلآیەتی بـوو کـە دەبووایە دەستکاری بکرێت».[٣٠٦] تەنیا لە کاتی هەڵبژاردن دا وەك ئامراز بـەکاردەهێنرا. لـە لایەکی ترەوە بە پێچەوانەی رای مارکس کە رای وابـوو جـەماوەر، پانتـایی گشـتی ئـاوەدان دەکاتەوە، بە بڕوای هابرماس هێرشی جەماوەری بێ کالآ بەرەو پانتایی گشتی سیاسی بـووە

---

٣٠٤ . هەمان سەرچاوە، ل ٢٧٧. -Ibid.,p.176.

٣٠٥ . رابرت هولاب ، یوگرن هابرماس — نقد در حوزە عمومی ] ت:د.حسین بشیریە ، نشر نی ، چاپ ٤ ، تهران،١٣٨٦ -٢٠٠٧، ل ٢٩.

٣٠٦ . ویلیام اوث وایت ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢١.

هۆکاری دووباره تێکچرژانەوەی کۆمەڵگا و دەوڵەت، ئەم دیاردەیە بناغـەی بـەرایی پانتـایی گشتی (واتەکۆمەڵگای مەدەنی) وێران کردن بێ ئەوەی بناغەیەکی تازەی بۆ دابڕێژێت.[٣٠٧] بەم جۆره دەتوانین نەمانی پانتایی گشتی لەسەدەی هەژدە بـە پێـی توێژینـەوەی هابرمـاس لـەم خالانە دا کورت بکەینەوە:[٣٠٨]

١- ڕێکخراوی تایبەتی بوون بە خاوەن دەسەلاتی گشتی .

٢- دەوڵەت چووە ناو پانتایی تایبەتی تاکەکان.

٣- نایەکسانی کە بەردەوام لە هەناوی کۆمەڵگای مەدەنی دایە و لە پانتایی گشـتی دا خرابووە ناو "کەوانەوە"جارێکی تر بوو بە بنەمای کار و وتووێژ.

٤- ئەرکی پانتـایی گشـتی لـە گفتوگـۆی عـەقلانی- رەخنـەیی، گـۆڕا بـۆ دانوسـان *Negotiation*.

حزب و ڕێکخراوە تایبەتیەکان نەیانتوانی ئەم رۆڵە بگێڕن، چـونکە بـوون بـە بەشـێك لـە دەسەلاتی گشتی(دەوڵەت) و لـە ڕێگـای میـدیاوە دەیانەویسـت رەزامەنـدی گشـتی خـەڵك بەدەست بێنن. ئیدی ئەم جارەیان "گشتیەت"لەسەرەوە بۆ خوارەوە دروست بوو لە کاتێـك دا لە قۆناغی لیبرال دا "گشتیەت" لە خوارەوە بۆ سـەرەوە و لـەرێگای مشـتومڕی عـەقلانی-رەخنەیی دروست دەبوو و دەسەلاتیان کۆنترۆڵ دەکرد. « گشتیەتی هەڵخەڵەتێنەرانە جێگـەی گشتیەتی رەخنەگرانەی گرتەوە».[٣٠٩] سیاسەتی حزبی و دەستکاری کردنـی میـدیا رەوشـێکی هێنایە ئاراوە کە هابرماس"بە فیۆدالی کردنەوەی "پانتایی گشتی ناوزەدی دەکات، رەوشـێك کە تێیدا سیستەمی نوێنەرایـەتی روالـەتی، بـە سـەر گفتوگـۆی عـەقلانی دا زاڵ بـوو[٣١٠] و کەماتیەك لە پسپۆری و شارەزا کە عەقڵی خۆیان دەخستە خزمـەت بـەکارهێنانی گشـتی و جەماوەرێکی زۆری بەکاربەر کە وەرگرتن و هەڵچوونیان گشتیە بەلام نارەخنەییە.[٣١١] شوێنی پانتایی گشتیان گرتەوە و لە ئەرکەکانی خۆی بەتاڵیان کردەوە، ئێستا ئیتر گشـت تـەنیا لـە

---

٣٠٧ . یورگن هابرماس،سەرچاوەی پێشوو، ل٢٧٩. -Jürgen Habermas, op. Cit.,.,p.177.

٣٠٨ . د.منصور انصاری، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٣٨.

٣٠٩ . یورگن هابرماس، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٨٠. -Ibid.,p.178.

٣١٠ . رابت هولاب، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٩.

٣١١ . ویلیام اوث وایت، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٠.

پێناو شەرعیەتدان بە دەسەلأتی سیاسی و لە بەشداریەکی روالەتی دا خـۆی دەبینیـەوە. بـەم جۆرە لەم قۆناغە دا رۆڵی رۆژنامە لە گەیاندنی هەواڵ و زانیاری بەخشین بـە پانتـایی گشـتی گۆڕا بۆ رۆڵی بلأوکردنەوەی ئایدۆلۆژیای سیاسی و کلتوری بەکاربەری (استهلاکی) کـە ئیـدی ئەم جارەیان رۆژنامە تەنیا شوێنی رەخساندنی دەرفەت بۆ گفتوگـۆی عـەقلانی- رەخنـەیی و بلأوکردنەوەی فکر نەبوو، بەڵکو گۆڕا بۆ شوێنی دروسـت کردنـی رووداو و رێکـلام و هـەوڵ دەدرا لەگەڵ میزاجی بازاڕ و جەماوەر رێك بخرێت و « لە دەزگایەکەوە کە تەنیا ئیشی هـەواڵ بێت گۆڕا بۆ بکەر و ڕێبەری ڕای گشتی — واتە چەکی سیاسەتی حزبی».[٣١٢] لێرەدا مەیلی بە بازرگانی بوونی چاپەمەنی ئاستەنگی سەرەکی بەدیهاتنی چەمکی رای گشتی بوو و بەشـێکە لەو پرۆسسەی کە هابرماس بە وەرچەرخان و گۆڕانی پانتایی گشـتی نـاوی دەبـات.[٣١٣] پـاش بەهێز بوونی کاری حیزبی ئەم جارەیان رۆژنامە بوو بە دەنگی حیزب و ئەویش بەردەوام هەوڵی دەدا رەنگی جەماوەر بە خۆوە بگرێت. هەربۆیـە ئـەرکی چـاپەمەنی دروسـت کردنـی تـاکی وەکیەك و بەکاربەر بوو نەك عەقلانی و رەخنەگر، چونکە لەم سیستەمە دا رێکـلام دەبووایـە ئەرکێکی گەورەی ئابووری و سیاسی بگێڕێت و هانی کۆدەنگی و رەزامەندی جەماوەر بـدات، ئەم رەزامەندییە گرنگ نییە لەسەر چییە، بەڵکو گرنگ ئەوەیە چەندە سوودی ئابووری هەیـە وچەندە « دەشێت تەرویج کردن بۆ عامە و ناچارکردنی بۆ قبوڵ کردن یـان نـەکردنی تاکێـك، بەرهەمێك، رێکخراوێك یان ئایدیایەك بەسەرکەوتووی ئەنجام بدرێت».[٣١٤]

کاتێ دەولەتی لیبرالی دەستووری گـۆڕا بـۆ دەولـەتی خۆشـگوزەرانی وبـەم جـۆرە بـواری چالاکیەکانی خۆی پەرەپێدا، پێویستی پروپاگەندە هاتە ئاراوە، هەربۆیە چاودێری و گفتوگـۆی ئەو گروپانە سەری هەڵدا کە بەرژەوەندی هاوبەش بەیەکی دەبەستنەوە بۆ دروست کردنـی رای گشتی و رەزامەندی.[٣١٥] بەلأم هابرماس ئاماژە بەوە دەکات کە ئەم کـۆدەنگی و رەزامەندییـە هیچ پەیوەندییەکی بە کـۆدەنگی قۆنـاغی لیبرالـەوە نییـە، چـونکە ئەمـە گوزارشـت نییـە لە"بەرژەوەندی گشتی" کە لە رێگای گفتوگۆی عەقلانی-رەخنەییەوە بەدەست دێت، بەڵکو لە

---

٣١٢ . یورگن هابرماس، سیطرە عمومی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٦٩.

٣١٣ . ویلیام اوث وایت، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٩.

٣١٤ .یورگن هابرماس، دگرگونی ساختاری حوزە عمومی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٠٥. . ١٩٤. - Ibid.,p

٣١٥ .ویلیام اوث وایت، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٢.

لایەن کەسانی دەوڵەمەندەوە ئاراستە دەکرا وجۆرێك لە "رای گشتی ساختە" دروست دەکات*
کــە تــاك تــەنیا وەك بەکاربــەر دەبینێــت. بــەم جــۆرە لــە روانگــەی هابرماســەوە چــەمکی
"گشتیەت"ی لیبرال بەتەواوی گۆڕانی بەسەر داهات.

لە قۆناغی لیبرال دا گشتیەت لە رەوتی خەبات دژی سیاسەتی شاراوەی پاشا بەدی دەهات و بەدیهاتنیشی بە مانای بەرفراوان بوونی گفتوگۆی عەقلانی-رەخنەیی بوو سەبارەت بە پرس و کەسەکان و حوکمدان لەمەڕ بڕیاری سیاسی لە دادگای رای گشتی دا. لەپاش ئەم قۆناغــە، گشتیەت تەنیا لە رێــڕەوی نهێنــی وشــاراوەی گروپــە خــاوەن بەرژەوەندیــەکان بــەدی دێــت و بەدیهاتنیشی بەمانای بەدەست هێنانی ناوبانگ و مسداقیەتی گشتیە بۆ کــەس یــان بابەتــە تایبەتەکان و بەدەست هێنانی رەزامەندی و تەئیدی گشتیە لە فەزای رای ناگشتی دا.[٣١٦]

سیمای پانتایی گشتی سیاسی دەوڵەتی خۆشگوزەرانی کۆمەلآیەتی، لاوازبوونی نائاسایی ئەرکە ڕەخنەگرانەکەیەتی، کــە ســەردەمێك ئامــانجی پرۆســسی ئاشــکراکردنی *Publizität* هەنگاوەکان، کۆتوبەندکردنی کەس یان دۆخەکان بە عــەقڵی گشــتی و کــۆت کردنــی بڕیــاری سیاسی بە دادگای ڕای گشتی بوو، بەلاّم ئێستا زۆربەی کاتەکان پرۆسسی ئاشکرا کردن تــەنیا لە خزمەت سیاسەتی شاراوەی بەرژەوەندی تایبەتی دایــە.[٣١٧]هاوکــاری دارایــی هاوولآتیــان و زەمانەتی کۆمەلآیەتی فاکتەرێکی تری تەکریسی بەهێزبوون و مەشروعیەتی دەسەلآتە کە بــە شێوەیەکی لەسەرخۆ تاکی راکێشا بــەرەو ناوەنــدی خــۆی و لێرەشــەوە دەســتی گــرت بەســەر ژینگەی گشتی کۆمەلآیەتی دا.[٣١٨] کەواتە دوای گۆڕانی رۆلی پانتایی گشــتی سیاســی وەك شوێنێك بۆ کەسە دیارەکانی کۆمەڵگا و مشــتومڕ و گفتوگــۆ لەســەر کێشــە و گرفتــەکان و لەناوچوونی ئەم پانتایە دیسان رۆلی هەندێ دەزگای سیاسی ویاسایی وەك پەرلەمان وحزبەکان گرنگیان وەرگرتەوە، بەلاّم هابرماس رایوایە ئیــدی پەرلــەمان شــوێنی گفتوگــۆی عــەقلانی-رەخنەیی و تەحەدا کردنی دەسەلآت نییە، بەڵکو کۆمــەڵێك کەســی دەستنیشــان کــراون کــە

---

* لێرە دا هەست بە کاریگەری گەورەی نەوەی یەکەمی قوتابخانەی فرانکفۆرت و بەتایبەی فکری هۆرکهایمەر و ئەدۆرنۆ دەکرێت لەسەر هابرماس ولە باسی یەکەم دا بە درێژی ئاماژەمان بۆکردووە.

٣١٦. یورگن هابرماس، سەرچاوەی پێشوو، ل٣١٤.-Jürgen Habermas, op. Cit., p. 201.

٣١٧. یورگن هابرماس، سیطرە عمومی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٧١.

٣١٨. علاء طاهر، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٣.

بڕیارە لەپێش دا داڕێژراوەکان دەنووسنەوە. حزبەکانیش چیتر ناتوانن نوێنەری رای گشتی بن و تەنیا لە ناو کۆڕوکۆبوونەوەکانیان لایەنی هەستوسۆزی جەوماوەری خۆیان دەجولێنن، بەم جۆرە جەماوەر بووە بە ئامرازی پڕوپاگەندە وبێ ئەوەی بەشدار بێت لەدروست کردنی بڕیاری سیاسی تەنیا وەك فاکتەری شەرعیەت بەخشین بەدەسەلاّت رۆلّ دەگێڕێت. دەولّەتی خۆشگوزەرانی کۆمەلاّیەتی ناچاربوو درێژە بە نەریتی لیبرال بدات، چونکە ئەویش لایەنگری نەزمی یاسایی بوو، بەلاّم کێشەکە لەوە دابوو دەولّەت وەك هەلّگری نەزمی کۆمەلاّیەتی هاتە پێش و ویستی لە رێگای دەستوەردانەوە دادپەروەری دابین بکات.[319] بەم جۆرە دەتوانین بلّێین دوو ئاراستەی نەیار نیشانەی دیاری پانتایی گشتی سیاسی لە دەولّەتی خۆشگوزەرانی کۆمەلاّیەتی دا بوو:[320]

١. بەهێزکردنی گشتیەتێکی هەلّخەلّتێنەرانە کە رێکخراوەکان نمایشی دەکەن.

٢. پاراستنی جۆریك لە وەکالەت و سەیتەرەی پانتایی گشتی سیاسی، واتە پانتایەك کە تێیدا دەتوانێت لە رێگای رێکخراوەکانەوە درێژە بە پرۆسسی رەخنەیی پەیوەندی گشتی بدات. ئەمەش لەگەلّ خالّی یەکەم دا دژ دەکەوێتەوە.

## ٢. رای گشتی:

لێرەوە چەمکی رای گشتی *Public Opinion* گرنگی خۆی لە پەیوەندی لەگەلّ شێوازی گشتیەتی بەکارهاتوو دا وەردەگرێت، ئەو گشتییەتەی کە تیایدا دەسەلاّتی ڕەخنەیی ڕای گشتی لە چاودێری کردن بەسەر شێوازی پیادەکردنی دەسەلاّتی سیاسی وکۆمەلاّیەتی دا جەختی لەسەر دەکرێتەوە ، یان ئەو گشتیەتەی کە کە لە میانی دا هەولّ دەدرێت لە ڕێگای پروپاگەندەی هەلّخەلّێتەرانە و نمایشی ساختەیی دا ڕای گشتی دروست بکرێت وبخرێتە خزمەت کەس ودەزگاو بەرنامەو کالاّ ئیستهلاکییەکان. ستراتیژی هابرماس ئەوەیە کە چەمکی رای گشتی کە رۆلّێکی سیاسی بە ئەستۆوە گرتبوو پەیوەست بکات بە رەگە مێژوویەکانی خۆی لە چوار چێوەی پانتایی گشتی دا بەو هیوایە کە تێگەیشتنێکی سیستەماتیك سەبارەت بە کۆمەلّگای رۆژئاوا بەدەست بێنێ.[321] بەم شێوەیە دەتوانین لە دوو روانگەوە سەیری رای گشتی بکەین:

---

٣١٩. یورگن هابرماس، دگرگونی ساختاری حوزە عمومی، سەر چاوەی پێشوو، ل ٣٤٨.-Ibid.,p.225.

٣٢٠. هەمان سەرچاوە، ل ٣٥٩-٣٦٠.. ٢٣٢ -Ibid.,p.

٣٢١ . ویلیام اوث وایت، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٨.

١. هەڵوێستی لیبرالیزم کە دەیەوێت لە هەناوی پانتایی گشتی کە خەریکە لەناو دەچێت ڕەوتێکی پەیوەندییانەی بازنەی ناوەکی نوێنەرەکان زیندوو بکاتەوە، ئەو نوێنەرانەی دەتوانن لە قاڵبی (جەماعەت) ڕای گشتی دروست بکەن، واتا دەیانەوێت لە هەناوی گشتیەتی دروستکراو و نمایشی، ئەو جەماعەتە ڕەخنەگرە ڕزگار بکەن کەخەریکی گفتوگۆی گشتین.

٢. پەیوەستە بە شێوازێك لە ڕای گشتی کە پێوەرە بنەماییەکانی وەك عەقلانییەت و نوێنەرایەتی (تمثیلی) بە لاوە دەنێت، پشت بە پێوەرە دەزگاییەکان دەبەستێت، وەك ڕوانگەی ناو پەرلەمان کە رای گشتی لە ڕێگای وتووێژی ناو پەرلەمان داخوازییەکانی خۆی بە حکومەت ڕادەگەیەنێت وحکومەتیش سیاسەتەکانی خۆی بۆ رای گشتی ئاشکرا دەکات.[٣٢٢]

بە پێی ئەم بۆچوونە هەموو حزبەکان بە دەسەڵاتدارو ئۆپۆزسیون لە ناو پەرلەمان دا تەعبیر لە ڕای گشتی دەکەن وبەم جۆرە لە ڕێگای دەزگاکانەوە دەکرێت خواستەکانی خەڵك گەلاڵە بکرێت، بەلاّم لە ڕوانگەی هابرماسەوە گرفتی ئەم بۆچوونە لەوەدایە کە بڕوای بە(گشتییەت) نییە کە ڕای گشتی دروست دەکات. ئەوەی لەم نێوە دا سەرنجی هابرماسی بۆ چەمکی پانتایی گشتی راکێشاوە لە رابردوو و ئیستا دا گرنگی ئەم چەمکەیە وەك بنەمایەك بۆ رەخنەگرتن لە کۆمەڵگایەك کە لەسەر پرەنسیپی دیموکراتی دامەزراوە، «چونکە هەر وەك ئاشکرایە پانتایی گشتی بوارێکە کە تاکەکان لە پێناو بەشداری لە گفتوگۆی کراوەو راشکاوانە دا لە دەوری یەکتر کۆدەبنەوە».[٣٢٣] بە رای هابرماس تاکە پێوەری حوکمدان لەسەر دیموکراتیزەبوونی کۆمەڵگای پیشەسازی لە چوارچێوەی دەوڵەتی خۆشگوزەرانی کۆمەلاّیەتی ڕێکخراو دا، پلەی ئەم گشتیەتە رەخنەییە — بە واتایەکی تر: بەعەقلانی بوونی پیادەکردنی دەسەلاّتی سیاسی کۆمەلاّیەتی.[٣٢٤] بەم جۆرە بۆمان دەردەکەوێت کە یەکێك لە هۆکارەکانی نەمانی پانتایی گشتی لە دەوڵەتی دەستووریی لیبرال ئەو وەهمە بوو کە سەقامگیر کردنی پانتایی گشتی وەك ئۆرگانێکی دەوڵەتی (بۆ نموونە پەرلەمان) نیشانەی بەدیهاتنی راستەقینەی ئەم پانتایەیە لە بواری سیاسی دا، بەلاّم دەوڵەتی پابەندی مافە کۆمەلاّیەتیەکان ئەم وەهمەشی بەلاوە نا. لەراستی دا پەرلەمان هەر لەسەرەتاوە لەگەڵ ئەم دژایەتیە بەرەوڕوو

---

٣٢٢. یورگن هابرماس، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٧٠- ٣٧١. . Ibid.,pp.238-239-

٣٢٣. رابرت هولاب ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٥-٢٦.

٣٢٤. یورگن هابرماس، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٦٠. Ibid.,p.232.-

بۆتــەوە کــە « هــەم دەزگایەکــە لــە بەرانبــەر دەســەلاّتی سیاســی و هــەم خــۆی فــۆرمێکی دەسەلاّتە». [325] پانتایی گشــتی لــە دیموکراســی جــەماوەری دا کــاتێ دێتــە دی کــە بنــەمای رێکخستنی سەرلەنوێی عەقلانیانەی دەسەلاّتی سیاسی و کۆمەلاّیەتی پابەندی پانتایی گشتی بــێت لەژێر کۆنترۆلی دوولایەنەی رێکخراوەکان و لە پەیوەنــدی لەگــەلّ دەولّــەت و لەگــەلّ یــەکتریش دا. [326] واتە پابەندی مشتومڕی عەقلانی — رەخنەیی کراوە و خســتنەڕووی ئــەرگۆمێنتی بــەهێز بــن. پانتایی گشتی کە وەك قۆناغێکی مێژوویی لە کۆمەلّگای سەرمایەداری سەری هەلّداوە، بوارێکی ئازاد ببووە بۆ رۆلّی رەخنەیی - عەقلانی تاکە تایبەتەکان و هاوولاّتیان لەم پانتاییــە دا هــەولیان داوە لــە پرۆسسێکی دیموکراتی و لە رێگای راوێژ و راگۆرینەوە بنەماکانی ئەم مەیدانە بەهێز بکەن و « دەشێت لە میانی توێژینەوەکەی هابرماس هەست بە سۆزێك بکەین بــۆ قۆنــاغی ســەرمایەداری بــەرایی کــە دەتوانین بە پێی قسەکانی ئەو سەرەتاکانی دروست بوونی "رای گشتی" راستەقینە بدۆزینەوە». [327] کە بێ جیاوازی توانیویەتی شەرعیەتی دەولّەت بخاتە ژێر پرسیارەوە و بەردەوام وا لەدەســەلاّت بکــات لــە هەموو جولّەیەکی خۆیدا بەدوای پاساوی رازیکەر دا بگــەرێت. ئەمــە بــووە هــۆی ئــەوەی فەزایــەکی دیموکراتی بێتە ئاراوە کە تێیدا "دەسەلاّت" و "بەرگری"هەمیشە کارلێك بکەن. لەگەلّ چوونە ناویەکی پانتایی تایبەتی و دەولّەت ئەم فەزایەش لەناوچــوو. ســەرەڕای نــەمانی ئــەم پانتاییــە بــەلاّم هێشــتا ئەگەرەکانی دروست کردنی لە ئارادان و هەرلە درێژەی ئەم بایەخ پێدانەدا هابرماس هــەولّی داوە لــە سەردەمی هاوچەرخ لەسەر پەیوەندی ئایین و پانتایی گشتی لێکۆلّینەوە ئەنجام بدات.

### ٣. رۆلی ئایین لە پانتایی گشتی دا:

هابرماس ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کــە لــە ســەردەمی ئێســتا دا رەوتێکــی ئەرتــەدۆکس و فیندێمنتالیزمی ئایینی رووی لە گەشەیە کە لەیەك کات دا هــەم ئیســلام هــەم مەســیحیەت تێیدا بەشدارن و بە رای ئەو «هێرشەکانی ١١ سپتامبــەر و دژکردەوە عەجولانــەی بەرانبــەری نابێ سەرنجمان لەو راستیە بەلاڕێ دا بەرێت کە بەرفراوان بوونی بیروباوەری ئــایینی عیســەوی

---

٣٢٥ . هەمان سەرچاوە، هەمان لاپەڕە. Ibid.,p.233. -

٣٢٦ . یورگن هابرماس، سیطرە عمومی، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٧٢.

٣٢٧ . ایان کریب، النظریة الأجتماعیة من بارسونز الی هابرماس، ت: د. محمد حسین غلوم، مراجعة: د. محمد عصفور، عالم المعرفة، الکویت، ١٩٩٩، ل ٣١٤.

لەرووی بەربلاوی و توندی کەم بایەختر نییە لە گەشەی عەقیدەی ئیسلامی».[328] هابرماس پرسی توندوتیژی تاوتوێی دەکات وەك جۆرێك لە پەیوەندیکاری شێواو و سەبارەت بە ئەرکمەند کردنی ئایین لە ململانێکان و رادەی کاریگەری لەسەر سۆلیدارێتی و یەکانگیری (الأندماج) کۆمەلایەتی هوشداری دەدات و دەڵێت: « تیرۆر رەگی خۆی هەیە و دەبێ بەسەری دا زاڵ بین، کۆڵگەکانی تیرۆر بریتین لە هەژاری و هەست کردن بە سوکایەتی، بەلام جەنگ چارەسەری گونجاو نیە بۆ نەهێشتنی تیرۆر».[329] هەربۆیە هەوڵ دەدات لە روانگەیەکی ریفۆرمیستیەوە کە پەیوەستە بە بنەماکانی دیموکراسی تێگەشتنی خۆی سەبارەت بە پەیوەندی هاوولاتیانی دیندار و عەلمانی بخاتەڕوو. بە بۆچوونی هابرماس فۆرمۆلەبوونی ئازادی ئایینی وەلامێکی سیاسی گونجاوە لە بەرانبەر تەحەدای پلۆرالیزمی ئایینی. لەگەڵ ئەوەش دا تایبەتمەندی عەلمانیەتی دەوڵەت مەرجێکی پێویستە بەلام بەس نییە بۆ گرەنتی کردنی ئازادیی یەکسان بۆ بیروباوەڕی ئایینی هەموو تاکەکان. بەم جۆرە رێبازی دادپەروەرانە بریتیە لە شێوازی فۆرمۆلەکردنی ئیرادەی گشتی لە رێگای گفتوگۆی دیموکراتیانە. رێبازی دیموکراسی بە سوودوەرگرتن لە دوو توخم دەتوانێ ئەم شەرعیەتە عەلمانیە بینێتە ئاراوە:[330]

١- بەشداری سیاسی بۆ هەموو هاوولاتیان کە گرەنتی ئەوە دەکات ئەوانەی یاسایان بۆ دادەنرێت لە هەمان کات دا نووسەری یاساکانیش بن.

---

٣٢٨ . یورگن هابرماس، دین در عرصه عمومی ، لە رێکەوتی ٢٨ نۆڤەمبەری ٢٠٠٥ ئەم وتارەی پێشکەش کردووە لە کاتی وەرگرتنی خەلاتی هولبێرگ لە نەرویج. ل ٢ لە ١١ لەم سایتەی خوارەوە وەرگیراوە ، لە رێکەوتی ٢٠٠٩/٧/٢٢ ،

-http://www.maghal.com/bank/?p٧٤=

(هەروەها لە کتێبی ئاییندەی سروشتی مرۆیی لە بەشی (ئیمان و مەعریفە) واتە ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە ئاماژەی بۆ کردووە: Jurgen Habermas ,The Future of Human Nature ,Polity - press,Cambridge,UK,2003.

٣٢٩ . ابراهيم الحيدري، هابرماس الفيلسوف الألماني: هناك اورثودكسية متحجرة في الغرب كما في الشرق، جريدة الشرق الأوسط، ٢٣/اكتوبر/٢٠٠١، العدد ٨٣٦٥. ل ١٠.

٣٣٠ . یورگن هابرماس، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤ لە ١١.

٢- ڕەهەندی ئەپستمۆلۆژی بیرکردنەوە کە بنەمای قبـوڵکردنی دەرەنجامـە پەسـندکراوە عەقڵیەکانە.

بەرای هابرماس هەلومەرجی بەشداری سەرکەوتوانەی هاووڵاتیـان، ئـەخلاقی هاووڵاتیـان پێناسـە دەکـات وپێویسـتە بـەجیاوازی بـیروڕای ئـایینی وەك ئەنـدامی ئـازاد و یەکسـانی کۆمەڵگای سیاسی ڕێز لە یەکتر بگرن و لە سەر پرسە سیاسـیە کێشـە لەسـەرەکان بەڵگـەی گونجاو بخەنەڕوو. هەربۆیە سەبارەت بە دیندار و عەلمانیەکان کۆمەڵێك پێش گریمانە پێشـکەش دەکات:[٣٣١] سەبارەت بە هاووڵاتیانی مەسیحی ئاییندار ئەم خاڵانە دەخاتەڕوو:

أ. دەبێ لە بەرانبەر ئایین و جیهانبینیەکانی تر دا ئاراستەیەکی ئەپسـتمۆلۆژی بێننـە ئاراوە.

ب. دەبێ سەبارەت بە سەربەخۆیی مەعریفەی عەلمانی لە مەعریفەی پیرۆزی ئـایینی و مۆنۆپۆلی بەدەزگایی کراوی زانستی نوێ لە بواری ئەوەی ئێمە لەسەر دەوڵەت و ڕووداوەکانی جیهان دەیزانین هەڵوێستێکی ئەپستمۆلۆژی بێننە گۆڕی.

ج. دەبـێ سـەبارەت بـەو بابەتانـەی کـە بەڵگـە عەلمانیـەکان لـە پانتایـە سیاسـی و کۆمەڵایەتیەکان خاوەنیانن هەڵوێستێکی ئەپستمۆلۆژی بگرنەبەر.

هابرماس هەر بەوەندە ناوەستی بـەڵکو بـە بۆچـوونی ئـەو نـابێ وەك هەنـدێ ڕێـورەسمی لەناوچوو سەیری ئایین بکرێ ، هەربۆیە لـە بەرانبـەر عەلمانیـەکانیش هەنـدێ پـێش گریمانـە دەخاتەڕوو کە بۆ پابەندبوون بە مەدەنیەت و سوود وەرگرتنی گشتی لە بەڵگەکان پێویستن:

أ. لە ژێرسایەی ئەخلاقی لیبرالی هاووڵاتی بووندا، نـابێ هاووڵاتیـان بـێ چـوونە نـاو گفتوگۆ، نکۆڵی لە ناوەرۆکی ئیدراکی بۆچوونەکان بکەن.

ب. ڕەفتارێکی باوکسالارانە و نامەدەنیـە ئەگـەر عەلمانیـەکان بـێ تەرجەمـە بـوونی ناوەرۆکی بۆچوونی ئایینی کە دەرکەوتنی شتێکی لۆژیکیە، لە هەڵسەنگاندن بێبەشی بکەن.

ج. لە غیابی ئەم ئاراستە ئەپستمۆلۆژیە ناتوانین چاوەڕوانی بـەکارهێنانی گشـتی عـەقڵ بین.

هابرماس بۆچارەسەرکردنی ئەو گرفتە گەورەیەی ئیستا لە جیهان دا لە ئارادایە لە نێـوان ڕوانگەی ئایینی بۆ ژیان و زانست و ئەخلاق و ئاراستەی عەلمانی و دروست کردنی پانتایەك بۆ

٣٣١. هەمان سەرچاوە، ٧و٨ لە١١.

دیـالۆگی دیمـوکراتی و لێـك تێگەیشـتن، بیرۆکـەی عـەقڵیەتی"پۆسـت میتـافیزیکی post-methaphisic" دەخاتەڕوو.

لە روانگەی هابرماس  بیرۆکەی پۆست میتافیزیکی بەبێ هـیچ مەبەسـتێکی دروشمـاوی، هێڵێکی رۆشن لـە نێـوان ئیمـان و مەعریفـە وێنـە دەکێشـێت و لـە هـەمان کـات دا دژی تێگەیشتنی سنووردار و زانستیە بۆ عەقڵ و دژی وەدەرنانی تیـۆرە ئایینیەکانـە لـە پانتـایی جینالۆژی عەقڵدا. بێگومـان بیرۆکەی"پۆسـت میتـافیزیکی" دژی دەربڕینـی بیروبۆچـوونی ئەنتۆلۆژیە سەبارەت بە بونیادی هەمەکیەتی بوونەوەرەکان، بـەلاّم لـە هـەمان کـات دا دژی زانستپەرستیە کە لە هەموو سەردەمەکان مەعریفەی ئێمـە تـا رادەی دوایـین دۆزینـەوەکانی زانستی ئەزموونی دادەبەزێنێ. نابێ "پۆست میتافیزیك" تەنیا سوود لە میراتی فەلسـەفەی رۆژئاوا وەربگرێت بەڵکو دەبێ هەوڵی دۆزینـەوەی پەیوەندیـەکی نـاوەکی بـدات لەگـەڵ ئـەو ئایینانەی کە رەگەکانیان بۆ ناوەڕاستی هەزارەی یەکەمی پێش زایین دەگەڕێتەوە.[٣٣٢] بەم جۆرە هابرماس لەسەر ئەو بڕوایەیە کە بیرۆکەی "پۆست میتافیزیك" دەتوانێ بزوێنـەرێکی گونجـاو بۆ داهێنان و کەشفی جیهان و رزگـاری بدۆزێتـەوە. ئەمـەش لـە رێگـای پرۆسسـی لەیـەکتر فێربوون و خستنەڕووی ئەرگۆمێنت، چونکە لە دیدی هابرماسـەوە جگـە لـە ئـامرازی مـاف وسیاسـەت لـە دەوڵـەت دا هـیچ ئـامرازێکی تـر بـۆ جێبـەجێ کردنـی ئـەرکی مـەدەنی و بەکارهێنانی گشتی عەقڵ نامێنێتەوە. ئەم تێڕوانینەی هابرماس هەڵقولاّوی  کلتورێکـە کـە زانستگەرایی و عەلمانیەت تێیدا بالاّدەستن، بەلاّم ئەگەر لە دونیای هەژمونی فیکری دینیەوە سەیری بکەین کە مەعریفە دادەبەزێنرێت بۆ زنجیرەیەك حیکایەت ئەوا کێشـەکە رەهەنـدێکی قوڵ وەردەگرێ کە ئاستەمە بێ زیندوو کردنـەوەی رۆحـی فەلسـەفی ئـایین، ئـەم پەیوەندییـە دروست بکرێت.  لەکۆتایی دا زۆرێك لە تەوژمە سیاسی و فکرییەکان رەخنەیان ئاراستەی ئەم توێژینەوە فەلسەفی و فکرییـەی هابرمـاس کـردووە: مارکسـیەکان رایـان وایـە کـە لـەرووی شیکردنەوەی چینایەتی کەموکورتی تێدایە. لە روانگەی فێمینیستەکان، جنسیەتی وەبەرچـاو نەگرتووە و لیبرالە کۆنسێرڤاتیڤەکان بە گشتی جەخت لەسەر بەرژەوەندی تایبەتی دەکەنەوە لە بەرانبەر چەمکی ئیرادەی گشتی دا.[٣٣٣] سەرەڕای هەموو ئەو رەخنانەی ئاراسـتەی هابرمـاس

---

٣٣٢. هەمان سەرچاوە، ل ١٠ لە ١١.

٣٣٣ . ویلیام اوث وایت، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣.

کراون بەڵاّم هێشتا توێژینەوەکەی سەبارەت بە سنووورداری دیموکراسی نوێنــەرایتی جــەماوەری کە پشت بە چەندایەتی و زۆری ژمارەی دەزگاکان دەبەستیٚ نەك رادەی بەشداری هاووڵاّتیان لە پرۆسسی دروست کردنــی بڕیــار دا راســتە، چــونکە ئیســتا کۆمپانیــا گــەورەکانی میــدیا و چاپەمەنی بە ئاسانی دەتوانن کاریگــەری لەســەر تێڕوانینــی تاکــەکان و جــەماوەر دابنــێن و ئاراستەی رای گشتی بگۆڕن، هــەر بۆیــە «وێــڕای ئــاڵۆزبوونی شــێوازەکانی بەرهــەمهێنان و گەشەی تەکنیك، کە دەزگا نوێیەکان لەسەر بنەمای ئەرکی کەلتووری نویٚ دروستبوون، بــەڵاّم پەرەسەندنی ئامرازی پەیوەندیکاری نــویٚ و میــدیا نــەبووە هــۆی بــەرفراوان بــوونی پانتــایی گشتی».[334] بەڕای هابرمــاس هێشــتا ئــەرکی پانتــایی گشــتی- واتــە گفتوگــۆی عــەقلاّنی هاووڵاّتیان سەبارەت بە پرسی خۆشگوزەرانی گشتی لە لە فەزایەکی بەدوور لە هــەموو جــۆرە بەرتەســکی و ســنووورداریەك شــتێکی زەرووریــە.[335] دەشــێت ســەبارەت بــە سیســتەمە تۆتالیتارەکاننیش ئەوە بڵێین کە لە فەزای داخراوی سیاسی دا بەرگری وەك بەشێك لە پانتایی گشتی لە مەیدانە نارەسمیەکان دا خۆی دەردەخات. بەوتەی (میشل فۆکۆ) لە هەر جێگەیــەك دەســەڵاّت هــەبیٚ بــەرگریش هەیــە. «فۆکــۆ پێیوایــە دەســەڵاّت وەك یــەکێك لــە مەرجــە سەرەکیەکانی پیادەکردنی خۆی، پێویستی بە بەرگری هەیە. لە رێگای دەرکەوتنی خاڵــەکانی بەرگرییە کە دەسەڵاّت لە سەرانسەری پانتایی کۆمەڵاّیەتی دا بلاّو دەبێتەوە».[336]

لێرە دا پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە لە سیستەمە ستەمکاری و نادیموکراتیەکانیش دا لە رێگای خەباتی نهێنی و چالاکی و رێکخستنی سیاسی نارەسمی جۆرێك لە پانتــایی گشــتی و دەرکەوتەیەکی ئەم بیاڤــە بــوونی هەیــە کــە ئەگەرچــی بــەردەوام دەســەڵاّت هــەوڵ دەدات بیشێوێنیٚ یان داگیری بکات، لیٚ هەمیشە تــوخمی بــەهێزی گفتوگــۆی رەخنــەیی و زۆر جــار عەقلاّنیشی تێدایە.

دەشیٚ سەبارەت بە کۆمەڵگا ئاڵۆز و هاوچەرخە پێشــکەوتووەکانیش بڵــێین کــە ئێســتا لەسەردەمی تەکنەلۆژیای گەیاندن و زانیاری دا بەکەمی پانتــایی گشــتی وەك بــواری وتووێــژ

٣٣٤ . بابك احمدی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٩٢.

٣٣٥ . پتر هوهندال، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٧٦.

٣٣٦. هیوبرت دریفوس ، پل رابینوا، میشل فوکو فراسوی ساختگرایی و هیرمنیوتیك ،ت: حسین بشیریە، نشر نی، چ ٣، تهران، ١٣٨٢(٢٠٠٣)، ل ٢٦٠.

سەیری دەکرێت، بەڵکو «گرفتەکان وەك کێشەی تەکنیکی سەیر دەکرێن کە لەلایەن عەقلانییەتی ئامرازی و شارەزاکانەوە چارەسەر دەکرێن»[337] لەم کۆمەڵگایانە دا دەسەڵاتی سیاسی بەشێوەیەکی زۆر بیرۆکراتیزە کراوە، کە کەمتر دەرفەتی گفتوگۆی کراوە دەدات، بەلاّم هێشتا هەوڵی هابرماس دەتوانێ دوو بابەتی گرنگ لەخۆ بگرێت:[338]

١) رەخنەگرتن لە ئایدۆلۆژیای تەکنۆکراتی.

٢) هەوڵدان بۆ دارشتنی بناغەیەکی فکری و کردەیی بۆ گفتوگۆی گشتی و کۆنترۆلی کاریگەرییەکانی سیاسەتی حکومی.

لەدیدی هابرماسەوە پانتایی گشتی، پانتایی گفتوگۆی عەقلانی — رەخنەییە کە دەکەوێتە نێوان دەوڵەت و پانتایی تایبەتی و لە مێژوو ئەوروپا و لە زەومەنێکی دیاریکراو دا سەری هەڵداوە. لەم پانتاییە دا رەچەڵەك و شوێنگەی کۆمەلاّیەتی دەخرێنە پەراوێزەوەو تاکەکان خۆیان لە چوارچێوەی گشتێکی عەقلانی دا رێکدەخەن کە بەردەوام دەتوانن تەحەدای بریار و فەرمانەکانی دەسەلاّتی بکەن و هەوڵی شەفافیەت و ئاشکراکردنی سیاسەتەکانی بدەن. ئەم گشتە جیاوازە لە جەماوەر یان عامەی خەڵك، چونکە زیاتر گوزارشت لە هوشیاری گشتی دەکات کە توانیویەتی ئەرگۆمێنتی عەقلانی بۆ خواستەکانی بخاتەروو، بەلاّم لەناو چوونی دەوڵەتی لیبرالی دەستووری و هاتنەئارای دەوڵەتی خۆشگوزەرانی کۆمەلاّیەتی و دەسوەردانی دەوڵەت لە پانتایی تایبەتی بەناوی دادپەروەرییەوە کە دواجار بۆتە هۆی بە کۆمەڵگایی کردنی دەوڵەت و بە دەوڵەتی کردنی کۆمەڵگا و لەوێشەوە بە فیودالی کردنی ئەم پانتاییە و زاڵ بوونی جەماوەری بێ کالاّ و بێ بەرهەم ئەم پانتاییەی وێران کردووە.

ئەمرۆش لە سەردەمی بەجیهانیبوون و کاڵ بوونەوەی سنووره سیاسیەکان، جۆرێك لە پانتایی تۆری جیهانی ئینتەرنێت سەریهەڵداوە کە وایکردووە بوارێکی مەجازی بۆ کارلێك وگفتوگۆ بێتە ئاراوە. لەم فەزایە دا کە خاوەن هەندێ تایبەتمەندی وەك «ناناوەندی بوون، پارچە پارچەبوون، مەجازی بوون و جیهانیبوون وکارلێکی بوونە»[339] ، شکاندنی چوارچێوەکانی دەسەلاّت، فۆرمێکی نوێی بەخۆوە گرتووە و تێکشکاندنی میراتی چەقبەستوو

---

٣٣٧. ایان کریب، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣١٤.

٣٣٨. ویلیام اوث وایت، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٢.

٣٣٩. عوضعلي سعادت، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣ لە ١٣.

و کەڵەکەبوونی دەسەڵات و میکانیزم و شێوازەکانی پیادەکردنی بە پشتیوانی هێزی ئـابووری زەبەلاح گۆڕانی بەسەر دا هاتووە. لێرەدا خاڵەکانی "بەرگری" بەمانا فۆکۆییەکەی شوێنگەیان گۆڕاوە و دەسەلاّتی ناوخۆیی بـە زەحمـەت دەتـوانێ کـۆنترۆڵی بکـات. سـەبارەت بـە رۆڵـی ئەنتەرنێت وەك پانتاییەکی مەجازی بۆ دروست بوونی گفتوگۆ و کارلێکی رەخنـەیی دەتـوانین ئاماژە بە دوو نموونە بکەین کە یەکەمیان بلاّوبوونەوەی بەڵگەنامەکانی سایتی "ویکیلیکس" بوو کە سەرەڕای گرنگی و هەستیاری بەڵگەنامەکان نەیتوانی رایەکی گشتی دروست بکـات و هەر زوو حکومەتەکان لە ئاسـتی جیهـانی دا پشـتی یـەکتریان گـرت بـۆ راگرتنـی رەوشـی هەنووکەیی. نموونەی دووەم راپەڕینی گەلانی رۆژهەلاّتی ناوەڕاست و "بەهاری عەرەبی"یە کە بە "شۆڕشی فەیسبووك facebook "و "مۆبایل" ناسراوە، لێـرەدا لـە رێگـای ئـەم تـۆڕی جاڵجاڵۆکەوە رایـەکی گشـتی و کـارلێکێکی ئـەوتۆ دروسـت کـرا کـە بـووە هـۆی گـۆڕینی سیستەمی سیاسی و مۆدێلێکی نوێی لە شۆڕش کە دروشمە سەرەکییەکانی بریتیـی بـوون لـە ئازادی و کەرامەت و یاسـەروەری و دادپـەروەری و رۆحـی بەرگرییەکەشـی بـۆ هێـزی دژە دەسەلاّتی بزاڤ و رەوتە ئیسلامییەکان دەگەڕێتەوە کـە لـە دوای شکسـتی ئـەزموونی چـەپ بەهێزترین خاڵی بەرگری بووە لە بەرانبەر سیستەم و دەسەلاّت دا هەرچەندە لە گوتارییـان دا ئیشکالیەتی گەورەی دەسەلاّتی دژە دەسەلاّتە و تاکڕەهەندی لە جیهانبینیان دا دەبینرێت کـە ئاستەمە بتوانێ لەگەڵ ناوەرۆکی دروشمەکانی شۆڕش دا هەڵبکات.

# باسی یەکەم

## تیۆری دیموکراسیی راوێژگەری

دیموکراسی راوێژگەری یەکێکە لەو مۆدێل و نموونانەی دیموکراسی کە بەشێوەیەکی جدی لە سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی بیستەوە لە لایەن هەندێ بیرمەند و فەیلەسوفی سیاسیەوە لە چوارچێوەی دارشتنی هەندێ تیۆری تایبەت دا خراوەتەڕوو کە لە توێژینەوەو قسەکردن لەسەر پەیوەندی نێوان دیموکراسی و دادپەروەری هاتۆتە ئاراوە. مۆدێلی دیموکراسی راوێژگەری تەنیا پشت بە دەنگدان و پرەنسیپی زۆرینەو کەمینە نابەستێت و بەتەنیا تەفزیلاتی تاکەکان بەس نییە، بەڵکو لە دیموکراسی راوێژگەری بەر لەوەی هەر کێشە یان پرسێك بخرێتە پرۆسسی دەنگدانەوە دەبێت راڤە وشیکردنەوە بۆ خیارەکان بکرێت و بۆچوونە جیاوازەکان لە میانی دیالۆگی کراوەدا تاوتوێ بکرێت، چونکە وەرگرتنی بڕیار لە پرۆسسی سیاسی دا پەیوەندی بە ژیانی هەموو تاکەکانەوە هەیە، لەم نێوەندەدا تەنیا پشت بەستن بە دەنگدان وژمارە بەس نییە بۆ بریاردان لەسەر چارەنووسی هاوولاتییان ، بەڵکو بەڵگەخوازی و ئەرگۆمێنتی دروست دەتوانێت کاریگەری لەسەر ئاڕاستەی بڕیارەکان هەبێت.

## تەوەری یەکەم: چەمکی دیموکراسیی راوێژگەری Deliberative Democracy

بەڕای (سیلا بن حەبیب)* پاش جەنگی دووەمی جیهانی لە کۆمەڵگای مۆدێرنە و دیموکراسیە ئاڵۆزەکاندا بەدیهێنانی سێ خێری گشتی *Public Goods* بوو بە ئەرکی سەرەکی ئەو کۆمەڵگایانە ئەوانیش بریتین لە ١- شەرعیەت ٢- خۆشگوزەرانی ئابووری ٣- شوناسی هاوبەش.[٣٤١] لە روانگەی سیلاوە ئەوەی لەم نێوەدا گرنگە پرسی شەرعیەتە بە بەراورد لەگەڵ دوو ئەرکەکەی تر و پەیوەستی دەکات بە دیموکراسی لای ئەو «دیموکراسی مۆدێلێکی رێکخستنی مارەسەکردنی گشتی دەسەڵاتە لە دەزگا سەرەکییەکانی کۆمەڵگادا، لەسەر ئەم بنەمایە کە بڕیارەکان کاریگەرییان هەیە لەسەر خۆشگوزەرانی گشتی و دەکرێت وا لێی بڕوانیت کە (مخرجاتی) ئیجرائاتی تەشاورێکی عەقلانی و ئازادانەیە لە نێوان تاکەکان وەك یەکسانی سیاسی ئەخلاقیی».[٣٤٢]

بیرۆکەی سەرەکی لە شەرعیەتی دیموکراسی بریتییە لەوەی کە سپاردنی پیادەکردنی دەسەڵاتی دەوڵەت پێویستە لەسەر بنەمای بڕیاری بەکۆمەڵی(جماعی) ئەو ئەندامانەی

---

* سیلا بن حەبیب Seyla Benhabib لە ساڵی ١٩٥٠ لە ئەستانبول لە دایك بووە، بەڕەگەز یەهودی تورکیایە و مامۆستای فەلسەفە و زانستە سیاسیەکانە لە زانکۆی ییل و بەڕێوبەری بەرنامەی ئەخلاق و سیاسەت و ئابووری بووە، پێشتر مامۆستا بووە لە بەشی فەلسەفەی زانکۆی بۆستن، زانکۆی ویلایەتی نیویۆرك ستونی برۆك، قوتابخانەی نوێی توێژینەوە کۆمەڵایەتیەکان و بەشی حکومەت لە زانکۆی هارڤارد. خاوەن گەلێك کتێبە بە تایبەتی سەبارەت بە فەلسەفەی یورگن هابرماس و هانا ئارێنت و بە ناوبانگە بە لێك گرێدانی تیۆری رەخنەیی و تیۆری فێمێنیستی. لە ساڵی ئەکادیمی ٢٠٠٨-٢٠٠٩وە ئەم خانمە هاورێی (زمیلە) ئەنیستیتوتی توێژینەوەی پێشکەوتووە لە بەرلین. هەندێ لە کتێبەکانی بریتین لە: **کۆسمۆپۆلیتانیزمێکی تر**(چاپی زانکۆی ئۆکسفۆرد ٢٠٠٦)، **مافی ئەوانیتر** (چاپی زانکۆی کامبریج ٢٠٠٤)، **دیموکراسی و جیاوازی** (چاپی زانکۆی بریستۆن ١٩٩٦)، **واقعی خودیی: جێندەر، جڤاك و پۆست مۆدێرنیزم لە ئەخلاقی هاوچەرخ دا** ( چاپی روتلج ١٩٩٢).

سەرچاوە: http://en.wikipedia.org/wiki/Seyla_Benhabib

341. Seyla Benhabib(editor), Toward a Deliberative model of Democratic legitimacy, in Democracy and diffrence ,contesting the boundaries of the Political , Princeton University Press, Princeton, New Jersey,1996.p. 67

342. Seyja Benhabib ,op.cit.,Ibid., p.68

کۆمەڵگا بێت کە لە لایەن دەسەڵاتی ناوبراوەوە حوکم دەکرێن.[343] چەمکی راوێژگەری بەتایبەتی لە پاڵ چەمکی دیموکراسی دا بریتیە لە شێوازێکی تایبەتمەندی پەیوەندی لە پانتایی سیاسەتدا. راوێژی سیاسی راوێژێکە کە لە پرۆسسی بڕیاری سیاسی دا وەك گرنگترین میکانیزم لێك دەدرێتەوە و کاتێ دێتەئاراوە کە هاوولاٌتیان بتوانن گفتوگۆی سیاسی بکەن و لەم گفتوگۆیە دا بڕیار وەرگرتن سەبارەت بە ژیانی سیاسی دەست پێدەکات. کەواتە بەشداری تاکی هاوولاٌتی وەك گرنگترین توخمی چەمکی دیموکراسی بەوەبەرچاوگرتنی سیفەتی راوێژگەری بەمانای بەشداریە لە وتووێژی سیاسی و بڕیار وەرگرتن سەبارەت بە ژیانی سیاسی.[344] جۆشوا کۆهن* ئەم پرۆسەی ڕاوێژگەری بە (رەوتی راوێژگەری ئایدیایی) وەسف دەکات وئاماژە بە سێ تایبەتمەندی دەکات:[346]

١. ئەم ڕەوتە یارمەتی پاساوهێنانەوەی هێندێ بۆچوونی ئاشنای دروستکردنی بڕیاری بەکۆمەڵ(جماعی) دەدات، بەتایبەتی بۆچوون سەبارەت بە جیاوازی دروست کردنی بڕیاری بەکۆمەڵ وەك سازش، مامەڵە وچالاکی بازاڕئاسا، هەم لەبەر ئەو بایەخ پێدانە راشکاوەی کە

---

343. Joshua Cohen, Procedure and Substance in Deliberative Democracy, in Democracy and Difference, op.cit.,p.95.

٣٤٤ . منصور میر احمدی، اسلام و دمکراسی مشورتی، نشر نی، تهران، ١٣٨٤(٢٠٠٥) ل ١٩١.

* جوشوا کۆهن Joshua Cohenلە ساڵی ١٩٥١لە دایك بووە، فەیلەسوفێکی سیاسی و مامۆستای زانکۆی ستانفۆردە لە بەشی فەلسەفە و زانستە سیاسیەکان و قوتابخانەی یاسا. کۆهن لە زانکۆی ستانفۆرد سەرۆکی سەنتەرێکی نوێیە بۆ دادپەروەری جیهانی. لە بەشێکی زۆری کارەکانی گرنگی بە فەلسەفەی یاسا و فەلسەفەی سیاسی و تیۆری دیموکراسی و بە تایبەتی دیموکراسی راوێژگەری و دادپەروەری جیهانی دەدات. پێشتر مامۆستای سیاسەت و فەلسەفە بووە لە ئەنیستیتیوتی ماساچوستس بۆ تەکنەلۆژیا و لە زانکۆی ییل و هارڤارد خوێندوویەتی و لە ژێر سەرپەرشتی جۆن راولز دکتۆرای وەرگرتووە. هەندێ لە کتێبەکانی بریتین لە: **سەبارەت بە دیموکراسی** (لەگەڵ جویلێ روجرز،١٩٨٣)، **نایەکسانی و دەسوەردان** (لەگەڵ جویلێ روجرز ،١٩٨٦) **دیموکراسی و کۆمەڵەکان** (لەگەڵ جویلێ روجرز ،١٩٩٥) **نایەکسانی نوێ** (لەگەڵ جویلێ روجرز ، ١٩٩٩)

سەرچاوە: (http://en.wikipedia.org/wiki/Joshua_Cohen_(philosopher

٣٤٦. جوشا کوهن، مشورت و مشروعیت دمکراتیك، ت: سید علی اصغر سلطانی، فصلنامه فرهنگ اندیشه، سال ٢، شماره ٥، بهار ١٣٨٢(٢٠٠٣)، ص ٢٠٧-٢٠٨.

دروست کردنی بڕیاری بەکۆمەڵ بە خێری گشتی دەدات و هەم لەو رووەوە کە ئەم گرنگی پێدانە یارمەتی فۆرمۆلەبوونی ئامانجی بەشدابووەکان دەدات لە بڕیاردان.

٢. رەوتی ڕاوێژگەری ئایدیایی پاساوهێنەرێکی گشتییە کەلەسەر بنەمای ئەمە، جڤاکی *Community* دیموکراتی بە چەمکەکانی ئۆتۆنۆمی وچاکەی گشتی بەستراوەتەوە.

٣. ئەم رەوتە بونیادێکی دیاریکراو بۆ تاوتوێ کردنی پرسی تایبەت بە دەزگا کۆمەلآیەتییەکان دابین دەکات.

بەم شێوەیە بۆمان دەردەکەوێت لە بڕیاری بە کۆمەڵدا شێوازەکانی دیالۆگ و مشتومڕی هاوولآتیان بۆ پێش خستنی بۆچوونە تایبەتییەکان لە خودی خۆیدا گرنگە وئەمەش وا دەکات کە تاکە ئامرازی نێو ئەم بوارە واتە بواری دروستکردنی بڕیارێکی تایبەت، زمان و وتووێژ بێت، هەروەها لە پرۆسسی ئالۆویری زانیاری و راوێژ دا سەربەخۆیی تاکەکان و گەیشتن بە چاکەی گشتی گەلآلە دەبێت، چونکە دواجار هەموو کۆبوونەوەیەك بۆ راوێژ لەسەر پرسێکی دیاریکراو دەرەنجامێکی گشتی لێ دەکەوێتەوە، هەر لێرەوە (کۆهن) بەم جۆرە پێناسەی سیستەمی دیموکراسی راوێژگەری دەکات:

> **دیموکراسی راوێژگەری، جڤاکێکە کە کاروبارەکان تێیدا لە ڕێگای راوێژی گشتییەوە لە نێوان ئەندامەکان بەڕێوەدەبرێت. لە ناو ئایدیای کۆمەڵێکی دیموکراتی دایە کە پاساوهێنانەوە بۆ مەرج و کۆتوبەندەکانی کۆمەڵگا لە ڕێگای گفتوگۆ و ئەرگۆمێنتی گشتی نێوان هاوولآتییە هاوتا و یەکسانەنەکانەوە ئەنجام دەدرێت.**[٣٤٧]

لێرە دا پێنج تایبەتمەندی بۆ تێگەیشتنی خۆی لەمەڕ دیموکراسی راوێژگەری دیاری دەکات کە بەناوی (تێگەیشتنی شکلی *Formal conception*) ناوزەدی دەکات:[٣٤٨]

١.[سیستەمی]دیموکراسی ڕاوێژگەری جڤاکێکی سەربەخۆ وبەردەوامە کە ئەندامەکانی بەردەوامی ئەم کۆمەڵگەیان تا ئاییندەیەکی بێ کۆتایی قبوڵ کردووە.

---

٣٤٧. منصور میر احمدی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٩٢.

٣٤٨. جوشا کوهن، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢١٢-٢١٣.

٢. ئەندامانی ئەم کۆمەڵگایە ڕوانگەیەکی هاوبەشیان هەیە کە بریتییە لەوەی مەرجە گونجاوەکانی جڤاك، چوارچێوەیەك بۆ راوێژ دابن دەکەن وخودی ئەم مەرجانەش بەرهەمی راوێژی ئەوانە...لە ڕوانگەی ئەوانەوە، ڕاوێژی ئازادانەی تاکە هاوتاکان بنەمای شەرعیەتە.

٣. [ سیستەمی]دیموکراسیی راوێژگەری جڤاکێکی پلۆرالیستە. ئەندامەکان، ئەولەویەت و بیروباوەڕ و وئایدیای جیاوازیان هەیە سەبارەت بە شێوازی ڕەفتاری ژیانی تاکەکەسی خۆیان.

٤. لەبەر ئەوەی ئەندامانی ئەم کۆمەڵگا دیموکراتییە، پرۆسسەکانی ڕاوێژگەری بە سەرچاوەی شەرعیەت لە قەڵەم دەدەن، هەر بۆیە بۆیان گرنگە ڕێسا و مەرجی کۆمەڵەکەیان نەك هەر بەرهەمی ڕاوێژ، بەڵکو لایان شەفافیش بێت.

٥. هەموو ئەندامێك دەزانێت کە ئەویتر خاوەنی بەهرەی ڕاوێژە، واتا ئەو بەهرەیەی کە بۆچوونە ناو ئاڵوویری دەستەجەمعی ئەرگۆمێنت و کارکردن لەسەر بنەمای دەرەنجامەکانی ئەم ئەرگۆمێنتە جەماعیە زەرووریيە .

کەواتە بەبڕوای (جۆشوا کۆهن) وبەپشت بەستن بە پێناسە و بەم پێنج تایبەتمەندییە دەتوانین بڵێین کە دیموکراسی ڕاوێژگەری لە چوارچێوەی سیستمێکی سەقامگیری کۆمەلایەتی دا بەرجەستە دەبێت، بەجۆرێك ئەم سەقامگیرییە جۆرە رایەڵێکی کۆمەلایەتی و یادەوەری هاوبەشیان بۆ دروست بکات، ئەمە جگە لەوەی فاکتەری یەکەمی دروست بوونی کۆمەڵگا لەم تێڕوانینە دا بریتیە لە ئیرادەی سەربەخۆیی هاوولاتیان کە هیچ پێش مەرجێکی تر قبوڵ ناکات و کۆمەڵگا و چالاکی سیاسی بەرهەمی راوێژی بەردەوامی تاکەکانە، ئەو تاکانەی کە وەك خودی خاوەن بەهرەی دیالۆگ رێز لە جیاوازی یەکتر دەگرن. (سیلا) پەیوەندییەکی تۆکمە دروست دەکات لە نێوان راوێژ وشەرعیەت و ئەرگۆمێنتەکەی ئەوەیە:

> **دەبێ وەها سەیری شەرعیەت بکرێت لە کۆمەڵگای دیموکراسیە ئاڵۆزەکان کە دەرەنجامی راوێژێکی گشتی بێ سنوور و ئازادانەی هەموانە دەربارەی پرسە گرنگە هاوبەشەکان، بەم جۆرە فەزای گشتی تەشاور دەربارەی ئەو پرسانەی کە جێی بایەخی هاوبەشن لایەنێکی جەوهەرییە بۆ شەعیەتی دەزگا دیموکراتییەکان.**[٣٤٩]

349 . Joshua Cohen, procedure and Substance in Deliberative Democracy, Ibid.,p.68.

ئەو بیرۆکەی سەرەکیەی کە لە پشت مـۆدێلی دیمـوکراتی تەشـاورییە ئەوەیـە کـە تـەنیا دەتوانرێت بەو نۆرمانە بگوترێت دروستن، واتە لـە رووی ئەخلاقییـەوە ئیلـزامین کـە هـەموو کەسانە لەسەری رێکبکەون کە دەکەونە ژێر کاریگەریەکەیـەوە، ئەگـەر رێککـەوتنێکی لـەم جۆرە  هەبێ وەك دەرئجامی پرۆسسی راوێژ ئەوا دەبێ ئەم خەسڵەتانەی خوارەوەی هەبێ:[350]

١- بەشداری لە راوێژێکی لەم جۆرە مەحکومە بـە نـۆرمی یەکسـانی و هاوتـایی، واتـە هەموو تاکەکان هەمان دەرفەتیان هەبێت بۆ دەستپێشخەری کـردەی قسـەیی، پرسـیارکردن و لێپرسینەوە و *debate* کراوە.

٢- هەمووان مافی پرسیارکردنیان هەبێـت لە بابەتە دیاری کراوەکانی گفتوگۆکە.

٣- هەمووان مافی دەست پێشخەریان هەبێت بۆ ئـەرگۆمێنتی تەئـەمولی سـەبارەت بـە رێسای رێکاری گوتار و ئەو رێگایانەی رێساکانی لێ بەرهەم دیـت و جێ بەجێ دەکرێت.

بە پێی مۆدێلی راوێژگەری، شەرعیەت لە رێکاری(اجراءات) راوێژگەری لەدایك دەبێت و گرانتی عەقلانییەتی پراکتیکی دەکـات، بـەلام پرسـیار سـەرەکی لای سـیلا ئەوەیـە ئایـا پێداویستی عەقلانیەتی پراکتیکی لە پرۆسسی دیموکراسی راوێژگەری چییە؟ پرۆسسـی راوێـژ پرۆسسێکی جەوهەرییە بۆ عـەقلانییەتی کردەیی و دروست کردنی بڕیاری جەماعی لەبەر ئـەم سێ هۆکارە: [351]

١. پرۆسسی راوێژ برییتە لە پرۆسسی بەخشینی زانیاری  چونکە:

أ-  هیچ کاتێك تاك بەتەنیا ناتوانێت مەعریفەی پێش وەختـەی هـەبێت و پـێش بینـی ئایندە بکات سەبارەت بە پرسە ئەخلاقی وسیاسییەکان کە تاکەکانی تر دەرکی دەکەن.

ب- هیچ کاتێك تاك بەتەنیا ناتوانێ ببێتە خاوەنی ئەو زانیاریانـەی کـە پەیوەنـدیان بـە بڕیارێکی دیاریکراوەوە هەیە و کاریگەری لەسەر هەمووان هەیە. کەواتە راوێژ رێکارێکـە بـۆ وەرگرتنی زانیاری.

٢. مۆدێلی دیموکراسی راوێژگەری لە ژیانی کۆمەڵگا دا تـەنیا لـە ململانێـی بەهاکانـدا بەردەوام نابێت بەڵکو لە ململانێی بەرژەوەندیەکانیش دا درێژەی هەیە، بەومانایەی کە پـاش رازی بوون بە پرەنسیپەکانی دیموکراسی تەشاوری بەرژەوەندی ئەو تاك یان گروپانەش وەبەرچاو

350. Joshua Cohen, op.cit. Ibid. p.70.
351. Ibid.,pp 74-71..

بگیرێت کە پرۆسسی ڕێکاری راوێــژ کاریگــەری سیاســی لەســەریان هــەبووە لــە چوارچــێوەی هاوکاری کۆمەلاّیەتی دوولایەنەدا.

**٣**. هەموو مۆدێلێکی دیموکراسی راوێژگەری و ڕێکاری، پێش وەختــە کراوەیــە بــە رووی ئەو ئەرگۆمێنتەی کە دەڵێت، هیچ کۆمەڵگایەکی مۆدێرن ناتوانێت کاروباری خۆی رێك بخات بیێ پشت بەستن بە خەیاڵی کۆبوونەوەی جەماوەری بۆ ئەنجامدانی تەشاور بە شێوازێکی ئاشکرا و جەماعی. بەم جۆرە بەدەستهێنانی مەعریفە سەبارەت بە پرس یان چەمکێکی دیــاریکراو، پرۆسسێکی کۆمەلاّیەتی ئالّۆزە کە تاك بە تەنیا ناتوانێت بێتە خــاوەنی، بەتایبــەتی کاتێــك ئەم پرسە پەیوەست بێت بە چارەنووسی سەرجەم تاکەکانی ترەوە، هەربۆ لە ڕوانگــەی ســیلاوە لە ڕێگەی ڕێکاری دیموکراسییەوە دەبیێ دەرفەتی راوێژ و را گۆڕینەوەی کراوە بێــتە ئارا، خاڵی جەوهەریش لە هزری (سیلا) ئەویە کە ژمارەو قەبارەی دەنگ و ڕا گرنگ نیە بەو رادەیەی کە ئەرگۆمێنتی بەهێز گرنگە و ئەوەش وا دەکات دیموکراس راوێژگەری لە دیموکراسی راستەوخۆ جیا ببێتەوە.

رۆبرت دال یەکێك لەو بیرمەندانەیە کە کاریگــەری قــوڵی لەســەر هــزری دیموکراســی بەگشتی هەبووە و بۆتە سەرچاوەیەك بۆ دیموکراسی راوێژگەری و پێنج پێوەرە گرنگەکەی (هەر وەك لە بەشی یەکەم، باسی سێیەم، تەوەری دووەمی ئەم توێژینەوەیە دا ئامــاژەی بــۆ کــراوە) سەبارەت بە ئیستحقاقاتی پێویست لەمەڕ پرۆسسی وەرگرتنی بڕیار بۆ ئەوەی بــە دیمــوکراتی وەسف بکرێن.[٣٥٢] بەکارهێنانی پێوەرەکانی (دال) بــۆ دیموکراســیی دەروازەیــەکی گرنگــە بــۆ بیروبۆچوون وهەڵوێستی دیموکراسی راوێژگەری بۆ نموونە پێوەری یەکەم و سێیەم لە دیموکراسی راوێژگەریدا بایەخی زۆری هەیە کە جەختێکی زۆر لەسەر زۆرترین دەرفەتی بەشداری کاریگەر وچــالاکانە وتێگەیشــتنی رۆشــنگەرانە لــەپێناو بــەدیهێنانی کۆمەڵگایــەکی سیاســی دادپەروەرانەتردا. بۆئەوەی تاك بەتەواوی بەشداری بکات لە پرۆسیی وەرگرتنی بڕیار، پێویستە بەشدار بێت لە راوێژێکی ڕاستەقینەدا نــەك تــەنیا تــەعبیرکردن لــە تــەفزیلات و هەڵبــژاردن

---

٣٥٢ . كولن فارلي، مقدمة في النظرية السياسية المعاصرة، ت: محمد زاهي بشير المغيربي و نجيب المحجوب الحصادي، منشورات جامعة قاريونس ، بنغازي،٢٠٠٨،ص ٢٦١. دەقە ئینگلیزییەکەی ئەمەی خوارەوەیە:
- Colin Farrelly, Introduction to Contemporary Political Theory SAGE Publications, London, Cromwell Press, Trowbridge, Wiltshire, SAGE Publications Ltd, 2004.

بکات، ئەم راوێژە حزبەکان پابەند دەکات واز لە رەفتاری ستراتیژی بێنن ولە جیاتی ئەمە هەوڵ بدەن بۆ گەیشتن بە رێککەوتنێکی جەماعی لە نێوان بەشدارە ئازادە یەکسانەکان دا.[353]
پێویستە تیشك بخەینە سەر ئەوە کە لە نێو دیموکراسی راوێژگەری دا دوو ئاراستەی سەرەکی هەیە کە یەکیان جەوهەرگەراییە و ئەویتریان ئاراستەی رێکارییە. لایەنگرانی ئاراستەی جەوهەری داکۆکی لە وێنای دیموکراسی راوێژگەری دەکەن کە لەیەك کات دا پرەنسیپە جەوهەری و رێکارییەکان لە خۆدەگرێت و ئەم پرەنسیپە جەوهەریانە، ئازادییە سەرەکییەکان و دەرفەتی دادپەروەرانە دەگرێتە خۆی. بەم جۆرە ئێستا هەندێ لە لایەنگرانی رێکارییەت داکۆکی لە پرەنسیپی جەوهەری دەکەن، بۆ نموونە (جۆشوا کۆهن) رای وایە کە دیموکراسی راوێژگەری پێش وەختە هەندێ پرەنسیپی جەوهەری گریمانە دەکات و جەدەل لەسەر ئەوە دەکات کە روانگەی راوێژگەری "پرەنسیپی بەشداری" وەردەگرێ کە مەرجی زۆر سارم لەخۆدەگرێت: بەپێی ئەم پرەنسیپە پێویستە لەسەر دیموکراتی جماعی- دەزگایی، پەیوەندی لەنێوان پاساوی راوێژگەری و پیادەکردنی دەسەڵاتی گشتی هەڵبژێریٚ- گرەنتی مافی یەکسان لەبەشداری دا، کە مافی دەنگدان و پەیوەندی و گوزارشتی سیاسی و ملدان بۆ نەچەسپاندنی هیچ جۆرە کۆتوبەندێك لەسەر روانگە و ناوەرۆکی تەعبیرەکان، و مافی وەرگرتنی پۆستەکان و ملدان بۆ یەکسانی وەزنی دەنگەکان و مەرجی گشتی بۆ رەخساندنی دەرفەتی یەکسان لەبەردەم کاریگەری چالاك لەخۆ دەگرێت. مەرجی دواییان بەرپەرچی حاڵەتی ستەم دەداتەوە لە دەرفەتی وەرگرتنی پۆست و نفوزی سیاسی.[354] بۆ جەخت کردن لەسەر هەستی رەخنەیی دیموکراسی راوێژگەری، نوسەرێکی وەك (دیزیك) داکۆکی لەو دیموکراسیە دەکات کە ئەم خەسڵەتانەی هەیە:[355]

١- فرەییە، چونکە زەرورەتی پەیوەندیکاری لە ئامێز دەگرێت ، لەمیانی جیاوازی بە بێ سڕینەوەی جیاوازییەکان.

٢- تێڕامانیە (تأملی)، لە ئاراستە گومانکارانەکەی خۆی لە بەرانبەر دابونەریتە چەسپاوەکان دا.

---

٣٥٣. کولن فارلی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٦٤.

354. Joshua Cohen, Ibid ., pp.106-107.

٣٥٥ . سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٧٩.

٣- بـان نەتەوییـە، لـە تواناكـەی بـۆبڕینی سـنووری دەوڵـەت بـەرەو هەنـدێ بابـەت كەچوارچێوەی دەستووری نییە.

٤- ئیكۆلۆژییە، لە كرانەوەی پەیوەندیكارانەی دا بەڕووی سروشتی نامرۆیی دا.

٥- دینامیكیە، لە كرانەوەی لـە بەرانبـەر ئاسـتەنگ و دەرفـەتی دیموكراسـی هەمیشـە گۆڕاودا.

بـە شـێوەیەكی گشـتی، فـۆرمی سیاسـی و دیموكراسـیانە لـە روانگـەی راوێژگەریـەوە چوارچێوەیەكی كاركردن بۆ بارودۆخی دەزگایی و كۆمەلآیەتی دیاری دەكات كە بڕیـاری ئـازادی نێوان هاوولآتیە یەكسانەكان ئاسان دەكات، لە رێگای پشتیوانی كردن لـە رەوشـێكی لـەبار بـۆ بەشداری و كۆبوونەوە و رادەربڕین.[٣٥٦] بەلآم لێرەدا ئەو رەخنەیەی كە لە دیموكراسـی راوێژگـەری دەگیرێت ئەوەیە كە رەنگە راوێژكردن وئەرگۆمێنت هێنانەوە هێندە درێژە بكێشێت كە بـە هـیچ جۆرێ چارەی كێشەكانی پـێ نـەكرێت، چـونكە بەشـێك لـە كێشـە سیاسـی و كۆمەلآیـەتی و ژینگەیەكان بەرلەوەی پێویستیان بە دیالۆگ و مشتومڕ هەبێت، پێویستیان بـە چـارەی بەپەلـە هەیە. بۆ خۆپاراستن لە كەموكوڕی راوێژ هەندێ لە بیرمەندان(دانیل بیل) جەخت لەسەر هەنـدێ پێش مەرج دەكەنەوە كـە وادەكـات راوێـژی ئـەخلاقی بنیاتنـەر ئەگـەرێكی زیـاتری هـەبێت، لەوانە:أ.دابەشكردنی تاڕادەیەك بە ئینسافی سەرچاوەكان، ب.هەستی كۆمـەڵگایی و متمانـەی نێوان بەشداران، ج. كلتوری سیاسی كە گرنگـی بـە دەركردنـی بڕیـار دەدات لەلایـەن نوخبـەی كلتوریەوە.[٣٥٧] دیارە ئەم خاڵە دژی پرەنسیپی بەشداری هـەموو هاولآتیانـە و ئاسـتی بەشـداری سیاسی دادەبەزێنێت. بەلآم لە لایەكی ترەوە ئاماژە بەوە دەكرێت كە راوێژگەری یۆتۆپیە، چونكە چۆن هەموو خەڵك دەتوانێ بەشداری لە راوێژێك بكات و بەڵگەی دروسـت بخاتـەڕوو، ئاشـكرایە باكگراوندی تاكەكان بۆ بەڵگەهێنانەوە و ئاستی هوشیاری و رۆشنبیری كاریگەری لەسەر جـۆری بیركردنەوە دەبێت. بەلآم لێرەدا بۆ چارەسەركردنی كێشەی بەشداری لە راوێژ هەندێ لەبیرمەنـدان پرۆژەی كردەیی و رێكاری واقعی دەخەنەڕوو بـۆ نموونـە پێشـنیاری پشـوویەكی تـری نەتـەوەیی دەكەن لە ژێر ناوی "رۆژی راوێژ"كە وادەكات دیموكراسی راوێژگەری كەمتر یۆتۆپی بێت:[٣٥٨]

356 . Joshua Cohen, op.cit., p.99.

٣٥٧. هەمان سەرچاوە ، ل ٢٨٣.

٣٥٨. هەمان ، ل ٢٨٦.

**ئەم پشووە هەفتەیەك بەر لە هەڵبژاردنی گشتی دەبێت. دەنگدەرە تۆمارکراوەکان بانگهێشتی کۆبوونەوە دەکرێن لە گەڕەکەکان ، لە گروپی بچوکی پازدە کەسی و گروپی گەورەی پێنج سەد کەسی دا، بۆ وتوویژ لەسەر پرسە سەرەکییە کێشە لەسەرەکانی هەڵمەتی هەڵبژاردن. هەموو گفتوگۆکارێك ١٥٠ دۆلار وەردەگرێ بۆ جێبەجێ کردنی رۆڵی خۆی وەك هاوولاتی لەو رۆژە دا، بە مەرجێك لە هەفتەی ئایینده دا دەنگ بدات. یاسا هەموو کارێکی تر لەم رۆژە دا یاساغ دەکات، جگە لە کارە زۆر زەروورەکان نەبێت.**

هەرچەندە بە دیوێك دا رەنگە ئەمە لەگەڵ کۆمەڵگای ئاڵۆز و فرە رەهەندی هاوچەرخ دا زۆر نەگونجێت و وەك جۆرێك لە یۆتۆپیا خۆی بنوێنێ، بەلاّم بە دیوەکەی تر دا ئەگەر پرۆسسی بڕیاری سیاسی بە پرۆسسێك بزانین کە پەیوەندی نەك بە ژیانی هەموو هاوولاّتیانەوە هەیە بەڵکو پەیوەندی بە ئاییندەی نەوەکان و هەموو ژینگەی مرۆیی و نامرۆییەوە هەیە ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کە ئەرکێکی ئەخلاقییە کە تاك وەك هاوولاّتی رۆڵکی ئەکتیڤتر بگێڕی لە رەسم کردنی سیاسەت و بڕیارەکان دا بەتایبەتی کە ئێستا دا کە رادەی تەحەدییەکان زۆر لە جاران زیاترن و بێدەنگی و خەمساردبوون و خۆ دوورخستنەوە لە بەشداری کاریگەری سیاسی وا دەکات بڕیارەکان کەمتر گوزارشت لە بەرژەوەندی گشتی بکەن .

## تەوەری دووەم: بنەما تیۆرییەکانی دیموکراسی راوێژگەری

دیموکراسی راوێژگەری وەك مۆدێلێکی نوێ لە فەلسەفەی سیاسی دا کە دەیەوێت روانگەی رادیکالتر بۆ کێشە سیاسی و کۆمەلاّیەتیەکانی بخاتەڕوو بە تایبەت سەبارەت بە چەمکە سەرەکییەکانی وەك ئازادی و یەکسانی و دادپەروەری، بنەما تیۆرییەکانی خۆی سەرەڕای تیۆری رەخنەیی کە پێشتر تیشکمان خستە سەر لە دوو رەوتی فکریی تریش وەردەگرێت کە بریتین لە: ١. قوتابخانەی گرێبەستی کۆمەلاّیەتی. ٢. رەوتی پۆست لیبراڵ.[٣٥٩]

### ١- قوتابخانەی گرێبەستی کۆمەلاّیەتی:

توێژینەوە و لێکۆڵینەوەیەکی زۆر سەبارەت بە گرێبەستی کۆمەلاّیەتی وهەنگاونان بەرەو کۆمەڵگای مەدنی و سیاسی لە روانگەی بیرمەندەکانیەوە ئەنجام دراوە کەبە پێویستی نازانین

---

٣٥٩. منصور میر احمدی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٩٤.

لێرەدا ئاماژەیان پێبکەین، تەنیا ئاماژە بە خاڵێکی سەرەکی دەکەین ئەویش ئەوەیە کە تیۆری گرێبەستی کۆمەڵایەتی سەرەڕای جیاوازی بیرمەندەکانی بە تیۆرێکی دیموکراتی دادەنرێت کە پشت بە ئیرادەی ئازادی تاکەکان دەبەستێت بۆ دامەزراندنی دەوڵەت وسیستمی سیاسی وئەوەش لە هەموو قوتابخانەو تێڕوانینەکانی پێش خۆی جیای دەکاتەوە، هەرچەندە لە ناو بیرمەندانی تیۆری گرێبەستی کۆمەڵایەتیدا بۆ نموونە (تۆماس هۆبز) ئیرادەی ئازادی تاکەکان دەکاتە پێشەکی بۆ دەسەڵاتێکی ڕەها وپەیوەندییەکی ستوونی لە نێوان دەسەڵات وتاکەکاندا دروست دەکات. چونکە لە روانگەی ئەوەوە دەوڵەت بریتییە «لە کەسێك کە ژمارەیەکی زۆر لە مرۆڤەکان بە پێی گرێبەست و پەیمان لەگەڵ یەکتر، خۆیان یەك بە یەك ئەو کەسە بە مەرجەعی مسداقیەت و ڕەوایەتی کردارەکان لەقەڵەم دەدەن».[360]

بەڵام دیسان پێش مەرجی سەرەکی ئەم ڕەوشە ئیرادە و ویستی تاکە نەك هێز و ئیرادەیەکی دەرەکی. «مرۆڤەکان لە نێوان خۆیان دا ڕێك بکەون کە بە خواستی خۆیان ملکەچی کەسێك یان کۆمەڵە کەسێك بن».[361] لە ناو بیرمەندەکان دا، جۆن لوك و بەتایبەتی جان جاك رۆسۆ گرنگیەکی زۆریان بە سنورداركردنی دەسەڵات و هێنانە ئارای پەیوەندییەکی ئاسۆیی داوە کە تاك یان هاووڵاتیان بە دەسەڵاتدارەکانەوە گرێ دەدات. رۆسۆ ئاماژە بەوە دەکات کە «هەموو تاکێك خۆی و هەموو مافەکانی بە هاوبەشی دەخاتە ژێر ڕێنمایی ئیرادەی گشتی و هەموو ئەندامێك وەك بەشێکی دانەبڕاوی گشت، لە پەیکەری کۆمەڵایەتی دا قبوڵ دەکرێ».[362] و لەم نێوەدا بەشداری و ڕاوێژ ڕۆڵی گەورە دەگێرن، چونکە رۆسۆ پێیوایە «کردەی بەشداری پابەندبوونی دوولایەنەی کۆمەڵگا و تاك لەخۆ دەگرێت. ئەرك و بەرژەوەندی هەر دوو لایەنی گرێبەست، ناچاریان دەکات یارمەتی یەکتر بکەن».[363] لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە تیۆری دیموکراسی راوێژگەری بە جۆرێك لە جۆرەکان درێژکراوەی قوتابخانەی گرێبەستی

---

٣٦٠. توماس هابز، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٩٢.

هەڵبەتە (بۆ ئەوەی ئەو بتوانێ هێز وئیمکاناتی هەموویان بەو جۆرەی خۆی بەباشی دەزانێت بۆ پارێزگاری کردن لە ئارامی و ئاسایش و پاسەوانی گشتی بەکاری بێنێت.) هابز، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٩٢.

٣٦١. توماس هابز، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٩٣.

٣٦٢. ژان ژاك روسو، سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٤.

٣٦٣. جوشوا کوهن ، سەرچاوەی پێشوو، ل١١١-١١٥.

کۆمەڵایەتییە ، بە تایبەتی لەو رووەوە کە تیۆری دیموکراسی راوێژگەری پشت بە پرەنسیپی رێککەوتن وپەیمان و کۆدەنگی دەبەستێت لە بڕیاردان دا، تیۆری دیموکراسی راوێژگەری لەسەر بنەمای ئەم ئایدیایە دامەزراوە کە تیایدا کۆمەڵگا لە رێگای باس وگفتوگۆ و ئەرگۆمێنت لە نێوان هاووڵاتییە یەکسانەکان دێتەئاراوە و بەم جۆرە پاساو بۆ کۆتوبەندەکانی ئەم کۆمەڵگایە دەهێنرێتەوە. سەرەڕای ئەم پێکچوونەی تیۆری راوێژگەری لەگەڵ تیۆری گرێبەستی کۆمەڵایەتی، گرنگترین جیاوازیان بریتیە لە جیاوازی نێوان هەر دوو چەمکی "گرێبەست" و"رێککەوتن" و دواجار کۆدەنگی، چونکە «گرێبەست دەربڕی رەشێکە کە پێویستی بەستنی پەیمانێك بەدوای خۆیدا دێنێت بۆ چارەسەرکردنی قەیران و کێشەکان، لە کاتێك دا "رێککەوتن"پەیوەستە بە دۆخێکی تایبەتەوە کە رەنگە بێتە ئاراوە».[٣٦٤] ئەمەش لەمیانی رەوشێك دەبێت کە تاکەکان تێیدا هەوڵی بەدیهێنانی دەدەن. بە وتەی (جۆشوا کۆهن): لە راوێژی ئایدیالی دا تاکە بەشدارەکان هەم لە رووی شکلی و هەم لەرووی بایەخەوە یەکسانن.[٣٦٥] لە رووی شکلیەوە یەکسانن چونکە رێساکانی راوێژ پەنجە لەسەر تاکەکان دانانێت. هەموو تاکێکی خاوەن بەهرەی راوێژ، شوێنگەیەکی یەکسانی هەیە لەگەڵ ئەوانیتر دا لە هەر قۆناغێکی رەوتی راوێژ دابێت... ئەندامەکان لە رووی بایەخیشەوە یەکسانن، چونکە دابەشکردنی دەسەڵات و سەرچاوەکان، کاریگەری نابێت لەسەر دەرفەتی ئەوان بۆ بەشداری کردن لە راوێژ و هیچ رۆڵێکی دەسەڵاتگەرانە ناگێرێت لە راوێژەکەیان دا.

## ٢- رەوتی پۆست لیبرال *Post-liberal*:

لە قۆناغی هاوچەرخ دان رەوتی پۆست لیبرال بە وەرچەرخانێکی تایبەتی لە هزری هەندێ لە بیرمەندە لیبرالەکان دەست پێدەکات لە چەمکی ئازادیەوە بەرەو چەمکی دادپەروەری. بێگومان (جۆن راوڵز)* فەیلەسوفی هاوچەرخ رۆڵێکی گرنگی لەم وەرچەرخانە دا هەبووە. راوڵز

٣٦٤. منصور میر احمدی، سەرچاوە پێشوو، ل ٢٠٠.

٣٦٥. جوشا کوهن ، سەرچاوەی پێشوو، ل٢١٤.

* جۆن راولز John Rawls فەیلەسوفی هاوچەرخی ئەمریکی لەساڵی ١٩٢١ لە بالتیمور لە دایك بووە لە بەشی فەلسەفە لە زانکۆی پریستۆن خوێندنی دەست پێ کردووە. و لە کۆتاییەکانی ١٩٧٦ چۆتە هارڤارد. لە ساڵی ٢٠٠٢ کۆچی دوایی کردووە.بە سوود وەرگرتن لە فەلسەفەی بیرمەندانی وەك رۆسۆ و لۆك و کانت گرنگترین بۆچوونەکانی خۆی سەبارەت بە دادپەروەری دارشتووە. راولز یەکێکە لە گەورەترین فەیلەسوفی

به هۆی تێگەیشتنێکی تایبەت لە دادپەروەری — دادپەروەری وەك ئینساف- هــەوڵی گەلاڵــە کردنی دادپەروەری دەدات و دەیەوێت ناکۆکی نێوان ئازادی و دادپەروەری چارەســەر بکــات و پێیوایە ناکۆکی هەنووکەیی لە مەیدانی بیرکردنەوەی دیموکراتی دا بەشــێکی زۆری پەیوەنــدی بەوەوە هەیە کە کام چەمکی دادپەروەری زۆرتر گونجاوە بۆ کۆمەڵگایەکی دیمــوکراتی لــە ژێــر سایەی رەوشێکی شیاو و مەعقول دا.[٣٦٦] بەم جۆرە جیاوازی لەنێوان هەردوو چەمکی عەقلانی ومەعقولّ دەکات «ئــەوەی پاســاوە بــۆ رەفتــارێکی عــەقلانی ئــەو بنــەما ناسـراوانەیە کـە ئاراستەمان دەکات بۆ نموونە بەرەو هەڵبژاردنی ئەو ئامرازانەی وامان لێ دەکـات ئامانجـەکان بەدی بێنن بەو پەڕی چالاکی وسەرکەوتنەوە بەلاّم مەعقولّ ئەو هەستە ئەخلاقییە کە بنچینەی حەزی چوونە ناو هاوکاری منسفانە دروست دەکات».[٣٦٧] سەبارەت بــە پرســی دادپەروەرانــە بوونیش لە فەلسەفەی سیاسی ڕۆژئاوادا دوو وەلاّمی ســەرەکی هەیــە : ***یەکــەم***، دادپــەروەری بەمانای بەدەست هێنانی بەرژەوەندی دوولایەنە لەســەر بنــەمای رێککــەوتن وگرێبەســت کــە تیایدا پاڵنەری کــاری دادپەروەرانــە دابــین کردنــی بەرژەوەنــدی درێژخایــەنی تاکــە . ***دووەم***، دادپەروەری وەك بێلایەنی، بەو واتایە کە کە بتوانین داکۆکی لە رەفتاری خۆمان بکەین بە بێ گەڕانەوە بۆ بەرژەوەندی خۆمان.[٣٦٨] واتە راولز هــەولّ دەدات لــە چــەمکی دادپەروەرییــەوە دەست پێبکات کە پێیوایە لە لیبرالیزم دا بە هۆی بالاّدەستی چەمکی ئازادی توشی پەراوێزی هاتووە و بەم جۆرە چەمکی دادپــەروەری وەك ئینســاف دەخاتــەڕوو، بەمــەش جــۆرە تــەبایی وگونجانێك لە نێوان ئازادی و دادپەروەری دروست دەکات وئەمەش لای بیرمەندانی دیموکراسی

---

لیبرالیزم کە توانیویەتی توێژینەوە لەسەر پرسی دادپەروەرەی کۆمەلاّیەتی بکات. هەندێ کتێبەکانی بریتین لە: تیۆرێك لەمەڕ دادپەروەری١٩٧١، لیبرالیزمی سیاسی ١٩٩٣، دادپەروەری وەك ئینساف ٢٠٠١.
سەرچاوە: سایتی آفتاب
http://www.aftab.ir/articles/view/religion/moral/c7c1132049730p1.php/29\12\2010

٣٦٦ . جون راولز، العدالة كانصاف، ت: د. حيدر حاج اسماعيل، المنظمة العربية للترجمة، بيروت، ٢٠٠٩، ص ١٠٣.

٣٦٧. احمد اغبال، الليبرالية السياسية و مسألة العدالة لدى جون راولز ، لەم سایتە لە رێکەوتی ٢٠١٠/١٢/٢٧وەرگیراوە le blog www.sohpia.mht

٣٦٨. حسين بشيريه، ليبراليسم و محافظه كاری،جلد دوم ، نشر نی ، چاپ ٧، تهران، ١٣٨٦(٢٠٠٧) ل ١١٥.

دەبێتە سەرەتایەك بۆ دیموكراسی راوێژگەری و جۆشوا كۆهن هەوڵ دەدات رەگی دیموكراسی راوێژگەری لە فەلسەفەی جۆن راولزدا بدۆزێتەوە وئاماژە بە سێ خاڵی گرنگ دەكات:[٣٦٩]

١- لە دیموكراسی دا كە سیستەمێكی باش بەسەری دا بالادەستە، گفتوگۆی سیاسی سەبارەت بە تێگەیشتنی جیاواز لەمەڕ چاكەی گشتی رێكدەخرێت. لە روانگەی راولزەوە ئەو كۆمەڵگایە كۆمەڵگایەكی دادپەروەرانە نییە كە تیایدا مشتومڕ لە پێناو بەدەستهێنانی بەرژەوەندی گروپە نەك بەرژەوەندی گشتی.

٢- ئایدیای سیستەمی دیموكراسی، بەرەنجامی یەكسانیخوازانەی لێدەكەوێتەوە كە پێویستە بەشێوەیەكی شەفاف بۆ هاولاتیان دابین بكرێت. لە روانگەی راولزەوە لەم كۆمەڵگایانە دا دەبێت دەرفەتی سیاسی جیا بێت لە پێگەی كۆمەلایەتی و ئابووری.

٣- دەبێت سیاسەتی دیموكراتی بە جۆرێك ڕێكخرێت كە زەمینەی عزەتی نەفس دەستە بەر بكات و هەستی توانستی سیاسی پەروەردە بكات ویارمەتی فۆرمۆلەبوونی هەستی دادپەروەری بدات.

بەم جۆرە دیاریكردنی چوارچێوەیەكی مەشروع بۆ چاكەی گشتی لە ڕێگای گفتوگۆی هاوولاتییانەوە دەبێت و وەبەرچاونەگرتنی پێگەی تاك، یەكسانی لەبەردەم دەرفەتەكان دەخولقێنێت كە پێویستە بە شێوەیەكی شەفاف بۆ هەمووان بێت و ئەمەش دەبێتە هۆی بەهێزكردنی هەستی سۆلیدارێتی مەدەنی وبنەماكانی ئەخلاقی كەلتووری سیاسی. بە رای (رۆبرت دال) یەكێك لە كێشە سەرەكیەكانی بیركردنەوەی ئەخلاقی دیاریكردنی چۆنیەتی گەیشتنە بە هەندێ پرەنسیپ كە بشێت بەجۆرێك لە مەعقولیەت بانگەشەی ئەوەی بۆ بكرێت كە گشتی یان یونیڤێرسالن. (راولز) هەوڵدەدات ئەمە دیاری بكات.[٣٧٠] راولز لەسەر ئەو رایەیە كە دەبێت هاوولاتیان لە كۆمەڵگایەكی دیموكراتی دا تێگەیشتنێكی لانیكەم ناڕاستەوخۆیان سەبارەت بە یاسا بنەڕەتییەكان وچەمكی دادپەروەری سیاسی وماف وئازادییە دەستوورییەكان هەبێت و ڕای وایە «یەكێك لە ئامانجە كردەییەكانی دادپەروەری وەك ئینساف بریتییە لە دابین كردنی بنەمایەكی فەلسەفی وئەخلاقی مەقبول بۆ دەزگا

---

٣٦٩. جوشا كوهن، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٠٨- ٢٠٩

٣٧٠. روبرت دال، التحليل السياسي الحديث ، ت: د. علاء ابو زيد، مراجعة : د.على الدين هلال، مركز الأهرام للترجمة و النشر، ط ٥ بدون سنة، القاهرة، ط١(١٩٩٣)، ص ١٦٨.

دیموکراتییەکان». [371] ئەوەش پەیوەندی بە تێگەیشتنی هاولاتیانەوە هەیە بۆ هەردوو چەمکی ئازادی و یەکسانی و بۆ ئەم مەبەستە دەبێت بۆ کەلتوری سیاسی بگەڕێنەوە و لە ڕێگای تاکی ئەخلاقییەوە کە خاوەن دوو بەهرەیە، ***یەکەم،*** توانای دروست کردنی وێنایەك بۆ چاکە (خێر) و هەولدان بۆ بەدەستهێنانی و ***دووەم،*** توانای هەست کردن بە دادپەروەری وتێگەیشتن لە پرەنسیپەکانی و پیادەکردنی. [372] لێرە دا راولز ئاماژە بە هەندێ مافی جەوهەری دەکات کە فۆرمی نایەکسانی کۆمەلایەتی دیاری دەکات کە لە چوارچێوەی بەرژەوەندی ئەندامەکان داخۆی دەنوێنێت.

أ) هەموو کەسێك هەمان مافی هەیە کە ناکرێت هەلبوەشێنرێتەوە، لە رەسم کردنی ئازادییە سەرەکییە یەکسانە کافیەکان دا، ئەم رەسم کردنە لەگەل سیستەمی ئازادی هەمووان دا تەبایە.

ب) دەبێ سیماکانی نایەکسانی کۆمەلایەتی و ئابووری دوو مەرج بەدی بهێنن:

***یەکەم،*** دەبێ نایەکسانی پەیوەست بێت بەو ئەرك و ناوەندانەی کە بۆ هەمووان کراوەن لە یەکسانیی رەوشێکی مونسفانەی دەرفەتەکان دا. ***دووەم،*** پێویستە سیمای نایەکسانی زۆرترین بەرژەوەندی بۆ ئەو ئەندامانەی کۆمەلگا دابین بکات کە کەمترین ناوەندیان هەیە. [373] یەکەمیان یەکسانی تەواو لە هەمبەر مافە سیاسیەکانی هاوولاتیان لە سیستەمێکی دیموکراتی لەخۆ دەگرێت و دوومیان، هەلسوکەوتێکی دادپەروەرانە (کە مەرجیش نیە تەواو یەکسان بێت) سەبارەت بە دابەشکردنی بەهای کۆمەلایەتی وئابووری. [374] بەم جۆرە ئەم دوو پرەنسیپە هەولی دۆزینەوەی رێگاچارەیەکی گونجاو دەدات بۆ ئازادی و یەکسانی لە دەرفەتەکان لە فکری لیبرالیزم دا بە جۆرێك کەهەمووان بێ جیاوازی تێیدا بەشدار بن و لە لایەکی تریشەوە چوارچێوەیەکی واقعی بۆ گرفتی نادادپەروەری دادەڕێژێت وەك کێشەیەکی هەیشەیی ژیانی مرۆڤ. سەبارەت بە چەمکی دادپەروەری وەك ئینساف راولز ئاماژە بەوە

---

٣٧١. جون راولز، سەرچاوەی پێشوو، ل٩١ .

٣٧٢. احمد اغبال، سەرچاوەی پێشوو، ص ١-٢.

٣٧٣. جون راولز، سەرچاوەی پێشوو، ص ١٤٨.

٣٧٤. روبرت دال، سەرچاوەی پێشوو، ص ١٦٩.

دەكات كە بیرۆكەی كۆمەڵگا وەك سیستمێكی بە ئینسافی هاوكاری (التعـاون) كۆمەلاّیـەتی لەنەوەیەكەوە بۆ نەوەكی تر، بیرۆكەیەكی سەرەكییە.

**راولز دەڵێت ئەم بیرۆكە سەرەكییەم بە پشت بەستن بە دوو بیرۆكەی سەرەكی و هاوڕێی تر دارشتووە، ئەوانیش بریتین لە : بیرۆكەی هاوولاّتیان ( واتا ئەوانەی چونەتە ناو هاوكارییەوە) بـەو پێیـەی كەسـی ئـازاد و یەكسـانن و بیرۆكـەی كۆمەڵگای باش- رێكخراو *well-ordered* واتـا كۆمەڵگایـەك كـە بـەهۆی چەمكی گشتی دادپەروەرییەوە بە شێوەیەكی چالاك رێكخراوە.** [375]

راولز ئاماژە بەوە دەكات كە كۆمەڵگای سیاسی باش- ڕێكخراو دەبـێ سـێ تایبەتمەنـدی هەبێـت كە پشت بە چەمكی گشتی دادپەروەری دەبەستێت. ***یەكەم،*** ئـەو كۆمەڵگایەیـە كـە هەموو تاكێك و تاكەكان وەك یەكتر چەمكی سیاسی دادپـەروەری قبـولّ دەكـەن (بـەم جـۆرە پرەنسیپی خودی دادپەروەری سیاسی قبولّ دەكەن) و ئەمە ئەو شتەیە كە بیرۆكـەی چـەمكی گشتی دادپەروەری لەخۆی دەگرێت. ***دووەم،*** ئـەو بیرۆكـەی رێكخسـتنی خـاوەن توانسـتەكان لەخۆی دەگرێت، بە هۆی چەمكی گشتی دادپەروەرییەوە واتە ئـەو بیرۆكەیـەی كـە بونیـادی سەرەكی كۆمەڵگا - واتا دەزگا سیاسی و كۆمەلاّیەتیە سەرەكییەكانی وشێوازی پەیوەنـدییان لە سیستەمی هاوكاریدا - بیرۆكەیەكە خاوەن مەعریفیەكی گشـتییە، واتـا بـڕوا بـە راسـت بوونەكەی دەهێنرێ ـ لە پێناو بەدیهێنانی پرەنسـیپی دادپـەروەری. ***سـێیەم،*** دیسـان ئـەوەی بیرۆكەی ڕێكخستنی توانستەكان لەخۆ دەگرێت، ئەو بیرۆكەیەیـە كـە هاوولاّتیـان هەسـتێكی چالاكی دادپەروەریان هەیە و ئەمە یارمەتییان دەدات بۆ تێگەیشـتن و پیـادەكردنی چـەمكی گشتی دادپەروەری و كارپێكردنی لە زۆربەی كاتەكاندا بەو جۆرەی بارودۆخیـان لـە كۆمـەڵگا دەیەوێت بە ئەرك و ئیلتزاماتەكانیشەوە. [376] دادپەروەری ئەو چوارچێوەیەیە كە تاكە عەقلاّنی و خاوەن بەرژەوەندییەكان بەسەرخۆیانی دا دەسەپێنن، بۆ ئەوەی هاوكـاری ئـەوانیتر بەدەسـت بێنن. [377] راولز ئاماژە بۆ ئەوە دەكات كە چەمكی دادپەروەری وەك ئینساف تێگەیشـتنێكی سیاسـییە بـۆ دادپـەروەری و چـەمكێكی گشـتی نییـە، ولەسـەر بونیـادی دەزگـا سیاسـی

---

٣٧٥. جون راولز، سەرچاوەی پێشوو، ص٩٢ .

٣٧٦. سەرچاوەی پێشوو، ص٩٧.

٣٧٧. حسین بشیریە، سەرچاوەی پێشوو، ل ١١٦.

وکۆمەلاٌیەتییەکان جێبەجێ دەبێــت و عەقیدەیــەکی ئــەخلاقی گشــتگیر نییــە.[378] ئــەوەش پێویستی بە ئەرگۆمێنت و بەڵگەی عەقڵی هەیــە بــە پشــت بەســتن بــە زانیــاری و ئینســاف چەمکێکی سیاسیە وسیٚ سیمای هەیە:[379]

أ. چەمکێکی ئەخلاقیە، بۆ بابەتێکی دیاریکراو دادەڕێــژرێت، واتــە بونیــادی ســەرەکی کۆمەڵگای دیموکراتی.

ب. قبولٚ کردنی ئەم چەمکە واناکات هــیچ بیروبــاوەڕێکی گشــتگیری تایبــەتیش قبــولٚ بکرێــت، چــەمکی سیاســی وەك چــەمکێکی مــەعقول تــەنیا بونیــادە ســەرەکیەکانی خــۆی دەخاتەڕوو.

ج. چەمکی سیاسی دادپەروەری پەیوەستە بە کلتوری سیاسی کۆمــەڵگا دیموکراتیــەکان. بۆ نموونە ئاماژە بە بیرۆکەی کۆمەڵگا دەکەین وەك سیســتەمێکی بــە ئینســافی هاوکــاری و بیرۆکەی هاوولاتٚیە ئازاد و یەکسانەکان. ئەمانە تایبەتن بە کۆمەڵگا دیموکراتیەکان.

هەروەك ئاشکرایە جۆن راولز جارێکی تر تیــۆری گرێبەســتی کۆمەلاٌیــەتی دادەڕێژێتــەوە وهەندیٚ بنەمای تیۆری بۆ دادەنی و دەیبەستێتەوە بــە بیرۆکــەی دادپــەروەری وەك ئینســاف، بەلاٌم بۆ ئاماژەکردن بە رەوشی بەرایی یان (ئەسڵی) بۆ ئەوەی رێککەوتنێکی دادپەروەرانە لــە نێوان تاکە ئازاد و یەکسانەکان دا بێتەئاراوە و توشی چەواشــەکاری نــەبن، بیرۆکەی"پــەردەی نەزانی*Veil of Ignorance*" دادەنێت و «بانگهێشتی ئەوە دەکات خەیاڵی ئەوە بکریٚ کــە هەوڵبــدەین لەگــەڵ ئــەوانیتر دا بــۆ گەیشــتن بــە رێککــەوتنێکی ســەرەکی واتــە گرێبەســتی کۆمەلاٌیەتی کە لە بنیاتنانی کۆمەڵگا دا پرەنسیپەکانی دادپەروەری بەرجەستە دەکات».[380]

واتە تاکەکان لە رەوشی بەرایی دا و بەر لە گرێبەستی کۆمەلاٌیەتی لــە رەوشــێك دان کــە نازانن لە پشت پەردەی گرێبەست و پاش چوونە ناو کۆمەڵگا چی چاوەڕوانیان دەکــات، بۆیــە هەموویان یەکسانن. بەڕای راولز دەبیٚ رێککەوتنەکە گریمانەیی بێت نەك مێژوویی:[381]

---

٣٧٨. جون راولز، سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٣-١٠٠.

٣٧٩. سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٤.

٣٨٠. روبرت دال، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٦٨.

٣٨١. جون راولز، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٩.

(i)  گریمانەییە چونکە پرسیار لە لایەنەکان دەکەین سەبارەت بەوەی دەتوانن ڕێککەوتنی لەسەر بکەن و ئەوەی دەیانەوێت لەسەری ڕێکبکەون، نەك ئەوەی لەسەری ڕێککەوتوون.

(ii)  مێژوویی نیە چونکە گریمانەی ئەوە ناکەین کە ڕێکەوتن کراوە یان ڕەنگە لە کاتێکی تردا بکرێت و تەنانەت ئەگەر ئەوەش ڕوو بدات، هیچ لە ڕەوشەکە ناگۆڕێت.

(iii)  ئەو بنەمایەی کە لایەنەکان لەسەری ڕێکدەکەون دەبێ لە ڕێگای شیکردنەوەوە بڕیاری لەسەر بدرێت.

جۆن راولز بە گەلاڵەکردنی بیرۆکەی (ڕەوشی بەرایی) هەوڵدەدات پرۆسسێکی بەئینساف دابڕێژێت بۆ ئەوەی پرەنسیپەکانی دادپەروەری ڕێکەوتنیان لەسەر بکرێت، بەبڕوای راولز قەرارگرتنی بەشداربووەکان لە پشت (پەردەی نەزانی) پرۆسسی بڕیاردان و ڕێککەوتنی دادپەروەرانە دێتە ئاراوە، چونکە «تاك لەوەی پەیوەستە بە بەرژەوەندی هەستپێکراوی تاکەکەسیەوە، ڕێساکانی دادپەروەری هەڵدەبژێرێ چونکە دڵنیا نیە کە ڕەوشی چۆن دەبێت لە کۆمەڵگا نوێیەکەدا ».[382] راولز لە ڕەخنەگرتن لە سیستەمی دیموکراسی و لیبرالیزم بیرۆکەی سیستەمی دیموکراسی خاوەنداری موڵکایەتی *Property-Owning Democracy* دەخاتەڕوو کە بە بۆچوونی ئەو دەتوانێت ڕەوشێکی دادپەروەرانەتر لە نێوان ئازادی و یەکسانی دا بێنێتە ئاراوە و ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە یەکێك لە هۆکارەکانی گفتوگۆکردن لەسەر ئەم بیرۆکە قورسە بریتیە لە جیاوازی کردن لە نێوان دیموکراسی خاوەنداری موڵکایەتی کە هەموو بەها سیاسیە سەرەکیەکان بەدی دێنێت کە دوو پرنسیپەکەی دادپەروەری گوزارشتی لێ دەکەن، لەگەڵ دەوڵەتی چاودێری سەرمایەداری کە ئەمانە ئەنجام دەدات و ئێمە ئەم دیموکراسیە بە خیارێکی ئەلتەرناتیڤی سەرمایەداری لە قەڵەمی دەدەین.[383] راولز جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە دەستوەردانی دەوڵەت لە دابەشکردنی ئابووری و کاری بازاڕ دەبێت بە ڕادەیەك بێت کە زیان بە کارایی و گەشەی سیستمی ئابووری نەگەیەنێت. نایەکسانی داهاتەکان وەك پاڵنەری کار و بەرهەم هێنان بەردەوام زەروریيە.[384] دیموکراسی خاوەنداری وسیستمی ئیشتراکیەتی لیبرالی، چوارچێوەیەکی دەستووری بۆ پلانە دیموکراتییەکان دادەنێن و

---

٣٨٢. روبرت دال، سەرچاوەی پێشوو، ١٦٨.

٣٨٣. جون راولز، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٩٤.

٣٨٤. حسین بشیریە، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٢.

گرانتی ئازادییە بنەڕەتییەکان دەکەن، وێڕای بەهای بە ئینساف بۆ دەرفەتەکان (الفرص) و ئابووری و حالأتی نایەکسانیش لەخۆدەگرن. لە هەردوو سیستەمدا پرەنسیپی دادپەروەری بەدیدێت، ئەوەش کاتێك کە دەزگاکان بەو جۆرەی وەسف کراون کاربکەن، پرەنسیپی دادپەروەری یەکەم مافی خاوەندارێتی تاکەکەسی تایبەتی لەخۆ دەگرێت و ئەمەش جیاوازە لە مافی موڵکایەتی تایبەت بۆ ئامرازەکانی بەرهەم هێنان.[385] جیاوازییەکی تر بریتییە لە دەستگرتن بەسەر سامان وئامرازەکانی بەرهەم هێنان دا.

**لە دیموکراتییەتی خاوەنداری موڵکایەتی، خاونداری سامان و سەرمایە ڕێگا پێدراوە، بەڵام ڕێگری دەکات لەبەردەم بەشێکی بچووکی کۆمەڵگا بۆ بەڕێوەبردنی ئابووری و کۆنترۆڵ کردنی ئەوە لە کاتێك دایە لە سەرمایەداری دەوڵەتی چاوەدێری دا ڕێگە بە چینێکی بچووك دەدرێت مۆنۆپۆلی ئامرازەکانی بەرهەم هێنانی بەدەستەوە بێت.**[386]

ئامانجی دیموکراسی خاوەنداری موڵکایەتی بریتییە لە بەدیهێنانی بیرۆکەی کۆمەڵگا بەو پێیەی سیستمی هاوکاری بەئینسافی نێوان هاولاتییە ئازاد ویەکسانەکانە لە ناو دەزگا سەرەکییەکان کە نزیکی دەکاتەوە لە جۆرێك سۆسیالیزمی لیبرالی. هەر وەك ئاماژەی بۆ کرا لە چوارچێوەی دارشتنی تیۆر بۆ دیموکراسی راوێژگەری چەند بۆچوونی سەرەکی هەیە کە دەستووری و جەوهەرگەرا و ڕێکاری(اجرائی) و یان تێکەڵەیەك لە هەموویان لە خۆدەگرێت. راولز داکۆکی لە دیموکراسی دەستووری دەکات لە بەرامبەر دیموکراسی ئیجرائی دا و ئاماژە بەوە دەکات کە دیموکراتی خاوەنداری موڵکایەتی سیستەمێکی دەستوورییەوە ناتوانین بە دیموکراسی ڕێکاری (ئیجرائی) ناوی ببەین. سیستەمی دەستووری ئەو سیستەمەیە کە دەبێت یاساو مەراسیمەکانی گونجاوبێت و دژ نەبێت لەگەڵ ئازادی و مافە سەرەکییە دیاری کراوەکان دا، بەڵام دیموکراسی ئیجرائی سنوورێکی دەستووری لە خۆناگرێت کە زەبتی یاسادانان بکات و هەرچییەك لە زۆرینەوە[387] دەربچێت دەبێتە یاسا، بەمەرجێك ئەمە ڕێکارە گونجاوەکان

---

٣٨٥. جون راولز ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٩٨.

٣٨٦. سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٠٠.

٣٨٧. لێرەدا راولز ئاماژە بە کێشەیەکی جەوهەری دەکات کە دەتوانین بەشێك لە کێشەکانی ئێستای نێوان دەسەلأت و ئۆپۆزیسیۆنی هەرێمی کوردستانی پێ بخوێنینەوە، «بیرۆکەکە بریتییە لە بوونی هەندێ پێوەری

بگرێتەبەر، واتە کۆمەڵێك ڕێسا کە ماهیەتی یاسا دیاری دەکەن.[388] بەم جۆرە پرەنسیپە ڕێکارییەکان گرنگی نادەن بە وەسفی ئەوەی ناوەرۆکی یاسا دەبێت چۆن بێت، بەڵکو تەنیا بایەخ بە وەسف کردنی ڕێگاکانی دانانی یاسا دەدەن (لەسەر شێوازی مافی یەکسانی هەڵبژاردن) و مەرجی پێویست بۆ گرەنتی ئینسافی ئەم یاسایانە(بۆ نموونە ئازادی گوتار).[389] هەندێ لە لایەنگرانی دیموکراسی راوێژگەری بانگەشەی رزگارکردنی دەکەن لە دەمج بوونی لەگەڵ تەوژمی دەستووری لیبرالی. چونکە رایان وایە لەم حاڵەتەدا هەستە رەخنەییەکەی خۆی لەدەست دەدات. دیموکراسی پرۆژەیەکی دینامیکی کراوەیە و کاتێ وەك فاکتەری سەرەکی بۆ ئاسانکاری راوێژگەری راستەقینە سەیری دەوڵەتی لیبرالی بکات، ئەوا ئەمە بەواتای خۆگێل کردنە لە راستیە ئیمپریکیەکانی جیهان. بۆ نموونە دەوڵەتی لیبرالی بەشێوەیەکی یەکجار زۆر لە ژێر گوشاری ئەو کۆتوبەندانە دایە کە ئابووری سیاسی سەرمایەداری فرەڕگەز دەیچەسپێنێ.[390] پێوەری چوارەمی رۆبەرت دال (کۆنترۆلکردنی ئەجنداکان) بۆتە هۆی هاتنە ئارا جەدەلێکی گەورەی لە نێوان دیموکراتیە دەستورییەکان و دیموکراتییە ئیجرائییەکان، دەستورییەکان گومانیان هەیە لە تەحەکوم کردنێکی تەواو بە ئەجندا سیاسییەکان لە لایەن عامەی گەلەوە لە ترسی ئەوەی رەنگە بەرەنجامی ستەمکارانەی لێ بکەوێتەوە.[391] بەم جۆرە بەشێك لە بیرمەندانی دیموکراسی راوێژگەری کە خاوەن تێڕوانینێکی ڕێکارین رەدی ئەوە دەکەنەوە کە یاساکان لە خودی خۆیان دا جەوهەرێکی نەگۆڕیان هەبێت بە چەشنێك کە پەیوەست نەبن بە پرۆسس و ڕێکارە دیموکراتیەکان. ئەگەر بمانەوێت پەیوەندییەك لە نێوان تیۆری دادپەروەری وەك ئینساف و تێڕوانینی جۆن راولز بۆ گرێبەستی کۆمەڵایەتی

سەرەکی بۆ ئەوەی لە سایەی دا کردەی کۆمەڵێك خەڵك (با بڵێین ئەندامانی پەرلەمان) دەبێتە یاسا، نەك هی کەسانێکی تر. پرسیار ئەوەیە چی شوناسی ئەمانە دیاری دەکات وەك ئەندام پەرلەمان؟ چی ئەو بەیاناتانە دەکات بە یاسا ونایکات بە بڕیار یان پێشنیار یان تەنیا راهێنان لەسەر شانۆ ؟ .....هتد ، پێیوایە هەندێ پێوەری سەرەکی وجەوهەری لە هەموو سیستەمێکی یاسایی دا لە ئارادایە». هەمان سەرچاوە، ل٣٠٩.

٣٨٨. هەمان سەرچاوە، ل ٣٠٩.

٣٨٩. کولن فارلی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٧٤.

٣٩٠. سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٧٨.

٣٩١. هەمان سەرچاوە، ل ٢٦٢.

ودیموکراسی راوێژگەری بکەین، دەتوانین بڵێین یەکێك لە خاڵە گرنگـەکانی جـەخت کردنیـەتی لەسەر یەکسانی وئازادی تاکەکان لە ڕەوشـی بـەرایی دا کـە هـەموویان لـە پشـت پـەردەی نەزانینەوەن وهیچ کامیان ئەفزەڵیەتی بەسەر ئـەویتریان دا نییـە و تـەنیا لـە رێگـای راوێـژو گفتوگۆی خاڵیی لە دەسەلآت هەوڵ دەدەن بگەن بە ڕێککەوتن و بڕیاری عـەقلانی و پشـت بـە بەڵگەخوازی لۆژیکی ببەستن. بەواتایەکی تـر ئـەو رێککەوتنـەی دێتـەئاراوە، رێککـەونێکی بەکۆمەڵـە لەسـەر بنـەمای عەقلانییـەتی راوێژگـەری دامـەزراوە وکردەکـەیان کردەیـەکی عەقلانییە، چونکە لەسەر شتێك رێککدەکەون کە لە روانگەی هەموویانـەوە مەعقولـە. بـەم پێیە تیۆری راولز یەکێکە لە گرنگترین بنەما تیۆرییەکانی دیموکراسی راوێژگەری، ئەم تیـۆرە بەپێی بۆچونی راولز لەسەر بنەمای عەقڵی راوێژگەری دروست دەبـێ و «ئەمـەش بەرهـەمی گۆڕانی تێگەیشتنە لە چەمکی عەقڵ لەسەردەمی هاوچەرخدا واتە وەرچـەرخانە لـە عـەقڵی تاکەکەسییەوە بەرەو عەقڵی راوێژگەری».[٣٩٢] ئەمەش وادەکات لە میانی وتووێژێکی کراوە دا تاکەکان هەست بە هەندێ کێماسی بۆچوون و تێگەیشتنی خۆیان بکەن و فێری ئـەوە بـبن کـە بەشێك لە رایەکانیان لەسەر بنەمای لەرزۆك دامەزراوە و دەبـێ لـەوانیترەوە فێـر بـبن، بـەلاّم لێرەدا کێشەیەك دێتەئاراوە ئەویش ئەوەیە کە ئایا زەمینەی دیـالۆگێکی ئایـدیالی هەمیشـە لەبارو گونجاوە بۆ ئەوەی تاکەکان بەشێوەیەکی تەواو یەکسان رای خۆیان دەربڕن یان کۆمەڵێك فاکتەری گرنگی سایکۆلۆژی و ئابووری و کۆمەلاّیـەتی و کـەلتووری لـە پشـت دروسـتبوونی جیهانبینی و بڕیاری تاکەکانەوەیە.

٣٩٢. منصور میر احمدی، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢٣

## باسی دووەم

## تیۆری گفتوگۆ و دیموکراسی ڕێکاری Procedural Democracy

هابرماس وەك یەكێك لە بنەماكانی دیموكراسی راوێژگەری، تیۆری ئەخلاقی گفتوگۆ یان ئیتیكی گوتاری *Discursive* دەخاتەڕوو كە بەشێكە لە كۆی سیستەمی فەلسەفی هابرماس، لەم نێوەدا هەوڵ دەدات بەسوود وەرگرتن لە فەلسەفەی هیگڵ و كانت، بنچینەكانی ئەخلاقێكی نێوانخودی دابمەزرێنێ، چونكە لەسەردەمی مۆدێرنە و بەجیهانیبوون دا «پێدەچێت موقەدەس بێ توانا بێت لە خۆڕاگرتن لە بەرانبەر بەعەلمانی كردنی جیهان»[٣٩٣] و ئەو كێشە گەورانەی كە رووبەڕووی مرۆڤایەتی دەبنەوە كە پەیوەندییان بە كۆی ژیان و پێكەوە ژیانی و سیستەمی سیاسەتی نێودەوڵەتی و قەیرانە گلۆباڵەكانەوە هەیە، بەتایبەتی لە زەمەنی رێژەگەرایی كلتوری و ئایینی دا. لێرە دا پێشكەوتنی زانستیش رۆڵی هەبووە لە دروست كردنی "قەیرانی بنچینەی" ئەخلاقی بەو مانایەی كە كانت داوای دەكرد و بناغە عەقلانیەكەی كانتی روخاندووە.[٣٩٤] بەلاّم لەگەڵ هەموو ئەمانە دا هەندێ لە بیرمەندان لەسەر ئەو بڕوایەن كە مرۆڤ بوونەوەرییێكی ئیتیكیە (ئەخلاقیە)، ئەوە خەڵك نییە كە ئەخلاق دادەهێنێت بەڵكو ئەوە ئەخلاقە كە كەینوونەی مرۆڤ دیاری دەكات و هابرماسیش پێیوایە مرۆڤ بوونەوەرێكی ئیتیكی پەیوەندیكارییە.[٣٩٥] كەواتە یەكێك لەو پرسیارانەی كە هابرماس دەیەوێت وەلاّمی بداتەوە ئەوەیە كە ئایا دەتوانین هەندی پرەنسیپی یونیڤێرساڵ بۆ ئەخلاق دابمەزرێنین كە گوزارشت لە ئیرادەی هەمووان بكات و هێزی ئیلزامیشی هەبێت؟

---

٣٩٣. جاكلين روس، الفكر الاخلاقي المعاصر، ت:د. عادل العوا، عويدات للنشر و الطباعة، بيروت،٢٠٠١، ص٦٣.

٣٩٤. د. محمد عابد الجابري، قضايا في الفكر المعاصر، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ١٩٩٧، ص ٦٣.

٣٩٥. يورغن هابرماز ، اتيقا المناقشة و مسألة الحقيقة ، ترجمة وتقديم: د. عمر مهيبل، الدار العربية و ناشرون و منشورات الأختلاف، الجزائر- بيروت، ٢٠١٠ ، ل ٨.

## تەوەری یەکەم: هابرماس و ئەخلاقیاتی گفتوگۆ

ئەخلاق رەگی قوڵی لە نێو ئەفسانە و ئایین و فەلسەفە دایە کە هەریەکەیان بەجۆرێك راڤەیان کردووە بەڵام دەشێ لەسەرەتادا ئەم پێناسەیە بۆ ئەخلاق وەربگرین ((ئەخلاق لە ئاستی بیرکردنەوە دا بریتیە لە پەیوەندی تێگەیشتن و رەفتار، پەیوەندی ئاگایی مرۆڤ وەك تاك و گروپ، گەل و نەتەوە کە لە رێگایەوە تێدەگات، هزر خەسڵەتی هەڵسەنگاندنی هەیە و هەڵسەنگاندن نرخاندنی ئامانجەکانی بیرکردنەوەیە ، بە بیرکردنەوەی تیۆری و پراکتیکیەوە)).[396] ئەوەی گرنگە رۆڵی بیرکردنەوە و تێگەیشتنی مرۆڤە بۆ هەڵسەنگاندنی کردەوەی خۆی و ئەوانیتر، لەبەر ئەوەی وەك کائینێکی کۆمەڵایەتی و پەیوەندیکاری دەبێ دەرەنجامەکانی هەڵسوکەوتی ئەوانیتر و خۆی بنرخێنێ. کەواتە ئەخلاق بیرکردنەویەکی زیندووی لە پەرەسەندن دایە، چونکە پەیوەندییەکی بەردەوامی هەیە بە بیر و کار، وتە و کردەوە.[397]

### ١. ئەخلاقی خود- سەنتەر:

ئەخلاق یان کردەی ئەخلاقی کۆمەڵێك ئاداب و داب ونەریت ونۆرم و بەهایە کە کۆمەڵگا بڕیاری لەسەر دەدات لە کاتێکی دیاریکراو دا، بەڵام ئەوەی گرنگە ئاماژەی بۆ بکرێت ئەوەیە کە ئایا (کێ) ی کۆمەڵگا بڕیار لەسەر ئەخلاقیات دەدات، ئایا هەموو تاکەکان وەك یەك بەشدارن لە داڕشتنی پرەنسیپی ئەخلاقی و (دەبێ) و( نابێ) کان دا یان بەرهەمی بیرکردنەوەی هێز یان گروپێکی دیاریکراوی کۆمەڵگایە کە دەسەلاتیان هەیە؟

یەکێك لەو فەیلەسوفە هاوچەرخانەی بە قوڵی بیری لە چەمکی ئەخلاق کردۆتەوە و هەندێ فەرمانی رەهای بۆ داڕشتووە وەك بنچینەی جێگیر و هەمەکی، فەیلەسوفی ئەڵمانی(ئیمانوێل کانت)ە و لە گەڕان بەدوای ئەم بنەما گشتگیرە دا لەوە دەست پێدەکات کە (( لە نێو ئەو شتانەی کە دەتوانین وێنایان بکەین لەم جیهانەو لە دەرەوەی دا، هیچ شتێك بوونی نییە کە بشێت بێ ئەملاولا و بە رەهایی بە چاکە لە قەڵەمی بدەین، تەنیا یەك شت نەبێت: ***ئیرادەی چاکەخوازی***)).[398] لە روانگەی کانت یەکێك لەو خەسڵەتانەی کە مرۆڤ لە بوونەوەرەکانی تر

---

٣٩٦. جاکلین روس، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥.

٣٩٧. هەمان سەرچاوە ، ل ٦.

٣٩٨. أمانويل كانت، تأسيس ميتافيزقا الأخلاق، ت: د. عبدالغفار مكاوي، مراجعة د. عبدالرحمن بدوي، منشورات الجمل، كولونيا، ٢٠٠٢، ص ٣٧.

جیا دەکاتەوە ئیرادەیــە و کــاتێ ئــەم ویســتە ســەربەخۆ بێــت و وەك ئیرادەیــەکی چــاکەخواز دەربکەوێت، دەشێت ببێتە سەرچاوەیەك بــۆ هــەڵێنجانی یاســای ئــەخلاقی. کانــت بــۆ روون کردنەوەی ئەمە دەڵێــت هــیچ بــەخت و بلیمــەتی و داناییــەکی دونیــایی ناکرێــت بــە چــاکە بژمێردرێت، تەنیا ئەو کاتە نەبێت کە لە رێگــای ئیرادەیــەکی چــاکەخوازەوە بــەکاربهێنرێت، پێیوایە ئیرادەی چاکەخوازی لە خۆیدا و بەرەســەن چــاکەیە.[399] کانــت لــە فــەرمانی رەهــای ئەخلاق دا دەڵێت: «کارێك مەکە تەنیا ئەو کاتە نەبێت کە تەبایە لەگەڵ ئەو سەلمێنراوەی کــە واتلێدەکات لە هەمان کات دا کە بتەوێ بیکەیتە یاسایەکی گشتی».[400] بەم جۆرە ئەم یاسایە نەك هەر گشتییە و لەگەڵ جەوهەری مرۆڤ دا دەگونجێت، بەڵکو لەگەڵ یاســا سروشــتیەکانیش دا تەبایــە کــە پــەیڕەوی لــە سیســتەمێکی گــەردوونی دەکــەن. لــەم ســۆنگەیەوە کــرداری ئیرادەگەرانەی تاك دەکاتە پێوەر و دەڵێت: «با کردارەکەت بە جۆرێك بێــت هــەر وەك ئــەوەی بنەمای کردارەکەت بە هــۆی ئیرادەتــەوە ببێتــە یاســایەکی سروشــتی گشــتی».[401] کــردن و نەکردنی کردەیەك کە هەمان بنەمای ئیرادە و ئەخلاقە لای کانت، پەیوەندییەکی بــەهێزی بــە ئازادی تاکەوە هەیە و بە بۆچوونی ئــەو بیرۆکــەی ئــازادی بــە شــێوەیەکی تۆکمــە گرێــدراوی چەمکی سەربەخۆییە کــە ئەمــەش پەیوەســتە بــە پرەنســیبی یونیڤێرســاڵی ئــەخلاق و ئــەم پرەنسیپە بەکار دێت وەك بنچینەیەك بۆ هەموو هەڵسوکەوتێکی بوونەوەرە عاقڵەکان و ئەمــە بەسەر یاسای سروشت دا دەچەسپێ لە پەیوەندیی بە هەموو دیاردەکــان دا.[402] ئــەوەی کانــت دەیەوێت وەك هەندەك بۆ هەمەکیەتی ئەخلاقی وەری بگرێت بریتیە لە تاکێکی ئازاد و خاوەن ئیرادە کە دەشێت ویستی ئەم خودە خولقێنەری یاسای یونیڤێرساڵ بێت، بە مــەرجێك لەگــەڵ جەوهەری مرۆڤایەتی دابگونجێت، بەو پێیەی مرۆڤ لە خۆیدا ئامانجە نــەك ئــامراز و دەڵێــت: «کارێك بکە بە جۆرێك هەڵسوکەوت لەگەڵ مرۆڤایەتی لــە کەســی خۆتــدا و لەگــەڵ هــەموو

---

٣٩٩. وليام ليلي، مقدمة في علم الاخلاق، ت: علي عبد المعطى محمد، منشأة المعارف، الاسكندرية، ٢٠٠٠، ص ٢٨٣.

٤٠٠. أمانويل كانت، سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٣.

٤٠١. هەمان سەرچاوە، ل ٩٤.

٤٠٢. عزالدين الخطابي، الأخلاق والحرية بين ضرورة الواجب وعقلانية التواصل الديموقراطي -من كانط إلى هابرماس،لەرێکەوتی ٢٠١٠/١٢/٢٢ وەرگیراوە لەم سایتەی خوارەوە: ل ٣لە ٧.
http://www.altasamoh.net/Article.asp?Id=587

مرۆڤەکان بکە بە چەشنێك هەمیشە و لە هەمان کاتدا وەك ئەوەی لە خۆیدا ئامانج بێت، بە هیچ شێوەیەك وەك تەنیا ئامرازێك هەڵسوکەوتی لەگەڵ مەکە».[403]

بەم جۆرە کانت تاك دەخاتە چەقی سیستەمی دارشتینی ئەخلاقەوە و دەشێت خودەکان بەتەنیا بێ گەڕانەوە بۆ دەرەوە و ناوەوەی جیهان فەرمانە رەهاکانی ئەخلاق دابمەزرێنن. لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە کانت پێیوایە کە پرەنسیپی ئەخلاقی لەگەڵ تاك یان خودی خاوەن ئیرادە سەرهەڵدەدات، کە هەر تاکێك بە تەنیا دەتوانێ حوکمی هەمەکی (یونیڤێرساڵ) بوونیان بەسەر دا بدات و خۆی بکاتە چاوگی دامەزراندنی ئەم بنەما رەها و هەمەکیانە. یەکێك لەو رەخنانەی کە ئاراستەی فەلسەفەی ئەخلاقی کانت کراوە ئەوەیە کە پێوەری کانت بۆ ئەخلاق پێوەریکی شکلی ئەبستراکتە. بە رای کانت ئیرادەی چاکەخوازی دەتوانێ گوزارشت لە خۆی بکات بێ وەبەرچاوگرتنی ئەو دەرەنجامانەی لێیەوە دەردەچێت یان ئەو رەوشەی تێیدا دێتە ئاراو.[404] بەڵاّم ئەم رەخنەیە ناتوانێت شوێنی فەرمانی رەهای کانت بۆ ئەخلاق لەق بکات، چونکە وەبەرچاوگرتنی کات و شوێن رهایی ناهێڵێت و ئەمەش دژی جەوهەری بیرۆکەکەیە. بەڵاّم هابرماس بە جۆرێکی تر ئەم ئیشکالیەتە چارەسەر دەکات.

### ٢. ئەخلاقی نێوانخودی:

لەروانگەی هابرماسەوە خود دەتوانێت داڕێژەری ئەخلاق بێت، بەڵاّم ئەخلاق تەنیا کاتێ دەتوانێ هەمەکیەت وەربگرێ و ببێت بە هی هەمووان کە بخرێتە ناو گفتوگۆ و مشتومڕی جدییەوە. بەم جۆرە ئەخلاق لە روانگەی هابرماسەوە لە پێش دا بوونی نییە، بەڵکو ئەخلاق لە میانی گفتوگۆ و لە نێوان قسەکەر و بکەرەکان لە دایك دەبێت. « لای کانت یاسای ئەخلاقی شوێنگەی ئایدیای ئەفلاتونی داگیر دەکات، بە بەراورد لەگەڵ یاساکان کە لەوەوە دادەتاشرێن و لای هابرماس، ماف و لەوێشەوە ئەخلاق، بنەماکانی لە ناو گفتوگۆی گشتی دایە».[405] هابرماس پەیوەستە بە عەقلانیەتی کانتی و بڕوای بە بوونی عەقلی کردەیی هەیە، بەڵاّم عەقلێکی کردەیی تاك و تەرا نا کە پشت بە باوەڕە خودییەکانی دەبەستێ و تارادەی

٤٠٣. امانویل کانت، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٨-١٠٩.

٤٠٤. جاکلین روس، سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٢.

٤٠٥. رینر روشلتز، مارکس، هابرماس و الديمقراطية الراديكالية ، ت: سليم قندلفت، مجلة الفكر السياسي، مجلة فصلية تصدر عن اتحاد الكتاب العرب، العدد ٨، دمشق ، شتاء ٢٠٠٠، ص ٤٥.

خۆپەرستی *Solipsism* دوورەپەرێزە.[406] بە پێچەوانەی کانت کە یاسای ئـەخلاقی پشـت بـە ئیرادەی خۆی دەبەستێ، هابرماس پێیوایە تەنیا نۆرمە پەسەندکراوەکان لە لایەن ئەو کەسانەی کە دەکەونە ژێر کاریگەرییەوە و لە گفتوگۆیـەکی ئـازاد دا دەشـێت بەرژەوەنـدی بەشـدارانی گفتوگۆکە دابین بکات. کەواتە « نۆرمـە پاسـاودارەکان ئەوانـەن کـە لەگـەڵ "بەرژەوەندییـە گشتێنراوەکان" دا وەکیەك بن».[407] هەر بۆیـە هابرمـاس "ئـەخلاقی گفتوگـۆ یـان گوتـاری *Diskursethik*" بە باسێکی ئەخلاقی دانانێت بـە مانـا کلاسـیکیەکەی بـەڵکو باسـێکە، رێکاریی پێویستی تێدایە بۆ رێکخستنی گفتوگۆیەکی عـەقلانی کـە یارمـەتیمان دەدات بـۆ گەیشتن بە کۆدەنگیـەك سـەبارەت بـە نـۆرمی ئـەخلاقی هاوبـەش کـە خـودان سروشـتێکی یونیڤێرسالن و دەتوانین لەسەر بنەمای ئەمـە نـۆرمی ئـەخلاقی خـاوەن بنـەمای گـەردوونی (یونیڤێرسال) دابڕژین کە رەچاوی بەرژەوەندی هەموو لایەنە پەیوندیدارەکان دەکـات هەربۆیـە ئەخلاقی گفتوگۆ ئەخلاقێکی رێکارییە و بەرییە لە هەمووجۆرە ناوەرۆکێکی نۆرماتیڤ.[408]

> **کەواتە تیۆری ئەرگۆمێنت خوازی هابرمـاس لـە سـەرەتاوە تـا کۆتـایی لـە چوارچێوەی کردەی پەیوەندیکاری دا روودەدات... و گفتوگۆی کردەیی، گفتوگۆیەکی راستەقینەیە.کاتێ تاکەکان دەچـنە نـاو ئـەرگۆمێنت خـوازی ئەخلاقییـەوە ئـەوا بەشدارەکان لە هەڵوێستێکی بیریاریەوە بە دوای کردەوە و چالاکیەکانیان دا دەچن لە پێناو هێنانەوەی ئەو کۆدەنگییەی کە توشی پشێوی هاتووە.[409]**

هابرماس دوو جۆر گوتار لێك جیا دەکاتەوە: گوتاری ئیتیکـی و گوتـاری مـۆراڵی *Moral and Ethical Discourse* و لەسەر ئەم بنەمایە جیاوازی دادەنێت لەنێوان هەر دوو پرسـی داد و ژیـانی

---

٤٠٦. محمد الحاج، من كانط إلى كارل أتو آبل : نحو أخلاقية النقاش ، لە رێکەوتی ٢٠١١/٢/٢٠ لەم سایتەی خوارەوە وەرگیراوە: http://melhaj.maktoobblog.com/644816%D9%85%D9%86
–

٤٠٧. استیون وایت، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٩.

٤٠٨. محمدالاشهب، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٦٩.

٤٠٩. بول ريكور، الذات عينها كآخر ، ترجمة و تقديم و تعليق: د.جورج زيناتي، المنظمة العربية للترجمة، بيروت، ٢٠٠٥،، ص ٥٢٨.

چاك یان خۆش *good life* بەم پێیە پرسی داد (العدل) پەیوەستە بـە گوتـاری ئەخلاقییـەوە [٤١٠] و لـە بەرانبەر دا ژیانی چاك یان خۆش پەیوەستە بە گوتاری ئیتیکیەوە. [٤١١] « ئیتیکای گفتوگۆ بـە كردەوە دەیەوێت ئەوە بسەلمێنێت كـە دەرەنجامـە دینامیكیەكـەی لەسـەر بنـەمای گـەڕان و بەدواداچوونی دوولایەنەی ئاراستەدار دامەزراوە بۆ بنیاتنانی روانگەی ئەویتر، پاشـان تێكـەڵ كردنی بە خودی گریمانەكانی پراگماتیكی گفتوگۆی كردەیی». [٤١٢] بە رای هابرماس تەنیا كاتێ دەشێت پاساو بۆ نۆرمەكان بهێنرێتەوە « كە دەرەنجـام وكاریگەرییـە لاوەكییـەكانی بـۆ رازی كردنی بەرژەوەندی هەر تاكێك كە وا چاوەڕوان دەكرێت كە لە گونجانێكی هەمەكی لەگەڵ ئەم نۆرمە بێتەئاراوە، بێ زۆرەملێ و ناچاركردن لە لایەن هەمووانەوە قبوڵ بكرێـت». [٤١٣] كەواتـە تەنیا بەشداری راستەقینەی هەموو تاكێكی پەیوەندیـدار كەفیلـە بـۆ چـاودێری كردنـی ئـەو شێواویانەی كە لە راڤەی ئەو شتەی بەناوی بەرژەوەندی تاكەكەسـیەوە سـەرهەڵدەدات، واتـە ئەوە تاكە بەشدارەكەیە كە دیاری دەكات چی بەرژەوەندی ئەوە. [٤١٤] كەواتە هەموو نـۆرمێكی دروست مەرج نییە لە سەرچاوەیەكی بالآ دەرچووبێت بەڵكو دەبـێ ئـەم مەرجانـەی هـەبێت: ***یەكەم،*** بێلایەنی*Neutrality* یان ئینساف *Fairness*. ***دووەم،*** دەرەتانی گوزارشـت كـردن [لەم دوو تایبەتمەندییە] بە سیغەیەك كە بنەمای یونیڤێرسـاڵی هـەبێت. ***سێیەم،*** دەرەتـانی پاساوهێنانەوەی عـەقلانی بۆ خودی پرەنسیپی یونیڤێرسال كە ئەم نۆرمانە لە خۆ دەگرێت. [٤١٥]

---

٤١٠. پۆل ریكۆر جیاوازی دادەنێت لە نێوان ئیتیك Ethicque و ئەخلاق Moral . یەكەمیان لە ئەرستۆوە بۆمان ماوەتەوە و پەیوەستە بە هەموو ئەو شتانەی كە باش و چاك و خێرن و ا لە ژیان دەكات خۆش بێت، بەلاّم دووەمیان پەیوندی بە هەموو ئەو شتانەوە هەیە كە بە كردەی ناچاری لە قەڵەمیان دەدەین كە پابەندبوون و زۆرەملێی تێدایە و لەسەر بنەمای نۆرمێك دامەزراوە كە دروستیكەی یونیڤێرساله(گەردوونییە) و دەكرێت بگشتێنرێت و راستەوخۆ لە كانتەوە پیمان گەشتووە. پێشەكی ریكۆر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٢.

٤١١. محمدالاشهب سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٣٤-٣٣٥.

٤١٢. یورغن هابرماس، اتیقا المناقشة و مسألة الحقیقة، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٤.

٤١٣. استیون وایت، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٩.

٤١٤. جان مارك فیري، سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٢.

٤١٥. محمد الاشهب، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٧٧.

هابرماس سیٚ تایبەتمەندی سەرەکی بۆ ئەخلاقی گوتار یان گفتوگۆ دیاری دەکات:[416]

١-مەعریفەگەرایی *Cognitivism*: ئەخلاقی گفتوگۆ و مشتومڕ لەسەر ئەم گریمانەیە دامەزراوە که تەنانەت پرسی ئەخلاق بە شێوەیەکی مەعریفی و عەقلانی یەکالا دەکرێتەوە.

٢-دادپەروەری لە بەرانبەر ژیانی چاك دا: ئەخلاق پرسێکی نێوانخودییە. ئێمە کاتیٚ دەچینە نێو پانتایی ئەخلاقەوە کە لەگەڵ ئەوانیتر دا ناکۆکیمان هەبێت.

٣-بنچینەی یونیڤێرساڵ بوون *Universalization*: بە بڕوای هابرماس ئەو نۆرمانە خاوەن دروستین کە لەسەر بنەمای دادپەروەری یان بێلایەنی دامەزرابن، تەنیا ئەو نۆرمانە دەتوانن بانگەشەی دروستی بکەن کە تەئیدی هەموو ئەو کەسانەی بەدەست هێنا بێت(یان بتوانیٚ بە دەستی بێنیٚ) کە دەکەونە ژێر کاریگەرییەکیەوە.

لە روانگەی هابرماسەوە، لە حاڵەتی کردەی پەیوەندیکاری وەك بوارێك بۆ لێك تێگەیشتن لە پێناو رێککەوتن و قبوڵ کردن لە نێوان بکەرەکان، بە پێچەوانەی کردەی ستراتیژی بەشداربووەکان بە ئەرگۆمێنت مامەڵە لەگەڵ یەکتری دا دەکەن و ئەم ئەرگۆمێنتە پێش وەختە پێویستی بە بێلایەنی و بەرپرسیارێتی گفتوگۆکارەکان و سیفەتێکی مەعقول هەیە لە گوتارەکانیان دا، « بە گشتی گفتوگۆی راست و دروست رازیکەرە، پشت بە بەڵگە دەبەستیٚ نەك هەڕەشە: پشت بە هێزی بەری لە توندوتیژی و گوتاری ئەرگۆمێنتی دەبەستیٚ».[417] لێرە دا (زمان) رۆڵێکی بنچینەی دەگێڕێت و تاکە ئامرازی لیك نزیك بوونەوە و لێك تێگەیشتنی خودە سەربەخۆکانە، هەموو پەیوەندی و دیالۆگێك تەنیا لە رێگای زمانەوە ئەنجام دەدرێت، هەر بۆیە بە بڕوای هابرماس هەموو گوتەیەك بۆ ئەوەی وەك کردەی قسەیی مسداقیەتی هەبێت پێویستە بنگەشەی چوار جۆر دروستی بکات:[418]

١. بۆ تێگەیشتن شیان *Comprehensible*

٢. حەقیقەت *True*

٣. راستی *Rightness*

٤. راستگۆیی *Truthfulness*

---

٤١٦. منصور انصاری، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣١٥.

٤١٧. جاکلین روس، سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٦.

٤١٨. یوسف اباذری، خرد جامعەشناسی، طرح نو، ض ٢، تهران، ١٣٨٧(٢٠٠٨)، ص ٧٢-٧٣.

| بواری واقع | شێوازەکانی پەیوەندیکاری | بانگەشەی دروستی *Validity claim* | ئەرکە گشتییەکانی قسە |
|---|---|---|---|
| **"جیهان"ی سروشتی دەرەکی** | مەعریفی: هەڵوێستی بەبابەتی کردن | حەقیقەت *True* | پێشاندانی فاکتەکان |
| **دونیای کۆمەڵایەتی"ئێمە"** | کارلێکی: هەڵوێستی گونجان | راستی *Rightness* | دروست کردنی پەیوەندی نێوان کەسی مەشروع |
| **دونیای سروشتی ناوەکی"من"** | تەعبیری: هەڵوێستی تەعبیری | راستگۆیی *Truthfulness* | ئاشکراکردنی خودیەتی قسەکەر |
| **زمان** | ---------- | بۆتێگەیشتن شیان *Comprehensible* | -------------- |

خشتەی ئەرکی قسە و بانگەشەی دروستی [٤١٩]

لێرەدا هابرماس ئاماژە بە "رەوشی ئایدیالی قسە *Ideal speech situation* "دەکات، لەم رەوشە دا بەشداران ئامادەن رەهەندە کردەیی یان ستراتیژیەکانی قسە بێدەنگ بکەن لە پێناو دروست کردنی کۆدەنگی ئەمەش بە هاندانی بەشداران بۆ پشت گوێ خستنی تێبینی ستراتیژی و هێنانە ئارای پەیوەندیکاری و پانتاییەکی چالاك و بەهێز بەمەبەستی خۆدوورخستنەوە لە 'پەیوەندیکاری شێواوی سیستماتیك *Systematically Distorted communication*' [٤٢٠] کە تێیدا رێککەوتنی عەقلانی یان کۆدەنگی دێتەئاراوە. رێکاری گوتاریی دەبێت گرانتی ئەوە بکات کە هەموو پاڵنەرەکانی بەشداربووانی تریش، تا ئەو جێگەیەی کە بە ئاراستەی گەیشتنە بە کۆدەنگی،

419 . Jürgen Habermas, Communication and the Evolution of Society, Translated by Thomas McCarthy,Beacon Press,Boston,1979, p.68.

٤٢٠. رابرت آودی و ئەوانیتر، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٥٩٧-٥٩٨.

پێویسته له گفتوگۆ دا بگونجێنرێت.[421] كەواته لەپەیوەندی بە جیهانی سروشتی قسـەكەر بـە پشـت بەستن بە فاكتەكان و مەعریفە هەوڵی دەربڕینی حەقیقەت دەدات و لە جیهانی كۆمەڵایـەتیش دا بـە مەبەستی دروست كردنی پەیوەندی نێوان كەسی و لە پێنـاو كارلێـك تـاك راسـتی وتـەكانی دەكاتـە مەحەك و لە ئاستی خـودییش دا راسـتگۆیی مەبەسـتە، بـەڵام ئـەركی زمـان وەك فاكتـەری لێـك تێگەیشتن و پەیوەندیكاری بریتیە لە دروست كردنی كۆدەنگی.

**بە گشتی بوونی یاسا و ئەخلاق دەشێ لە روانگەی پرۆسسی كۆدەنگی لە زمان دا روون بكرێتەوە. كاتێ كۆمەڵگای ئایینداری دەگۆڕێ بـۆ كۆمـەڵگای هاووڵاتیە سۆلیدارەكان، ئەو كاتە ئەخلاقی یونیڤێرساڵ دەتـوانێ خەسـڵەتی ئیلزامی خۆی بپارێزێـت. تـەنیا یاسـایەكی فۆرمـالی كـە لەسـەر بنـەمای پرەنسـیپی ئەبسـتراكت دامـەزراوە دەتـوانێ دابەشـكردنی كـار لـە نێـوان مەشروعیەت و ئەخلاقیەت دا دروست بكات.**[422]

لێرە دا یەكێك لەو رەخنانەی ئاراستەی هابرماس جەكرێت ئەوەیە كە زۆر جـەخت لەسـەر رۆڵی زمان دەكات لە پەیوەندیكاری دا هـەر بۆیـە سـەبارەت بـە قـوڵ كردنـەوەی مـۆدێلی پەیوەندیكاری (هۆنیس) جەخت لەسەر توێژینەوە لەمەڕ لایەنە نازمانییەكانی پەیوەنـدیكاری كۆمەڵایەتی و فۆرمەكانی تری كارلێك دەكاتەوە وەك جوڵە و كردەی جەستەیی.[423] هابرماس پێیوایە كە كلیلی ئەخلاقی گفتوگۆ لەم دوو گریمانەیە پێك دێت: گریمانـەی ***یەكـەم***، خـۆی لـە بانگەشەی نۆرماتیڤ بۆ دروستی دەنوێنێ كە مانایەكی مەعریفی لە خۆ دەگرێـت و دەشـێت وەك بانگەشەی حەقیقەت مامەڵەی لەگەڵ دا بكرێت. گریمانـەی ***دووەم***. خـۆی لـە پێویسـتی چوونە ناو گفتوگۆیەكی راستەقینە دا دەنوێنێ بۆ دامەزراندنی نۆرم و فەرمانـەكان بـە پشـت بەستن بە عـەقڵ.[424] هابرمـاس ئەوە روون دەكاتـەوە «دانپیانـانی نێوانخـودی لەسـەر بنـەمای دروستی نۆرمەكان و یونیڤێرسال بوونیان دادەمەزرێ، بەو پێیەی كە لە لایەن هـەموو كەسـە پەیوەندیدارەكانەوە پەسندە و ئاماژە بەوە دەكات، نۆرمەكان ناتوانن بانگەشەی دروستی بكەن

٤٢١. استیون وایت، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٠.

٤٢٢. یورگن هابرماس ، نظریەی كنش ارتباطی - جهان زیست و نظام ، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣١.

٤٢٣. د. كمال منیر، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٣.

٤٢٤. نورالدین افایة، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٠٦.

تەنیا ئەو کاتە نەبێت کە تاکە پەیوەندیدارەکان ڕێکبکەون یان دەرفەتی ڕێککەوتنیان هەبێت وەك بەشدار لە گفتوگۆیەکی کردەیی سەبارەت بە دروستی ئەم نۆرمانە».[٤٢٥] هەر بۆیە پێیوایە کە نۆرمی ئەخلاقی لە کردەی پەیوەندیکاری ناستراتیژی دا دێتە ئاراوە، کە لە میانی گفتوگۆ و گۆڕینەوەی بیروبۆچوون و بانگەشەی دروستی. لای هابرماس هەموو شتێکی عەقڵی دەشێ گفتوگۆی لەسەر بکرێت، چونکە هەموو پێشنیارێك دەشێ لە چوارچێوەی سیستمی ڕێزمانی کارپێکراوی کۆمەڵگا دەرك بکرێت و نیازی قسەکەرەکەی بە جدیی وەربگیرێت. لێرە دا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە پراگماتیکی گشتی لەسەر بنەمای سێ گریمانە دامەزراوە:[٤٢٦]

١. قسەکەرەکان توانای بەکارهێنانی ڕستەیان هەیە لە کردە قسەیەکان دا .

٢. توانای ئیمە لەسەر بنەمای "هۆشیاری ڕاستەوخۆ لەمەڕ ڕێزمان" دامەزراوە.

٣. ئامانجی پراگماتیکی گشتی دۆزینەوەی سیستەمی گشتی ڕێزمانە.

هەر بۆیە لە دیدی هابرماسەوە هیچ نۆرمێك بوونی نییە تەنیا ئەو کاتە نەبێت کە دەرفەتی تاقیکردنەوەیەکی عەقلانی بۆی لە ئارا دا بێت.[٤٢٧] کەواتە بە پێچەوانەی کانت هابرماس پێیوایە کە تاك لە گفتوگۆ و بە ڕێککەوتن لەگەڵ بکەرەکانی تر نۆرمی ئەخلاقی دروست دەکات.[٤٢٨] ئەخلاقیاتی گفتوگۆی هابرماس لە خود- سەنتەری لە فەلسەفەی کانت جیاوازە، چونکە فەلسەفەی کانت لە داڕشتنی سێ فەرمانە ڕەهاکە دا، لە خودەوە دەردەچێت کە وادەکات خود ناوەندی دارشتنی نۆرمی ئەخلاقی بێت کە پێیوایە بۆ مرۆڤایەتی گونجاوە، بەڵام تیۆری هابرماس لە بیرۆکەی نێوانخودی دەست پێدەکات. هابرماس پێیوایە کە خود لایەنێکی بکەرە وەك سەرجەم بکەرەکانی تر کە پەیوەندییان بە فەرمان و نۆرمە ئەخلاقی و کۆمەلآیەتیەکانەوە هەیە، هەربۆیە دەبێ هەموو لایەنە پەیوەندیدارەکان لە چوارچێوەی گفتوگۆیەکی کراوە دا لە داڕشتنی ئەخلاق دا بەشدار بن. بەلآم لێرە دا یەکێك لەو کیشانەی ڕووبەڕوومان دەبێتەوە ئەوەیە ئایا لەسەر چ نۆرم و پێورێك، گفتوگۆ ڕێکدەخرێت بۆ دیاری

---

٤٢٥. عزالدين الخطابي، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣

٤٢٦. منصور انصاري ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٩٢.

٤٢٧. عزالدين الخطابي ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤.

٤٢٨. منصور انصاري ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣١٣.

کردنی بنەماکانی ئەخلاق، ئایا ئەم نۆرم و پێوەرانە چۆن دەسەلمێنرێت کە ئەخلاقین یان نا. بۆ ئەم مەبەستە هابرماس سێ ڕێسا بۆ گفتوگۆیەکی عەقلانی دادەڕێژێت: [٤٢٩]

١. هەموو خودێك کە توانای قسە و کردەوەی هەیە بەشێکی تەواوی لە گفتوگۆ پێدەبرێت.

٢. أ- هەموو خودێك مافی ئەوەی هەیە هەموو جۆرە کێشەیەك بوروژێنێت یان نارەزایەتی دژی هەرچەشنە تەئیدێك دەرببرێت.

ب- هەموو خودێك مافی قبولکردنی هەموو سەلماندنێکی هەیە لە بەرەکانی گفتوگۆ دا.

ج- هەموو تاکێك مافی گوزارشت کردنی هەیە لە بۆچوون و ئارەزوو و خواستەکانی خۆی.

٣.نابێ پێشگیری لە هیچ گفتوگۆکارێك بکرێت لە وتووێژ دا و نابێ گوشاری دژ بەکار بهێنرێت لە ناو گفتوگۆ یان دەرەوە، بەمەبەستی ئاستەنگ دروست کردن بۆ ئەوەی سوود لەو مافانە وەرنەگرێت کە لە ڕێسای یەکەم و دووەوم (أ) و (ب) دیاری کراون.

نابێ هیچ شتێك لە کردەی پەیوەندیکاری یان گفتوگۆی کردەیی دا خۆی لێ بپارێزرێت، جا شتەکە پەیوەندی بە دەسەلاتەوە هەبێت یان سامان یان نەریتەوە، بەکورتی بنەما ڕێکارییەکان بریتین لە باکگراوندی ئەگەری گەیشتن بە کۆدەنگیەکی عەقلانی سەبارەت بە دروستی نۆرمەکان و پێویستی بە بیرکردنەوە و ئالۆیر و گۆڕینەوەی وەکیەك هەیە.

هابرماس پێیوایە هیچ دیموکراسیەك بوونی نییە بێ گوێگرتن لە ئەویتر و دانانی پێی و بە بێ گەڕان بە دوای بەهایەکی یونیڤێرسال(هەمەکی) لە ناو گوزارشتێکی خودیی بۆ هەر هەلبژاردنێك دا [٤٣٠] و ئەرگۆمێنت خوازی لە ئازادی و پالنەری عەقلانی نزیك کردۆتەوە، و گفتوگۆی ناو پانتایی گشتی لە عەقلانیەتی سیاسی و مەشروعیەتی دیموکراتی نزیك دەکاتەوە و هەروەها ئاماژە بەوە دەکات کە پەیوەندیکاری مەیدانی دەرکەوتنی عەقلانیەتە و لە میانی ئەمە پەیوەندی کۆمەلایەتی وەك واقعێکی سیمبولیك بەدی دێت بەهۆی دروستی گوتارەوە. [٤٣١] بە بێ گفتوگۆیەکی گشتی کە لە ڕووی بنەماییەوە ملکەچی ڕێساو سیستەمە کە وەك

---

٤٢٩. حسن مصدق، أسس علم التواصل في الفكر الألماني المعاصر ، مجلة العرب والفكر المعاصر، بيروت، العدد ١٣٠-١٣١، ص١٠٥.

٤٣٠.ألان تورين، نقد الحداثة ، ت: أنور مغيث، المجلس الأعلى للثقافة، القاهرة ، ١٩٩٧، ص ٤٣١.

٤٣١. عزالدين الخطابي، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣.

پێداویستی ئەم جۆرە گفتوگۆیە خۆیان دەنوێنن، هەموو ئەگەرەکانی گەیشتن بە رێکـەوتنێکی بەهادار لەناو دەچێت. بەم جۆرە حەقیقەت لای هابرماس جیاناکرێتـەوە لـە قسـە و زمـانی پراگمـاتیکی، بـەڵکو لـە نێـو گفتوگـۆ و رسـتە دروسـت دەبێـت کـە لـە نێـوان خـودە بەرهەمهێنەرەکانی پەیوەندکارییەوە دێتە ئاراوە، لەم سۆنگەیەوە هابرماس بە تیۆرەکەی خۆی بۆ حەقیقەت، وەهمی تاك حەقیقەتی و حەقیقـەتی بـالا هەڵدەوەشـێنێتەوە بەتایبـەتی لـە سەردەمی دیالۆگ و ململانێی جۆراوجۆر دا. [٤٣٢] سەرەڕای بوونی توانسـتی پەیوەنـدی و لێـك تێگەیشتن لای مرۆڤ لە رێگای زمانەوە، بەلاّم هەندێ ئاستەنگ لەبەردەم تاکـەکان دایـە کـە وادەکات پەوەندییـەکی شـێواو دروسـت ببێـت و «ژمارەیـەکی زۆر لـە حاڵەتـەکانی خـراپ تێگەیشتنی بێتە ئاراوە کە پەیوەندی بە حوکمە پێش وەختە نەگونجاوەکان، نارونی، ژاوەژاو و رێکخستنێکی خۆسەپێنانەی ژیانی تاکەکان لە رێگای سیستەمێکی ئەخلاقی داپلۆسـێنەرەوە هەیە». [٤٣٣] کەواتە یەکێك لە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی تیـۆری گفتوگـۆ دوور خسـتنەوەی ئەگەرەکانی بەکارهێنانی توندوتیژییە بۆ چارەسەرکردنی کێشە کۆمەلاّیەتی و سیاسـییەکان . هابرماس رای وایە کە نـۆرم لـە چوارچـێوەی ئـەخلاقیاتی توندوتیـژی ناتوانێـت بانگەشـەی دروستی بکات وئەو نۆرمانە خاوەن پاساوی عەقلاّنین کە هەموان لەسەری کۆکن. بەم جـۆرە پرەنسیپی گوتاریی، پەیوەندی توندوتیژی و هێز دەگۆڕێت بۆ پەیوەندی گفتوگۆ و مشتومڕ لە ململانێی بەرژەوەندییەکان دا دەتوانێ پەیوەندی هێز سنووردار بکات لە نێوان لایەنەکان دا بە جۆرێك گرانتی یەکسانی نێوانیان بکات سەبارەت بە دەرفەتی بەشداری لە دانوسان و بـەرگری کردن لە بەرژەوەندییەکانیان. [٤٣٤]

تیۆری ئەخلاقی گفتوگۆ بە یەکێك لە مەرجـە سـەرەکیەکانی چارەسەرکردنیکێشـە فـرە رەهەندە کلتووری و سیاسیەکان دادەنرێت لە سەردەمی ئێستا دا و پاش لاواز بوونی ئەخلاقی ئایینی و نەریتی بۆ پتەوکردنی پرەنسیپ و بەها و نۆرمی نـوێ لەسـەر بنـەمای عـەقلاّنی. لێرەوە دەتوانین بلێین ئەخلاقی گفتوگۆ نە رێبازە نە سیستەمێکە لە بەها و نـۆرم و فـەرمانی دیاریکراو لە ناوەڕۆکی خۆیدا، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شتەی کارل ئاتۆ ئاپڵ بە پراگماتیکی

---

٤٣٢. جان مارك فيري، فلسفة التواصل ، ترجمة عمر امهيبل، منشورات الاختلاف، الجزائر ٢٠٠٦، ص٧٥.

٤٣٣. رینر روشلیتز، سەرچاوەی پێشو، ل ٤٥.

٤٣٤. حسن مصدق ، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٩٥.

ترانسیندنتالی ناوی دەبات کە مەرجەکانی گفتوگۆ و تیژ وپرەنسیپە کردەییەکان لەخۆدەگرێت لە بواری ئەخلاقی و سیاسی دا بە مەبەستی تاقیکردنـەوەی مەشـروعیەت و مەعقولیـەت و دروستیکەی.[435] هابرماس دوو خاڵی تر بە نۆرمەکانی گفتوگۆوە زیاد دەکات:

أ- هەر کەسێك دێتە ناو گفتوگۆ دەبێت دروستی (الصلاحیة) رێکارەکانی وتووێژ قبوڵ بکات.

ب- هەر کاتێ گفتوگۆ پەیوەست دەبێـت بـە بانگەشـە نۆرماتیڤـەکان- واتـە بانگەشـە سەبارەت بە رێکخستنە بەدیلەکان بۆ رازی کردنی بەرژەوەندییەکان- دەبێ بەشداربووان ئـەوە پەسند بکەن کە هەمەکیەت، تاکە رێکارە کە لە سایەیان دا ئـەو نۆرمانـەی هـەر کەسـێك هەڵیاندەبژێرێ مەشروعن.[436]

لە روانگەی (کارل ا. ئاپڵ) ەوە ئەخلاقی یونیڤێرساڵ ناوەرۆکی هەموو فەلسەفەیەکە بەلاّم ئەم حالّتە پارادۆکسالّە. چونکە لـە لایەکـەوە لـە راسـتی دا پێویسـتی ئـەخلاقێکی تیـۆری یونیڤێرسال واتە ئەخلاقیك بتوانێ هـەموو کۆمـەلّگای مرۆڤایـەتی لـە بـاوەش بگرێـت کـە هەلّبەتە هیچ کاتێ هێندەی سەردەمی ئێمە پێداگری لەسەر نەکراوە، کە لە میانی کاریگەری تەکنەلۆژیا بـۆ دروسـت کردنـی کۆمەلّگایـەکی یـەکگرتوو لـە ئاسـتی جیهـانی دا هەسـتی پێدەکەین. بەلاّم لە لایەکی ترەوە، لە رووی عەقلّیەوە ئەرکی فەلسەفەی ئێسـتا دامەزرانـدنی ئـەخلاقێکی تیـۆری یونیڤێرسـال نییـە، هەلّبەتـە قـورس نییـە، بـەلّکو ئاوێتەیـە بـە نائومێدی.[437] (زیگمۆند باومن) رەخنە ئاراستەی هابرماس دەکـات و رای وایـە کـە ئایـدیای هابرمـاس سـەبارەت بـە کۆمـەلّگا لـە جـۆرە سـیمینارێکی کۆمەلّناسـی وەرگـیراوە، واتـە سیمینارێك کە بەشدارە ئامادەبووەکان تەنیا شتێك کە لایان گرنگی هەیە هێزی ئەرگۆمێنتە، بەلاّم ئەمە بێ بایەخ کردنی فاکتەرەکانی ترە کـە لـە پشـت گفتوگـۆی بەروالّـەت ئـازاد دا پەنهانـە و نەهێشـتنی بەرەنجامەکانیـەتی و لێـرەدا پرسـی حەقیقـەت لەگـەلّ کـۆدەنگی و رێککەوتن تێکەلاّو دەبێت.[438] لاوازبوونی بنچینە ئەخلاقییە میتافیزیکیەکان کە یان پشـتی

---

٤٣٥. محمد الحاج، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣.

٤٣٦. هەمان سەرچاوە ، ل ١٢٣.

٤٣٧. جاکلین روس، سەرچاوەی پێشوو، ل٦٨.

٤٣٨. زیگمونت باومن، اشارتهای پست مدرنیتە، ت: حسن چاوشیان، انتشارات ققنوس، تهران، ١٣٨٤(٢٠٠٥)، ل ٣٦١.

به موقەدەس دەبەست یان بە فەلسەفەی ئایدیایستی و بلاو بوونەوەی ڕێژەگەرایی لە لایەك و ئاوێتەبوونی کلتور و بەها و نۆرمە جیاوازەکان لە لایەکی ترەوە، دامەزراندنی پرەنسیپی یونیڤێرسالی گفتوگۆی کردەیی وەك پێویستی سەردەم دەخاتەڕوو، واتە دروست کردنی هەندێ بنچینەی ئەوتۆ کە هەم خاوەن هەمەکیەت بێت و هەم لە توانای دابێت گوزارشت لە ئیرادەی ئازادی تاکەکان بکات، چونکە بەشێکی گەورەی کێشەکان ڕەهەندی گەردوونیان هەیە و پێویستیان بە کۆدەنگی و چارەسەر هەیە.

## تەوەرەی دووەم: دیموکراسی و ڕێکارە یاساییەکان

### ١. دیموکراسی و پەیوەندیکاری

هابرماس دەڵێت مۆدێلی پەسندی دیموکراسی بریتیە لەوە کە دەرفەتی ئەوە بە هەموو هاوولاتیان دەدات کە گوزارشت لە ئینتمای کلتوری و عورفی خۆیان بکەن و ئەو توانایەیان پێ دەبەخشێت کە لێك تێگەیشتنێك بێننە ئاراوە سەبارەت بە پێشنیارە پەسندکراوەکان لە لایەن هەموانەوە، ئەم مۆدێلە تەنیا کاتێ دادەمەزرێت کە پەیوەست بکرێت بە گفتوگۆی گشتیەوە.[٤٣٩] کەواتە خاڵی بنەڕەتی لە سیستەمی دیموکراسی دا پەیوەستە بە پێش گریمانەی ئازادی ڕادەربڕین بۆ گوزارشت کردن لە ویست و داخوازییەکان کە پێویستە لە چوارچێوەی سیستەمێکی یاسایی- دیموکراتی دا ڕێك بخرێت و ئەمەش لەسەر بنچینەی پەیوەندیکاری بە مانا هابرماسیەکەی واتە «کارلێکی نێوان دوو خود کە توانای گفتوگۆیان هەیە لە ڕێگای وتە و وشە و ڕستەوە».[٤٤٠] بۆ پیادەکردنی ئیرادەی سەربەخۆی خۆیان. ئاشکرایە پرسی دیموکراسی لەبەر ئەوەی پرسی ئازادی و هاوولاتی بوون و فرەیی و لێبوردەییە، لە بنەڕەت دا پەیوەستە بە پرسی سەروەری و دانپیانان: سەروەری گەل لە میانی دەستە و نوێنەرەکانی هاوولاتیان و بەرزکردنەوەیان بۆ ئاستی بەرپرسیارێتی نیشتمانی و دانپیانانی دەستووری بە مافە بنەڕەتیەکانی هاوولاتیان.[٤٤١] هەربۆیە دیاریکردنی چارەنووس بە شێوەیەکی دیموکراتی کاتێ

---

٤٣٩. ابوالنور حمدي ابوالنور حسن، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٨٩.

٤٤٠. هەمان سەرچاوە، ل ١٨٨.

٤٤١. عزالدين الخطابي، اسئلة الحداثة و رهاناتها- في المجتمع و السياسة و التربية، منشورات الأختلاف ، الجزائر، ٢٠٠٩ ص ٦٥.

دێتەدی کە گەلی دەوڵەت دەگۆڕێت بۆ نەتەوەیـەك لـە هاوولاَتیـان کـە جڵـەوی چارەنووسـی سیاسی خۆیان بەدەستەوە دەگرن، لە میانی دروست کردنی هاوبەشی و ئەمەش دەبێتـە هـۆی هاتنە ئارای یەکسانی بۆ هەمووان و پشتیوانی کردنی هاوبەشی نێوان هەموو هاوولاَتیان.[٤٤٢] دیارە ئەمەش پەیوەندی راستەوخۆی هەیـە بـە چـۆنیەتی پێناسـەی سیسـتەمی سیاسـی بـۆ هاوولاَتی بوون یان بوونی ئەو تاکانـەی کـە لـە سـنوورێکی دیـاریکراو دا دەژیـن و مـەرجی بنـەڕەتی ئەوەیـە کـە ئـیرادەی سـەربەخۆی تاکـەکان بڕیـاردەر بێـت لەسـەر چـارەنووس و یەکلاکردنەوەی ململانێیەکان لە چوارچێوەی سیستەمێکی یاسایی دیموکراتی د ا چـونکە وەك (ریکۆر) دەڵێت: «دیموکراسی سیستەمێکی سیاسی بیٚ ململانـیٚ نییـە، بـەلاَم سیسـتەمێکە ململانیٚ لەناویدا کراوەیە و دەشێت دانوسان بکرێت بە گوێرەی رێسای تەحکیمی ناسراو».[٤٤٣] هابرماس رەخنە لە دیمـوکراس جـەماوەری *Mass democracy* دەگرێـت و رای وایـە بـۆ وەرگرتنی شەرعیەت لە جیاتی گرنگی دان بە گفتوگۆی گشتی پشـت بـە هوتـاف و هەڵهەلـە *Acclamation* دەبەستیٚ نەك گفتوگۆی کراوە[٤٤٤] و دەڵێت:

> **« ئێستا وا لە دیموکراسی تێناگەین کە بریتیە لەو مەرجانەی کە یارمەتی بـەدیهاتنی بەرژەوەندییـە مەشـروعەکان دەدات لـە رێگـای بـەدیهێنانی بەرژەوەندی بنەڕەتی لە پێناو بەشداری و دیاری کردنـی چـارەنووس، بـەڵکو دیموکراسی هیچ مانایـەکی نییـە جگـە لـە چوارچـێوەیەکی چاکسـازی بـۆ دابەشکردن لە پێناو قەرەبوکردنەوەی گونجاو بۆ سیستەم، واتـە فاکتـەرێکی رێکخستنە بۆ تێرکردنی بەرژەوەندی تایبەتی».[٤٤٥]**

---

٤٤٢. یورغن هابرماس ، الحداثة وخطابها السیاسي ، ت:د. جورج تامر، دار النهار للنشر، بیروت، ٢٠٠٢، ص ١٢٧-١٢٨.

٤٤٣. بول ریکور، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٨٩.

٤٤٤. یورغین هابرماس، التقنیة و العلم کأیدولوجیا، ت: حسن صقر، منشورات الجمل، کولونیا، ٢٠٠٣، ل ١٤٣.

٤٤٥. ابوالنور حمدي ابوالنور حسن، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٠٤.

ئەمەش رەخنە گرتنە لە دیموکراسی شکلی[٤٤٦] کە بە بێ گرنگـی دان بـە پـێش زەمینـەی ئابووری و سیاسی و کلتوری و رەخساندنی واقعێکی راستەقینە بۆ بەشداری لـە دەسـەڵاتی سیاسی تەنیا گریمانەی بوونی دەرفەتی یەکسان دەکاتە پێوەر. هەر بۆیە بـە رای هابرمـاس « دیموکراسی جەماوەری ئامانجەکەی بریتی نییە لە بە عەقلانی کردنی کۆنترۆڵ بە هۆی بەشداری هاوولاتیان لە کردەی گوتاریی دا بۆ دروست کردنی ئیرادە، بەو رادەیەی کە سیغەیەکی گونجاو دێنێتە ئاراوە بۆ یەکالاکردنی کێشەی نێوان نوخبـە بالادەسـتەکان».[٤٤٧] ئـەم دیموکراسـییە بوونی خۆشگوزەرانی بە بێ ئازادی دابین دەکات و هیچ پەیوەندییەکی بە یەکسانی سیاسی بـە مانای دابەشکردنی یەکسانی دەسەلاتی سیاسی و بـە واتایـەکی تـر دەرفـەتی پیـادە کردنـی دەسەلات نییە . لەم حاڵەتەدا دیموکراسی هیچ نییە جگە لە مافی شـکڵی هـەبوونی دەرفـەتی یەکسان بە ئاراستەی بەدەست هێنانی دەسـەلات، واتـە یەکسـانی هەلومـەرج بـۆ بەدەسـت هێنانی کورسی دەسەلات لە رێگای هەڵبژاردنەوە، ئیتر ئامانجی دیموکراسی بە عەقلانی کردنی دەسەلاتی سیاسی نییە لە رێگای بەشداری هاولاتیان لە پرۆسی گوتاری دروست بوونی ئـیرادە نییە بە ڵکو بە پێچەوانەوە لێرەدا مەبەست لە دروستکردنی هەلومەرجی پێویستە بۆ سازشی نوخبە دەسەلاتدارەکان .[٤٤٨] بەم جۆرە هابرماس پێیوایە « دیموکراسی مەرجی کۆتایی خـۆی لە لۆژیکی کردەی پەیوەندیکاری دا دەدۆزێتەوە و پەرەپێدانی نۆرم و فۆرمەکانی مەشروعیەت ملکەچی لۆژیکێك دەبێت کە خاوەن ئۆتۆنۆمی خۆیەتی، بـەلام پاشـکۆی پرسـی حەقیقەتـە، سەربەخۆیی خودی مەرجی دەرفەتی دیموکراسی دابین دەکات».[٤٤٩]

هەر بۆیە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ململانێی کۆمەلایەتی هیچ کاتێ پێکدادانێکی تەواو یان گەمەیەکی بەرەنجام سفر نییە وەك پەیوەندی نێـوان کڕیـارو فرۆشـیار لـە بـازاڕ دا،

---

٤٤٦. هابرماس دیموکراسی شکلی لە بەرانبەر وشەی جەوهەری Substantive یان بە وتەی هابرماس دیموکراسی عەقلانی بەکار دێنێت کە تێیدا دەسەلات بێ ترس و هەڵخەڵەتاندنە. پیتر میلر، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٥١.

٤٤٧. یورغن هابرماس ، الحداثة وخطابها السياسي، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٧٤.

٤٤٨. یورگن هابرماس ، بحران مشروعیت — تئوری دولت سرمایەداری مدرن، ت: جهانگیر معینی، گام نو، تهران، ١٣٨٠(٢٠٠١)، ل ١٤٩.

٤٤٩. هەمان سەرچاوە، ل ١٧٥.

چونکە هیچ ململانێیەکی کۆمەلآیەتی بوونی نییە بێ مەرجەعیەتێکی کلتوریی گشتی و مشتومڕی دیموکراتی سێ ڕەهەند لەخۆدەگرێ:[450]

١. کۆدەنگی کە پشت بە ئاراستەی کلتوری هاوبەش دەبەستێت.
٢. ئەو ململانێیەی کە نەیاریی لەسەر دادەمەزرێت لە رووبەرووبوونەوە لەگەڵ یەکتری دا.
٣. چارەیەکی نێوەندی کە ئەم ململانێیە و ڕێزگرتن لە چوارچێوەیەکی کۆمەلآیەتی - بەشێوەیەکی وردتر یاسایی- دا پێکەوە کۆ دەکاتەوەو سنوورێك بۆ ئەم ململانێیە دادەنێت.

بەو مانایە کە لە هەموو ململانێیەك دا مەیلیك هەیە بە ئاراستەی لێك تێگەیشتن و دروست کردنی کۆدەنگی لە پێناو دۆزینەوەی چارەیەکی نێوەند لە نێوان نەیارەکان دا چونکە ئەگەر ئەمە روونەدات ئەوا کۆی یەکانگیری و سۆلیدارێتی کۆمەلآیەتی هەرەس دێنێ. هابرماس ئەوە روون دەکاتەوە کە تیۆری گفتوگۆ دەتوانێ ڕێکار و مەرجەکانی پەیوەندیکاری دیاری بکات کە بەشداری دەکەن لە دروست کردنی سیاسیانەی را و ئیرادە کە بە کردەوە کار دەکەن وەك رایەلێك کە دوو کەناڵ بەیەکەوە دەبەستێتەوە، کەناڵێك تایبەتە بە دەسەلآت و کەناڵێکی تر کە تایبەتە بە پانتایی گشتی.[451] کەواتە ئەگەر لەم خاڵەوە سەیر بکەین دیموکراسی وەك سیستەمێك دەردەکەوێت کە بە هۆیەوە کۆمەڵگا دەتوانێ بە بێکەردترین شێوە بگاتە ئاگایی لەمەڕ خۆی. هەرچەندە هەڵسەنگاندن و پیاچونەوە و رۆحی رەخنە لە رەوتی کاروباری گشتی دا رۆڵێکی زیاتری هەبێت ئەوا ئەو ولآتە دیموکراتی تر دەبێت.[452] بە بڕوای هابرماس ئەرکی ئێستای دیموکراسی رادیکال دروست کردنی سەدێکی دیموکراتیانەیە دژی دەست درێژی ئیستعماریانەی فەرمانە ئیلزامیەکانی سیستەم لە هەندێ بەشی جیهانی ژین دا. ئەم ئەرکە ئەرکێکی بەرگریکارانەیە: پاسەوانی کردن لە بونیادەکانی دانپیانانی دوولایەنە و پەرپرسیاریەتیەکەی لەگەڵ پانتاییە گشتیە نارەسمیەکان و ئەنجومەنە

٤٥٠. ألان تورين، نقد الحداثة، ت: أنور مغيث، المجلس الأعلى للثقافة، القاهرة ، ١٩٩٧، ل ٤٣٣.

٤٥١. مالفى عبدالقادر، مفهوم الديمقراطية عند هابرماس ، مجلة اوراق فلسفية، القاهرة، عدد٢٠٠٤،١٠، ل ٣٤٣.

٤٥٢. يورگن هابرماس، نظريه كنش ارتباطى- جهان زيست و نظام، سەرچاوەی پێشوو، ل ١١٩.

مەدەنیەکانی ناو جیهانی ژین.[453] ئەمەش بەهۆی بە هێزکردنی کۆمەڵگای مەدەنی دەبێت کە بەردەوام کار دەکات بۆ گەشەپێدانی پەیوەندیکاری و لێك تێگەیشتنی دوور لە زۆرەملێ لە نێوان تاکەکان دا. بەرای هابرماس پانتاییە بەهێزەکانی سیستەمی سیاسی کە بەشێوەیەکی رەسمی رێکخراون، بڕیارەکان دەردەکەن و وەك "سیاقی داوەری (پاساوهێنانەوە) *context of Justification* ئەرکەکانیان ئەنجام دەدەن، ئەوە لە کاتێك دایە کە "پانتاییە لاوازەکانی" جیهانی ژین وەك "سیاقی کەشف *context of discovery* " سەرچاوەی دروست کردنی کاریگەرین.[454] هەر بۆیە لای ئەو دیموکراسی بوونی نییە بەبێ بوونی رادەیەك لە رێککەوتن لە نێوان کۆمەڵگای مەدەنی و کۆمەڵگای سیاسی - دەوڵەت — کە یاسا و بنەماکان رێک دەخەن و پانتاییەکی هاوبەشیان هەیە ئەویش مرۆڤی ئازادە.[455] تاکە ئازادەکان هەوڵ دەدەن لە رێگای راوێژ و راگۆڕینەوە لە سەر ئەو بڕیارانەی کە پەیوەستن بە چارەنووسی هەمووانەوە جۆرێك لە ئاگایی دروست بکەن کە دەبێتە گوشار لە سەر دەسەڵات. ناوەرۆکی سیاسەتی راوێژگەری بریتیە لەوەی کە ئەولەویەت و بیروباوەری هاووڵاتیان کە دەخرێتە بەردەم گفتوگۆوە دەبێت لە لایەنی هەمووانەوە شیاوی پاساو بۆ هێنانەوە بێت. رێکخستن و دارشتنی سیاسەت و ئیرادە تەنیا لە کاتێ دا دیموکراتیە کە هاووڵاتیان تەنیا لە بیری کەڵەکەکردنی ئەولەویاتی خۆیان نەبن، بەڵکو بچنە ناو ئەو گفتوگۆیانەی کە رێگا لەبەردەم تاوتوێ کردنی بەڵگەخوازانەی ئەم ئەولەویەتانە دەکاتەوە. دیموکراسی راوێژگەری ناوەندی سەرنجی خۆی لە دەرەنجامە کۆتاییەکانەوە بەرەو تایبەتمەندی ئەو پرۆسسانە دەگوازێتەوە کە ئەم دەرەنجامانە بە هۆی ئەوانەوە دەشێت بە دەست بێن.[456] لەم حاڵەتە دا، پێویستی خستنەڕووی بەرژەوەندی گشتی تەنیا وەك فاکتەرێك بۆ چارەسەری کێشەکان حساب دەکرێت. بە مەبەستی گەیشتن بە

---

٤٥٣. مارتین لیت، یورطن هابرماس و دیموکراسی مشورتی ، ت: مهدی براتعلی پور، ص ٩ لە ١٩، لە گۆڤاری نامە مفید ، کە گۆڤارێکی پسپۆریی زانستە مرۆیی – ئیسلامییەکانە، ژمارە ٢٤، زستانی ١٣٧٩(٢٠٠٠) بلاّو کراوەتەوە، لەم سایتەی خوارەوە لە رێکەوتی ٢٠١٠/٩/٣ وەرگیراوە:

http://www.hawzah.net/per/magazine/nm/index.htm

454.Jürgen Habermas, Between Facts and Norms, Contributions to a Discourse Theory of Law and Democracy, translated by William Rehg, The MIT Press, Cambridge, Massachusetts, Second printing, 1996,p.307.

٤٥٥. ابوالنور حمدي ابوالنور حسن، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢١١.

٤٥٦. مارتین لیت، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢لە١٩.

ڕێککەوتن لە گفتوگۆیەکی پراگماتیکی بۆ ئەوەی خەریکی دۆزینەوەی گونجاوترین میکانیزم بن بۆ بە دەست هێنانی ئامانجە دەست نیشان کراوەکان. لێرە دا ڕوانین بۆ چەمکی گشتی بوون بە دوو ئاراستە خۆی دەردەخات کە دواجار هابرماس لێکیان گرێ دەدات. لایەنگرانی سوودگەرایی دەڵێن بنچینە ئەوەیە کە دەبێت زۆرترین سوود بە زۆرترین ژمارە بگات، لە بەرانبەر دا (کانت) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە دەبێ کردەوە بە جۆرێك بێت کە بتوانین بنەماکەی بکەینە یاسایەکی گشتی. لە ڕوانگەی هابرماسەوە «هەردوو قوتابخانەکە ئەوە قبوڵ دەکەن کە ئەخلاقی بوون پێویستی بە گشتی بوون هەیە و هەر شتێك کە لەرووی ئەخلاقیەوە چاکە دەبێ لە ژێر یەك هەلومەرج دا بۆ هەمووان چاك بێت».[٤٥٧] کەواتە گشتی بوونی هەر بۆچون یان بانگەشەیەك لە چرکەساتێکی مێژوویی دا و لەسەر بوارێکی دیاریکراو کە دەیەویەتی شەرعیەت وەربگرێ، پێویستە هەمووان بە یەکسان دەنگیان پێدابێت و ئەمەش پەیوەندی ڕاستەوخۆی هەیە بە دروستی بانگەشەوە. ناوەڕۆکی تیۆری هابرماس لە تێزی دروستی ڕەفتاری پێك هاتووە: بە پێی ئەم تیۆرە تەنیا ئەو دەستە لە بەها و نۆرمە یاساییانە دروستن کە هەموو بەشداران لە ڕەوتی گۆڕینەوەی بیر و بۆچوون لە سەری ڕێککەوتوون و دەنگیان بۆ داوە.[٤٥٨] ئەم بۆچوونەش کاریگەری (کانت)ی بەسەرەوەیە، کانت ڕای وابوو یاسا کاتێ دادپەروەرانەیە کە هەموو نەتەوە دەنگی بەڵێی بۆ بدات و وەك شتێکی دادپەروەرانە پەسندی بکات.[٤٥٩] بەم جۆرە « هابرماس پێیوایە دەتوانرێت ئەرگومێنتی ئەخلاقی دابمەزرێنرێت بەو پێیەی ڕێکاری گونجاوە بۆ دروست کردنی ئیرادەی عەقلانی».[٤٦٠] ئەگەر

---

٤٥٧. یورگن هابرماس ، نظریە کنش ارتباطی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣٤.

٤٥٨. دتلف هوستر، هابرماس و سیاست ، ت: پریش کوششی ، ص٨ لە ٩. لەم سایتەی خوارەوە لە ڕێکەوتی ٢٠١٠/١٠/٢١ وەرگیراوە:
http://www.aftab.ir/articles/view/religion/philosophy/c7c1250177134_jurgen_habermas_p1.php/

٤٥٩. دتلف هوستر، سەرچاوەی پێشوو، ص ٨ لە ٩.

٤٦٠. دانیلو مارتوشلي، یورغن هابرماس – العقلنة و الدیمقراطیة، ت: ابراهیم بومسهولي، ل ١٨لە ٢٥ پێشتر لە گۆڤاری فکر و نقد ژمارە ٤١ بلاّو کراوەتەوە ، لەم سایتە خوارەوە لە ڕێکەوتی ٢٠١٠/١٢/٥وەرگیراوە:
http://www.fikrwanakd.aljabriabed.net

پێویست بێت دەرەنجامی پرۆسسی بڕیاری راوێژگەری رەزامەندی هەموو بەشدار بووانی لەسەر بێت ئەوا مانای وایە ئەم هاوولاتیانە مافی گوزارشت کردنیان هەیە لە بیروبۆچوونی خۆیان و دەتوانن دژایەتی روانگەی نەیارەکانیان بکەن و کاریگەریان لەسەر بڕیاری کۆتایی هەبێت. چوونە ناو پرۆسسی راوێژگەری واتە هەولْدان بۆ بەدیهێنانی کۆدەنگی و رازی کردنی نەیارەکەت بە ئەرگۆمێنت نەك بە زۆرەملێ. پابەند بوونی تاك بە راوێژگەری واتە پشتیوانی کردنی ناراستەوخۆ و پێش وەختە لە پرەنسیپێکی ئەخلاقی دیاریکراو. داکۆکی هابرماس لە شەرعیەت بنەمای گرانتی کردنی دەرفەت و ئازادییە بنەڕەتیەکان دادەمەزرێنێ.[٤٦١] بەم شێوەیە شێوازی دەسەلاَت و چەشنی هێزی فەرمان ڕەوایی کردنیش هەر بە سیستەم و قالبی سیاسەت شێواز وەردەگرێت و دواتریش دەبێت رێچکەی درێژکراوەی فەراهەم کردنی خواستەکانی ئازادی و بەرقەرار بوونی دیموکراسیەت. بە یاسایی کردن و شەرعیەت *legitimacy* هۆکاری زەمینە خۆش کەرن بۆ سەقامگیر بوونی کۆمەلْگا، ئەم بە یاسایی کردنەش شێوازی هەمەچەشن وەردەگرێت بۆ بەرجەستە کردنی ئەو خواست و ئامانجانەی لێی چاوەڕوان دەکرێت .[٤٦٢]

**هابرماس جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە نابێت ئامانج و خواستەکانی کۆمەلْگا بکرێتە بڕگەی سیاسی و رێکلامی بەتالْ، بەلْکو دەبێت ئەو خواست و ئامانجانە بکرێنە راستیەك و لە نێو هەموو سیستەم و پلانەکاندا بە بڕگەی سەرەکی دابنرێت و دەبێت ململانێکانیش شەرعیەتی خۆیان هەبێت و نابێ ململان تەنها بۆ راکێشانی هەست و خرۆشی جەماوەر بێت .[٤٦٣]**

لێرەدا دەبێ ئاماژە بەوە بکرێت کەوا ناشێت بازاڕ ئاسا مامەلْە لەگەلْ بنەماکانی دیموکراسی بکرێت، بەلْکو دەبێت لەسەر چەند بنەما و پرەنسیپێکی چەسپاو دابمەزرێت. لای هابرماس «دیموکراسی، پانتاییەکی گشتی هەمیشە کراوەیە کە ژێرخانە پەیوەندیکارییەکەی بەرداوام خۆراك لە هێزە کۆمەلاَیەتیە جیاواز و تارادیەك خۆکارەکان(تلقائی) وەردەگرێت».[٤٦٤] هابرماس پێیوایە دیموکراسی بریتیە لە کۆمەلێکی بی سنوور لە رێکار کە ئامانج گەیشتن

---

٤٦١. کولن فارلي، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٧٣.

462 . Jürgen Habermas, Between Facts and Norms.op.cit., p.. 290

463 . Ibid., p294..

٤٦٤. دانیلو مارتوشلي ، سەرچاوەی پێشوو، ل١٩لە ٢٥.

نییــه بــەو شــتەی کــە راســتە بــەڵکو بــەرەنجامی گفتوگــۆی دیموکراتیــە کەلەســەر بنــەمای پەیوەندیکاری نێوان بەشدارەکان دامەزراوە پاشان کرانەوە بەرووی هــەموو راو بۆچــوونێك لــە گوتارێکی ئازاد و بەشداریەکی کراوە و داهێنەرانە بەرەوە کۆدەنگیەکی عەقلانی.[٤٦٥] کەواتــە رێکارە یاساییە دیموکراتیەکان لە چوارچێوەی بوونی پەیوەندیکاری لە نێوان خودە ئۆتۆنۆمەکان دا مانا وەردەگرێت کە هــەوڵ دەدەن لــە میــانی گفتوگــۆی ئــازاد دا رێگاچــارە بــۆ کێشــە و ململانێیەکان بدۆزنەوە و لە نێوە دا دانپیانانی دوولایەنە و رێــز گــرتن لــە مــافی وەکیــەکی هەموو خودەکان دەبێ وەك بنەما سەیر بکرێت.

**٢. دیموکراسی و شەرعیەتی یاسایی:**

لای هابرماس پرەنسیپی دیموکراسی تەنیا گوزارشت لــەو رێگایانــە دەکــات کــە دەشــێت بەدەزگایی کردن (مأسسة) عەقلانیانەی را و ئیرادەی لێبکەوێتەوە بە هــۆی سیســتەمێك لــە یاسا کە گرانتی بەشداری وەکیەك بۆ هەمووان دەکات بۆ ســەیرورەی دامــەزرانــدنی یاســا کــە ئەمەش زەمانەتی گریمانەی پەیوەندیکاری پــێش وەختــە دەکــات.[٤٦٦] چــونکە بــەهۆی هــزری دیموکراسی ئیتر «یاسا ئامرازێك نییە بۆ رێکخستنی پەیوەندی نێــوان تاکــەکان و دەســەڵات، بەڵکو یاسا بووەتە ئەو ئامرازەی کە بەهۆیەوە کۆمەڵگا گوزارشت لە خــودی خــۆی و ئــیرادە سەربەخۆکەی دەکات».[٤٦٧] هابرماس پێیوایە (رۆبرت داڵ) تێگەیشتنی بۆ خودی دیموکراســی لە تێڕوانینی جەوهەری رزگار کرد کە بۆ زەمەنی ئەرســتۆ دەگەڕێتــەوە. (داڵ) ئامــاژە بــەوە دەکات کە خێری گشتی- چاکە و بەرژەوەندی ئێمــە و ئــەوانیتر کــە بەشــدارن- بــە دەگمــەن ناوەرۆکەکەی بریتیە لە ئامانجە تایبەتیەکان، چالاکی و پەیوەندی، بەڵکو بریتیە لە پراکسس، رێککەوتن، دەزگا و پرۆسسەکان.[٤٦٨]داڵ لە رێگای رێکارەکان کە خۆی لە پێــنج پێوەرەکــە دا دەبینێتەوە وادەکات کە بڕیارەکــان پابەنــدی بەرژەوەنــدی هــەمووان بێــت کــە لــە پرۆســی

465.Ibid., P. 56.

٤٦٦. هەمان سەرچاوە، ل ١٧لە ٢٥.

٤٦٧. ستيفان هابر، هابرماس: سبل الديمقراطية الراديكالية ، ت: محمد سهمي، مجلة فكر و نقد، عدد ٢٩، ل ٦١.

468 . Jürgen Habermas, Faktizität und Geltung, Beitrage zur Diskurstheorie des Rechts und des demokratischen Rechtssats, Suhrkamp, Frankfort, 1994,p.383.

سوپاس بۆ بەرێز د. شێرزاد احمد النجار کە لە وەرگێڕانی دەقە ئەڵمانیەکان هاوکاری کردووم.

دیموكراسی دا بەشدارن. دامەزراندنی یاسا وەك گوزارشتێكی عەقلانی نێوانخـودی پشـت بـەو پێش گریمانانە دەبەستێت كە لە پرەنسیپی گفتوگۆوە سەرچاوە دەگرن، واتـە گفتوگـۆی ئـازاد لەیەك كات دا بەرەنجامی یاساكان و دامەزرێنـەری یاسـایە كـە پـاش كـۆدەنگی شـەرعیەت وەردەگرێت. « بە كردەوە سیاسەتی راوێژگەری لە نێو تۆرێك لە گفتوگۆ و دانوسان دایـە كـە ئامانجەكەی بریتیە لە پێشكەش كردنی چارەسەری عەقلانی بۆ پرسی پراگماتیكی و ئەخلاقی و ئیتیكی ».[٤٦٩] هابرماس ئەوە روون دەكاتەوە لـە نـەریتی لیـبرالی و كۆمـاری دا بـەمانای ئیرادەی جەوهەری لە بەشداری سیاسـی هاوولاتیـان تێگەیشـتوون، بـەلاّم ئەگـەر ئـەركێكی مەعریفیش بخەینە پالْ ئیرادەی دیموكراتی ئەوا بەدواداچوونی بایەخ و ئیهتماماتی تایبـەتی و بەدیهاتنی ئازادی سیاسی رەهەنـدێكی تـریش وەردەگرێـت، ئـەویش رەهەنـدی بـەكارهێنانی عەقلْە لە پانتایی گشتی دا، لێرە دا پرۆسسی دیموكراتی هێزی مەشروعیەتی خۆی لە بەشداری سیاسی و رادەربڕین وەرناگرێت، بەلْكو لە كرانەوە وەریدەگرێت، وەك پرۆسسـێكی بـەردەوام و مەبەستدار كە جۆرەكەی كەفیلە بۆ پتەوكردنی چاوەڕوان كردنی ئەو دەرەنجامانەی كە لـەڕووی عەقلْیەوە پەسندن.[٤٧٠] پرەنسیپی دیموكراسـی خـۆی لـە رێكـاری شـەرعی دا دەنوێنێـت كـە پەیوەستە بە دروست كردنی نۆرمی یاسایی كە دەشێت پاساوی بـۆ بهێنرێتـەوە بـە لـۆژیكی جیاجیا و بە تایبەتی بە پێی لۆژیكی١) راوێژگەری — كە لایەنـە ناكۆكـەكان تێیـدا بەشـدار بوونە و لەسەری رێككەوتوون — و٢) سیاسی — بەو پێیەی سیاسەت هونەری ممكنـە — و ٣) ئەخلاقی تەواو — كە خۆی لە بەهای یۆنیڤێرسال دا دەبینێتەوە- جگـە لـەو مەرجانـەی كـە پەیوەنـدییان بـە دانوسـانەوە هەیـە لـە پێنـاو یەكلاكردنەوەیـەكی دادپەروەرانـە لـە نێـوان بەرژەوەندییـە دژبـەرەكان دا.[٤٧١] هابرمـاس پێیوایـە پرسـی بـە شـەرعی كردنـی رەهەنـدە یاساییەكان وای كرد كە پێداگری پتر لەسەر سیاسەتی یاسایی و بە شەرعی كردنـی سیاسـەت بكرێتەوە، كە ئەوەش بە یەكێك لە فاكتەرە هەرە گرنگەكانی پرۆسسـە سیاسـیەكان هـەژمار دەكرێت.[٤٧٢] یەكێك لەو خالاّنەی لەبەلْگـەخوازی هابرمـاس دا بـوونی هەیـە. پەیوەنـدی بـە

---

٤٦٩ . هەمان سەرچاوە، ل ١٨له ٢٥.

٤٧٠. یورغن هابرماس ، الحداثة وخطابها السياسي ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٧٣.

٤٧١. حسن مصدق، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٩٢.

472 .Jürgen Habermas, Between Facts and Norms,op.Cit. p287..

تێگەیشتنی ئەوەوە هەیە سەبارەت بە یاسا مۆدێرنەکان و ئـەم راسـتیە ئاشـکرا دەکـات کـە سیستەمەکان پێویستیان بە پاساوی یاسایی هەیە ، ئەم پێویستیە یاساییە لە نێوان سیسـتەم و جیهانی ژین دا رێڕەو و کەناڵێك دروست دەکات کە هەر دووکیان دەتوانن لە رێگای ئەمەوە کاریگەری لەسەر یەکتر دابنێن.[٤٧٣] قۆنـاغی یەکـەمی تێڕوانینـی هابرمـاس بـۆ یاسـا ئـەم گریمانەیە لە خۆ دەگرێت کە یاسـای مـۆدێرن سـیمای دینامیکیـەتی سـەرەکی دیموکراسـیە. هابرماس ئەوە دەردەخات «کە لە روانگـەی تیـۆری یاسـاییەوە *legal theory* سیسـتەمی یاسایی مۆدێرن دەتوانێ شەرعیەتی خۆی تەنیا لە ئایدیای ئۆتۆنۆمی و خود-بڕیاردەری *self-determination* وەربگرێ: هاوولاتیان دەبێ بتـوانن خۆیـان وەك نووسـەری یاسـا لەقەڵـەم بدەن، جگە لەمە ئەوان وەك بابەتی یاسا دەکەونەوە ژێر دەسەلاتی یاساوە».[٤٧٤]

بەم جۆرە لای هابرماس دەوڵەتی یاسایی دروست ناکرێـت بـەبێ دیموکراسـی رادیکـاڵی و ئەمەش پشت بـە سیسـتەمێکی یاسـایی-عـەقلانی دەبەسـتێ کـە هێـزە کۆمەلایەتیـەکان بەشێوەیەکی عەقلانی یەکتر دەرك دەکـەن.[٤٧٥] کەواتـە ئەگـەر یاسـای مـۆدێرن بـەرەنجامی بەکارهێنانی عەقڵ بێت لە پانتایی گشتی و لە پرۆسسی گفتوگۆ و بە هۆی رێکـاری یاسـایی مەشروعەوە بێتە ئاراوە ئەوا دواجار سیستەمێك لە مافی لێدەکەوێتەوە، کـە هابرمـاس بـەم جۆرە پۆلێنیان دەکات:[٤٧٦]

١- مافی بەرفراوان کردنی زیاتری ئازادی خودەکان (الذوات) لە کردەوە دا، بەو مەرجـە کـە بۆ هەمووان یەکسان بێت.

٢- مافی سوود وەرگرتن لە ئەندامێتی ئیرادیيانە لە ناو جڤاکێك دا کە لەسەر بنەمای یاسـا دامەزراوە، هەروەها مافی دامەزراندنی کۆمەڵەکان ( الجمعيات).

٣- مافی پاراستنی یاسایی*legal protection* تاك.

ئەم سێ مافە بەشێوەیەکی ئازاد و ئیرادیانـە، پەیوەنـدی هاوولاتیـە بەشـدارەکان دیـاری دەکەن.

---

٤٧٣. یورگن هابرماس، نظریە کنش ارتباطی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٥٧.

٤٧٤. مارتین لیت ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٩لە ١٩.

٤٧٥. شوان عمر خليل ، العقلانية و الدولة القانونية- دراسة في فكر الفيلسوف الألماني المعاصر يورغن هابرماس، اطروحة الدكتوراة غير منشورة، جامعة صلاح الدين، كلية قانون والسياسة، ٢٠٠٩، ١٣٩-١٤٠.

476. Ibid., p.122-123.

٤- مافی بەشداری ئازاد و دەرفەتی یەکسان بۆ دروست بوونی را کە هاوولاتیان لە چوارچێوەی ئەمە دا ئۆتۆنۆمی سیاسی خۆیان دەپارێزن.

٥- هەروەها، سوودوەرگرتن لە هەموو ئەو زەمانەتانەی کە مافی هاوولاتی بوون دەیبەخشێت لە سەر گشت ئاستەکان (کۆمەلایەتی، کلتوری، ژینگەیی) بێ هیچ چەشنە هەلاواردنێك لە نێوان هاوولاتیاندا.

ئەوەی لە سیستەمی مافە بنەڕەتیەکان دا گرنگە ئایدیای بەرفراوان کردنی ئازادی و بەشداری سیاسی و دروست بوونی رایە لە ناو کۆمەلگایەکی یاسایی بە دەزگایی کراو دا کە بەرەو دەولەتی مافی دەبات و رێگە لە هەموو جۆرە جیاکاریەك دەگرێت، ئەمەش لە جیهانی ژین دا دانپیانانی دوولایەنە و رێز گرتن لە مافی خودە سەربەخۆکان دێنێتە پێشەوە، چونکە «دیموکراسی بێ هاوولاتی بوون نابێت و هاوولاتی بوونیش بێ رێککەوتن نەك هەر لەسەر رێکار و دەزگاکان بەلکو لەسەر ناوەرۆکەکەشی بوونی نییە».[477] کەواتە داننانی دوولایەنە و لێبوردەیی و رێککەوتن پرەنسیپی سەرەکی پەیوەندیکاری دیموکراتیە و دوو توخم لە خۆدەگرێت:[478]

١. سیستەمێکی سیاسی کە لەسەر بنەمای مەشروعیەتی دەزگایی دامەزراوە کە لە چوارچێوەی دەولەتی ماف و یاسا دا سەرهەلدەدات.

٢.کۆمەلگای مەدەنی کە لە کلتوری نوێی دیموکراسی دا خۆی دەنوێنێ و لە هەموو رەهەندە فکری و یاساییەکان دا دەردەکەوێت، میکانیزمەکانی کۆمەلگای مەدەنی لە چوارچێوەی دەولەتی گرێبەست ، واتە دەولەتی ماف و یاسا دا مافە جۆراوجۆرەکانی تاك و گروپ دەپارێزی. لێرە دا مافەکان، مافی پۆزەتیڤن کە بە پێی ئەم مافە خۆمان بە ناچار دەبینین بۆ ملکەچ بوون بۆی و سیفەتی شەرعیەت وەرناگرێ تەنیا ئەو کاتە نەبێت کە هەموومان، هەموومان بەیەکەوە، واتە دانەران و بکەران، بتوانین هەمواری بکەین.[479] بەم جۆرە لە روانگەی (پۆل ریکۆر) دەولەتی ماف، دەولەتی گفتوگۆی ئازاد و رێکخراوە و ئەم مۆدێلەی پەیوەست بە گفتوگۆی ئازاد، پاساوی فرەحزبی دەهێنێتەوە و گونجاوترین ئامرازی رێکخستنی ململانێکانە. بۆ ئەوەی ئەم گفتوگۆ ئازادە چالاك بێت، نابێت هیچ کەسێك لەوە

---

٤٧٧. ألان تورين، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٣١.

٤٧٨. عزالدين الخطابي، اسئلة الحداثة و رهاناتها، سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٦.

٤٧٩. رينر روشليتز، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٥.

تێنەگات کە گوتاری سیاسی کردەوە نییە، بەڵکو لە باشترین حاڵەت دا بۆچوونێکی دروستە.[480] دەوڵەتی ماف و یاسا خاوەن هەندێ خەسڵەتە کە دەشێ ئازادی و ماف لە چوارچێوەی سیستەمێکی یاسایی دیموکراتی دا دابین بکات کە سیماکانی بریتین لە:[481]

١- یاسا کە زامنکەری ئازادییەکان بێت.

٢- ماف کە زامنکەری رێزگرتن بێت لە تاکی مرۆیی واتە هاووڵاتیان.

٣- جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان کە بریتیە لە هەڵاواردنی هێزی یاسادانان و جێبەجێ کردن و دادوەری.

ئەم پێداویستیانەن کە بواری رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ دەوڵەتە تۆتالیتار و پۆلیسیەکان دەڕەخسێنێ کە تێیدا دەسەڵاتی جێبەجێ کردن و کارگێڕی زاڵە بە سەر سیستەمی نوێنەرایەتی و بەتایبەتی دادوەری دا کە گەورەترین روکنی دەوڵەتی مۆدێرنە و ئەمانە کرۆکی دیموکراسین، ودەیانکاتە پاشکۆیەك بۆ پاساوهێنانەوە بۆ شەرعەتی رژێمە سیاسیەکەی خۆی. پێداچوونەوەی هابرماس  بە چەمکەکانی یاسا و دەسەڵات بەو مانایەیە کە سیستەمی سیاسی رەسمی بەشێوەی دیموکراتی شەرعی نییە، تەنیا ئەو کاتە نەبێت کە بە شێوەیەکی بەرچاو کردارە نێوخۆییەکانی بەڕووی پرۆسسە بەرفراوانەکانی دروست بوونی را و ئیرادە دا دەکرێتەوە.[482] دروست کردنی پەیوەندی لە نێوان چەمکی یاسا و دەسەڵات کە چاکسازییان تێدا کراوە، ئەم دەرفەتە بە هابرماس دەبەخشێت کە چەند پێشنیارێکی سیاسی بخاتەڕوو. بۆ نموونە ئاماژە بەوە دەکات بۆ دیموکراتیزە کردنی دەزگا ئیدارییەکان بە هۆی فلتەری شەرعیەتەوە دەبێ گرنگی بە یاسای رێکاریی procedural بدەین.[483] ئەم دەرفەتانە بەو هۆیەوە دێنە ئاراوە کە دەزگای یاسای رێکاری، یاسادانانی شەرعی دروست دەکات. ئەم رێکارانە بە شێوەیەکی سەرەکی بە بێ گرنگیدان بە هەلومەرج یان لێهاتوویی بکەرەکان، نیشانەی کاریگەری دیموکراتیزەکردنە. هابرماس ئەم پرۆسسە بە نێوانخودی ئاستی بالاَ

---

٤٨٠. عزالدين الخطابي، الأخلاق والحرية بين ضرورة الواجب وعقلانية التواصل الديموقراطي (من كانط إلى هابرماس)، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦ لە ٧.

٤٨١. هەمان سەرچاوە، ل ٤و٥ لە ٧.

٤٨٢. مارتين ليت ، سەرچاوەی پێشوو، ل ١١لە ١٩.

483. Ibid .140-141.

ناودەبات کە داتا زەینییەکان دەخاتەڕوو.[484] دواجار ئاماژە بەوە دەکات کە دەرەنجامی وتوویژ لەسەر کێشەکان و ئەو سیاسەتانەی هاتونەتە ئاراوە بۆ چارەسەرکردنیان، کاتێ بە یاسایی دادەنرێت کە ئەم رەوتە لە هەناوی چوارچێوەیەکی دەزگایی لە پێش دا وەسف کراو بەدواداچوونی بۆ بکرێت. هێما بۆ ئەوە دەکات گرنگی خۆی هەیە ئەگەر سیاسەتەکان بخرێنە ژێر پێداچوونەوەی دادپەروەرانە بۆ ئەوەی لە گونجانیان دڵنیا بین لەگەڵ سیستەمی یاسایی دا.[485] هەر بۆیە بە رای هابرماس «کۆمەڵگا لە دووتوێی چەمکی دیموکراسی رێکاریی دا دەبێتە جڤاکێکی یاسایی خۆ- رێکخەر»[486] و رێکارە یاساییەکان تەنیا لە شوێنی بە یاسایی لەقەڵەم دەدرێن کە دەربڕی بەرژەوەندییەکی گشتی بن، گشتی بوون و بەرژەوەندییەکانیش دەتوانن بەم جۆرە تاقی بکەینەوە کە بۆمان دەربکەوێت کە ئایا ئەو گرێبەستانەی کە لێیەوە سەرچاوە دەگرن بەراستی نیشاندەری هاوسەنگی بەرژەوەندییەکانە یان بە پێچەوانەوە بەرژەوەندی مەشروعی لایەنێك پێشێل دەکات بە بێ وەبەرچاو گرتنی رەزامەندی ئازادانە و فۆرماڵی لایەنەکە.[487] کەواتە لای هابرماس گرێبەست بە مەرجێ ئەخلاقیە و بە مەرجێ دەبێ دانی پیابنرێت و گرانتی جێبەجێکارانەی کۆمەڵگای بۆ دابین بکرێت کە تەنیا ئامرازێك نەبێت بۆ لایەنێکی گرێبەستەکە، کەواتە هەر ئەوەندە بەس نییە کە گرێبەست لەسەر بنەمای رەزامەندی دامەزرا بێت، بەڵکو پێویستە گرێبەست دادپەروەرانەش بێت.[488] لێرەوە ئەگەر تاك یان گروپ لە ژێر رەوشێکی نەخوازراو دا بچنە ناو گرێبەستێکەوە کە گوزارشت نەبێت لە ئیرادەی ئازادانەی خۆیان ئەوا نە ئەخلاقیە و نە دادپەروەرانەیە. بەلاّم « لێرە دا رێکاری دادپەروەرانە یان منسفانە دیاری ناکرێت، بەڵکو دیاری کردنی مەرجەکانە قبوڵ کردن کە رەنگە بتوانێ بە شێوەیەکی شەرعی بانگەشەی نۆرماتیڤی دادپەروەری کەشف بکات».[489] ئەمەش مانای وایە کە خودی دادپەروەری چەمکێکی پێش وەختە نییە بەڵکو رێکارەکانی گەیشتن بە دادپەروەری دەبێ شەرعیەتی خۆی لە ئیرادەی هەمووان وەرگرتبێت. یاسا بە

484.Ibid. p.340-341.
485. Ibid. p 167.

٤٨٦. دانیلو مارتوشلي، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢١ لە ٢٥.

٤٨٧. یورگن هابرماس ، سەرچاوە پێشوو، ل ١١٨.

٤٨٨. هەمان سەرچاوە، هەمان لاپەڕە.

٤٨٩. مارك فيري ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٢٤.

شەرعی دانانرێت تەنیا ئەوکاتە نەبێت کە پەیوەست بێت بـە پرەنسـیپی دیموکراسـی کـە لـە گفتوگـۆی کـراوە دا دەردەکـەوێت و دروسـت بـوونی ئـیرادەی نێوانخـودی و سـەربەخۆ لەخۆدەگرێت.[٤٩٠] هەر بۆیە هابرماس ئاماژە بەوە دەکات کـە بـەو رادەیـەی کـە بانگەشـەی دروستی نۆرمـاتیڤ زیـاتر پشـت بـە سـۆلیدارێتی ببەسـتێ کـە لەسـەر بنـەمای پرۆسسـی پەیوەندیکاری دامەزراوە، بەهەمان رادە پرەنسیپە دیموکراتیـەکانی دروسـت کردنـی ئـیرادە و پرەنسیپی گشتی یاسا لە دەولـەتی مـۆدێرن دا زیـاتر سـەقامگیر دەبێـت.[٤٩١] لـە روانگـەی رێکارییەوە، دادپەروەری سیاسی بەشێوەیەکی کردەیـی و بنـەڕەتی پەیوەسـتە بـەو دەرفەتـە بەخشراوانەی کـە بـە هـەمووان دەدرێـت بـەو سـیفەتەی هـاوولاتین و پاشـان گـوێگرتن لـە تێڕوانینـەکانیان بـە شـیوەیەکی ئاشـکرا و بـەرگری کـردن لێـی بەمەبەسـتی گەیشـتن بـە دەرەنجامێکی کردەیی، کۆمەڵگای دادپەروەر ئەو کۆمەڵگایەیە کە باشترین مەرجی بەشـداری دابین بکات کە لە ئاستی گفتوگۆی کردەیی دا بێت.[٤٩٢] لێرە دا چەمکی زۆرینە دەبیتە کێشە چونکە خواست و بۆچوونی زۆرینە دەبێتە جۆرە یاسایەك کەوا دەسـەلاتی سیاسـی بەشـەرعی دەکات بەلاّم لێرەدا ئەوەی جێگای پرسـیارە خـۆ کەمینـەش لـە کۆمـەڵگادا هەیـە، دەبێـت ئەوانیش بە بۆچوونی زۆرینە رازی بن، هەر ئەمەشە زۆر جار پرسیار دروست دەکات دەرهـەق بە سەرتاسەری پرۆسەی دیمۆکراتی، چونکە «کاتێ بابەتەکـە گرنگیـەکی مێـژوویی هـەبێت و پەیوەست بێت بە ناکۆکی قوڵیی بەهایی و بڕیاری پەیوەست بە جەمسـەرگیری را و بۆچـوون، ئەوا ئەو حزب و حکومەتانـەی پشـت بـە پرەنسـیپی زۆرینـە دەبەسـتن دەکەونـە ژێـر بـاری کێشەکانەوە».[٤٩٣] هابرماس جەخت دەکاتەوە کە دیمۆکراسی دەبێت روونی بکاتـەوە، ئالیـەتی پاراستنی کەمینە لە زەبر و زەنگی زۆرینە چییە (ئەوە لە کاتێکدا ئالیەت و زەبر و زەنگـیش پێناسەی تایبەتی خۆی دەوێت)، چونکە زۆر جار کـەوا کێشـە لـە نێـوان ئـەم دوو چـینە نـا یەکسانە (زۆرینە و کەمینە) سەر هەڵدەدات، ئاماژە بەوە دەکرێت کە با کێشـەکە بـە یاسـا چارە بکرێت، بەلاّم دەبێت ئاگاداری ئەوە بین خۆ یاساکەش هەر بە دەنگی زۆرینە چوار چێوەی

---

٤٩٠. ستیفان هابر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٢.

٤٩١. یورگن هابرماس ، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣٩-١٤٠.

٤٩٢. مارك فیري، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٤.

٤٩٣. د. شیرزاد النجار، سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٠.

بۆ کێشراوە و لە ژێر کۆنترۆڵی دەسەڵاتی زۆرینەدایە.[٤٩٤]بەڵام «دەرەنجامەکانی دەنگدان ئـەوە روون دەکاتەوە کە زۆرینە لەزۆربـەی کاتـەکان دا زۆرینەیـەکی نـاجێگیرە و هەربۆیـە دەکـرێ بە'زۆرینەی جولاو' ناوزەدی بکەین».[٤٩٥] ئەمەش وا دەکات کە دیموکراسی تەنیا بریتی نەبێت لە هەڵبژاردنی گشتی بـەڵکو پرۆسـسی دروسـت کردنـی شـەرعیەتی بـەردەوامبێت بـەهۆی بەشداری چالاك و رۆشنگەرانەوە. پرەنسیپی کۆنترۆڵ کردنی ئەجێندا لەگەڵ چەمکی راوێژ لـە دیموکراسی دا تەبایە کە تێیدا شەرعیەتی یاسا لە سەر بنـەمای قبـوڵی هـەموو هاووڵاتیـان دادەمەزرێ و لە دیموکراسی راوێژگەری دا هەوڵ دەدرێـت لـە رێگـای رێکـارە یاسـاییەکانەوە مافی کەمینە بپارێزرێت. هابرماس دەڵێت «دەتوانین بڕوا بە شەرعیەتی ئەو یاسـا دانراوانـە بکەین کە رەزامەندی هەموو هاووڵاتیانی لەسەرە لە میانی پرۆسسی یاسادانان- راوێژگـەری دورودرێژ کە پشت بە بنەمای یاسایی دەبەستێ».[٤٩٦] بەپێی پرەنسیپی دیمـوکراتی هابرمـاس تاکـە تاقیکردنـەوە بـۆ رادەی شـەرعیەتی یاسـاکان تاقیکردنـەوەی رێکارییـە. شـەرعیەتی یاسادانان تەنیا دەوەستێتە سەر ئەوەی ئایا دارِشتنی یاساکان بە رێگەیەکی راست بووە، نـەك لەسەر ئەوەی ئایا پێوەرە نۆرماتیڤـە جەوهەرییـە پـێش وەختـە دیاریکراوەکـان بـەد دێنێـت سەبارەت بە چاکە و خراپە یان نا.[٤٩٧] ناوەرۆکی بەرهەم هێنانی دیموکراسی لە ئاستێکی راست دا دەتوانێ چالاکی هەبێت و لە دیموکراسـی رێکـاری دا نـاوەرۆکی ئایـدیالی دیموکراسـی لـە عەقڵی ئەزموونی و لە شێوەی پراگماتیکی دا بە دیار دەکەوێت و ئـەم رێکارانـە لـە شـکلی دەزگا لە خاڵی پیادەکردنی سیستەمی یاسایی دا دەپێورێن.[٤٩٨] یـەکێك لـەو رەخنانـەی کـە رەنگە دژی تێڕوانینـی رێکـاریی هابرمـاس بـۆ دادپـەروەری بخرێتـەڕوو، ئەوەیـە کـە کـاتێ بابەتەکانی دادپەروەری دەخرێنە ژێر پرۆسسی دیموکراسی، مەترسی ئەوە لەسەر رێکارییـەکان هەیە کە لەوانەیە دەرەنجامی ستەمکارانە بە شەرعی بکەن. بەڵام تەنیا دەسـت هـەڵبڕین لای کەسانی وەك هابرماس بەس نییە بۆ شەرعییەت دان بە یاساکان. بۆ ئەوەی یاسایەك شـەرعی بێت، پێویستە هەموان بتوانن رەزامەندی لەسـەر دەربـڕن و ئاشکراشـە کـە کەمینەیـەکی

---

494 . Ibid., p.293.

٤٩٥. د. شيرزاد النجار، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٦.

496 . Ibid., p..110.

٤٩٧. کولن فارلي، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٧١.

498. Jürgen Habermas, Faktizität und Geltung,a.a.O, p. 367.

دیاریکراو له سەر ڕێکاری ئەوتۆ ڕازی نابێت. بەم جۆرە مەرجە ئایدیالییەکانی "ئەخلاقیاتی گوتار"ی هابرماس ڕێکاری ویقایی بۆ ماف و دەرفەتە دیاریکراوەکان دادەنێت کە پێشی جۆرەها سیاسەتی سەرکوتکەرانە دەگرێت.[499]

شەرعیەتی هەموو جموجۆڵەکانیش دەبێت بە موکومی لەبەر چاو بگیرێت و هەموو بڕگەکان پشت ئەستوور بن بەوەی کەوا بە گوێرەی یاسا جێبەجێ کراوە و هێزی شەرعیەتی لەگەڵە.[500] هابرماس پێیوایە «لە سیاقی پۆست میتافیزیك دا تاکە چارەسەری شەرعیەت بریتیە لە ڕێکاری دیموکراتی کە گشتاندن بۆ یاساکان دەکات».[501] بەم شێوەیە دەسەلاتێك کەوا سەرچاوەکەی ئیرادەی هاوولاتیان بێت و هەموو قۆناغەکانی بە گوێرەی ڕێکارە یاساییەکان بڕیبێت و تاکەکانی کۆمەڵگا هەست بکەن بە ڕاستی دەزگا یاسایی و سیاسیەکان ڕەنگدانەوەی ڕا و بۆچوونی ئەوانە و هەموو بنەما یاسایی و شەرعیەکانیش بە گوێرەی سیستەم ڕۆڵی خۆیان دەگێڕن ئەوا ڕادەی یەکانگیری و سۆلیدارێتی کۆمەلایەتی و سەقامگیری سیاسی بەرز دەبێتەوە.

بەم جۆرە تیۆری ئەخلاقیاتی گفتوگۆ بەشێکی سەرەکی دیموکراسی ڕاوێژگەرییە و هەوڵ دەدات هەندێ پرەنسیپی یونیڤێرساڵ لە میانی گفتوگۆیەکی کراوە سەبارەت بە سیاسەت و بەها کۆمەلایەتیەکان بێنێتە ئاراوە و هابرماس ئەمە بە ئەخلاقی نێوانخودی ناوزەد دەکات. ئەخلاقی گوتاری کە لە ڕەوشی ئایدیالی قسەدا دێتە ئارا و بەشداران ڕەهەندی ستراتیژی کردەوە بەلاوە دەنێن، ئەخلاقێکی ڕێکارییە و لە چوارچێوەی عەقلانیەت و کردەی پەیوەندیکاری دا دێتە بەرهەم و ئەمەش لە توانستی زمان و پراگماتیکی گشتی دا خۆی دەنوێنێ کە تێیدا ئەوخودانەی توانای قسە و کردەوەیان هەیە دەبنە خاوەن مافی ڕادەربڕین، بەمەرجێك دروستی ڕێکارە دیموکراتیەکانی وتووێژ قبوڵ بکەن .

## باسی سێیەم

---

٤٩٩. هەمان سەرچاوە ، ل ٢٧٢.

500. Jürgen Habermas, Between Facts and Norms,op.Cit. p.299.

٥٠١. دانیلو مارتوشلي، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٨لە ٢٥.

## هابرماس و سێ مۆدێلی نۆرماتیڤی دیموکراسی
## (لیبراڵی، کۆماری ، راوێژگەری)

هەروەك لە باسی پێشوو دا ئاماژەمان بۆ کرد هابرماس لە توێژینەوەکانی خۆی دا بەتایبەتی لە وتاری **سێ مۆدێلی نۆرماتیڤی دیموکراسی**[*]دا مۆدێلێك دەخاتەڕوو کە بە سیاسەتی راوێژگەری یان دیموکراسی رێکاریی و هەندێ کاتیش بە دیموکراسی گفتوگۆیی ناودێری دەکات، کە ئەلتەرناتیڤی مۆدێلی لیبرالی و کۆمارییە، کە دەتوانین (بۆ نموونە لای هانا ئارێنت و جۆن راوڵز بیدۆزینەوە)، بەلاّم توخمە سەرەکییەکانی خۆی لە هەردوو نموونەکە وەردەگرێت، واتە ئەم مۆدێلە بە دیوێك دا سەرلەنوێ بونیاتنانەوەی لایەنە پۆزەتیڤەکانی ئەم دوو مۆدێلەیە، بەدیوەکەی تریدا ئاوێتەکردنیەتی بە تیۆرەکەی خۆی کە بنچینە سەرەکیەکانی پەیوەندی راستەوخۆی بە تیۆری کردەی پەیوەندیکاری و دامەزراندنی فەلسەفەی نێوانخودییەوە هەیە وەك ئەلتەرناتیڤێك بۆ فەلسەفەی خودیی یان ئاگایی، لێرەدا هابرماس تیۆرێك بۆ دیموکراسی دەخاتەڕوو کە لەیەك کاتدا نیشانەی بەرەو کاملتر بردنی دیموکراسی و هێمای بیردۆزێکە کە ئەگەرەکانی پیادەکرنی خۆی لە چوارچێوەی رێکاری یاسایی دا دەدۆزێتەوە. ئەم رێکارانە گرانتی پاراستنی پەیوەندیکاری Communication خاڵی لە زۆرەملێ و دەسەلاّتە

---

* یورغن هابرماس، ثلاثة نماذج معيارية للديمقراطية ، ترجمة و تقديم: محمد الأشهب، مراجعة: د.عزالدين الخطابي، ثقافات ، مجلة علمية محكمة تعني بدراسات الثقافية تصدرها كلية الآداب بجامعة البحرين، العدد ٢٢، سنة ٢٠٠٩.

هەروەها لەم سەرچاوە ئینگلیزیە دەست دەکەوێت:

- Richard Kearney and Mark Dooley, QUESTIONING ETHICS, Contemporary debates in philosophy, Routledge , London and Ne York, 1999, pp.135-144.

Jürgen Habermas,Three normative model of democracy, -Constellations Volume - I, No I, 1994.. Published by Blackwell Publishers, I&9 Cowley Road, Oxford OX4 .IJF, UK and Cambridge, MA 02142, USA.pp.1-10

هەروەها بە ئەڵمانی:

- Jürgen Habermas, ‘‘Drei normative modelle der Demokrate ” in
Jürgen Habermas, Dei Einbeziehang des Anderen: Studien Zur politischen Theorie, Suhrhump,f/m, 1996,pp.277-292.

لە جڤاکێك Community دا کە هەموو تاکەکان بە ڕێزگـرتن لـە بنـەماکانی ئـەخلاقیاتی گفتوگۆ بتوانن بانگەشەی دروستی Validity Claim بەها و بیر و بۆچوونەکانیان بکەن.

## تەوەری یەکەم: تێڕوانینی لیبرالی و کۆماری بۆ دیموکراسی

هابرماس ئاماژە بەوە دەکات کە لە ژێر تیشکی کارەکـانی بیرمەنـدی ئـەمریکی فرانـك میشلمان** توێژینەوەکەی خۆی لەمەڕ دیموکراسی لیبرال و کۆماری دەست پێدەکات و پێیوایە هەردوو مۆدێلەکە بە جۆرێك لە جۆرەکان دژەتیان هەیە لە تێڕوانینیان بۆ:

١- هاوولاّتی ،٢- ماف ، ٣- سروشتی دروست بوونی ئیرادەی سیاسی.

پاشـان هەوڵـدەدات لـە ژێـر تیشـکی ڕەخنـەگرتن و هەڵسـەنگاندنی ئـەم دوو مۆدێلـە نموونەیەکی بەدیل بخاتەڕوو کـە خـاوەن سروشـتێکی ڕێکارییـە و بە"سیاسـەتی ڕاوێژگـەری" ناوەزەدی دەکات. هابرماس ئاماژە بەوە دەکات کە ڕوانگەی دیموکراسی لیبرال و کۆماری بـۆ پرۆسسی دیموکراتی، جیاوازی سەرەکی نێوانیان پێك دێنیٚ.

---

** فرانك میشلمان Frank I. Michelman (1936- ) یەکێکە لە ڕابەرانی یاسا لە ئەمریکا، مامۆستای زانکۆی ڕۆبرت والمسیە لە قوتابخانەی یاسای هارڤارد. میشلمان توێژینەوەیەکی کاریگەری سەبارەت بە پێداچوونەوە بە یاسا نووسیوە بەناوی **موڵکیەت، قازانج و ئینساف،** کە کاریگەری ڕاستەوخۆی لەسەر هەموارکردنی دەستووری ئەمریکی هەبووە. لە نێوان ساڵەکانی ١٩٩٤- ١٩٩٦وەك جێگری سەرۆکی کۆمەڵەی ئەمریکی بۆ کاروباری سیاسی و یاسایی و فەلسەفی خزمەتی کردووە، لە ساڵی ١٩٩٨-٢٠٠١ بووە بە سەرۆکی ئەم کۆمەڵەیە. ساڵی ٢٠٠٥ خەلاّتی کۆمەڵەی فەلسەفەی ئەمریکی بەدەست هێناوە. هەوەها خەلاّتی هێنری فلیپسی پیٚ بەخشراوە وەك ڕێزلینانێك لە بەشداریە گەورەکانی لە بواری فیقهدا، کە لە ماوەی سەدەیەك دا تەنیا بیست جار بەخشراوە. بەشێك لە توێژینەوەکانی بریتین لە : مافی نەژمێرداو Unenumeratedلەسایەی دەستوورگەرایی جەماوەری دا، گۆڤاری زانکۆی پەنسیلڤانیا بۆ یاسای دەستووری، ٢٠٠٦،١٢١، دەستوور، مافی کۆمەلاّیەتی و پاساوی سیاسەتی لیبرالی، گۆڤاری نێودەوڵەتی یاسای دەستووری،١٣، ٢٠٠٣. کێشەی ناکۆکی ڕاڤەی دەستووری، ئایا گوتارەکانی پیادەکردن یارمەتیمان دەکەن؟ سەبارەت بە هابرماس و پراگماتیزم، م.ئەبولفیا،م. بوکمان، س. کیمپس، ٢٠٠٢، مۆدێرنە، شوناس و نیشتمانیەتی دەستووری، زانکۆی دێنڤێر،١٩٩٩،١٠٠٩.

سەرچاوە: http://en.wikipedia.org/wiki/Frank_Michelman

## ١- سیاسەت لە ڕوانگەی لیبرالیەوە:

لە ڕوانگەی لیبرالییەوە ئەرکی پرۆسسی دیموکراتی بریتییە لە « پرۆگرامسازی دەوڵەت لە پێناو بەرژەوەندی کۆمەڵگا، دەوڵەت لەم مۆدێلە دا وەك ئامێری بەڕێوەبردنی گشتی و کۆمەڵگا وەك سیستەمێك بۆ پەیوەندی نێوان تاکە ئاساییەکان و کاری کۆمەلایەتی کە لە سەر بونیادی *Structure* ئابووری بازاڕ دامەزراوە، دەخرێتەڕوو».[٥٠٢] بونیادی بازارێك کە لە خۆیدا خاوەن پرەنسیپی نەگۆڕ و تۆکمەی وەك ڕێزگرتن لە گرێبەست و ئازادی جوڵەیە، هەروەك (مکفرسۆن) دەڵێت «قۆناغەکانی گۆڕانی خۆی بە سەرکەوتووی تێپەڕاندووە»[٥٠٣]

بە پێی ئەم تیۆرە، سیاسەت واتە دروست کردنی ئیرادەی سیاسی بۆ هاولاتییان و ئەمە لە چوارچێوەی سیستەمێکی سیاسی سەقامگیردا جێبەجێ دەکرێت کە هەموو تاکەکانی کۆکن لەسەر مەشروعیەتی بڕیار و یاساکانی و لێرە دا دەوڵەت هەڵدەستێ بە ئەرکی کۆکردنەوە و بەرجەستەکردنی بەرژەوەندی تایبەتی بۆ هەمووان لە بەرانبەر جیهازی دەوڵەت کە ئەرکە تایبەتییەکەی بریتیە لە تەوزیف کردنی دەسەلاتی سیاسی لە پێناو بە دیهێنانی پرۆژەی هاوبەش .[٥٠٤] کەواتە لە تێڕوانینی لیبرالی دا ئەرکی دیموکراسی داڕشتنی پرۆگرام و پلانە بۆ دەوڵەت و کۆمەڵگا و ڕێکخستنی کۆی بەرژەوەندییە کۆمەلایەتیەکانە و ئەمە پشت بە دادپەروەری بازاڕ دەبەستێ وەك توخمی ڕێکخەری پەیوەندییەکان. بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین ئاماژە بەوە بکەین کە تیۆری دیموکراسی لیبرال تێڕوانینی تایبەتی هەیە بۆ چەمکی هاوولاتی و مافە تاکەکسیەکان و شێوازی دروست بوونی را و ئیرادەی سیاسی و پرۆسسی دیموکراتی، دەوڵەت دەزگایەکی ڕێکخەری بەرژەوەندییە جیاوازەکانی تاکەکانی کۆمەڵگایە و لۆژیکی ئەم ڕێکخستنە تەبایە لەگەڵ دادپەروەری ئابووی بازاڕ.

### أ. تێڕوانی دیموکراسی لیبرالی بۆ هاوولاتی:

---

٥٠٢. یورغن هابرماس، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢١٩.

٥٠٣. سی. بی. مك فرسون، سه چهره دموکراسی، ت: مجید مددی، نشر دیگر، تهران، ١٣٨٢(٢٠٠٣)، ل ٩٠.

٥٠٤. هەمان سەرچاوە، هەمان لاپەڕە.

به پێی تێڕوانینی لیبرالی ڕەوشی هاوولاّتییان بە پێی مافی خودی (الحقوق ذاتیة) دیاری دەکرێت کە دەتوانن سودی لێ وەربگرن لە پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەت و هاوولاّتییەکانی تردا. ئەم مافانە بنچینەکەیان بۆ مافە سروشتیەکان دەگەڕێتەوە.

**هاوولاّتییان لەم مۆدێلە دا بەو سیفەتەی خاوەن مافن، هەوڵ دەدەن بۆ دابین کردنی بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان لەو سنوورەی یاسا دایڕشتووە، سوود لە پاراستنی دەوڵەت وەربگرن، بە پارێزراوبوون لە دەسوەردانی خودی دەوڵەتیشەوە کە پابەندبوونی شەرعی پێشێل دەکات لە پێناو دەسوەردانی شەرعی.**[505]

کەواتە لە دونیابینی لیبرالی دا دەوڵەت هەوڵ دەدات بۆ فەراهەم کردنی بیاقی پێویست و ڕێکاری یاسایی بۆ دروست کردنی فشار لە لایەن جەماوەری خەڵکەوە لە پێناو جێبەجێ کردنی داواکارییەکانیان.[506] لێرەدا مافەکان لە خودی خۆیان دا دەکەونە پێش دروست بوونی دەوڵەت و تەنیا حکومەت دەتوانێت لە ڕێگای ڕێسا و یاساکانەوە چوارچێوەی دەستوورییان بۆ دابنێت، ئەمە ڕەگە سەرەکییەکانی بۆ تێڕوانیینی جۆن لوك دەگەڕێتەوە، کە دەوڵەت ڕۆڵی ناوبژیوانی دەگێڕێت و پارێزگاری لە مافەکان دەکات. بەم جۆرە بە «حوکمی ئەو ڕۆڵەی کە هاوولاّتی بە شێوەیەکی گشتی لە کۆی پرۆسسی دیموکراتی دا داگیری دەکات، سنوور و دیاریکردنی ئەم ڕۆڵە سەربەخۆ نییە لە چەمکی ماف کە بەردەوام پەیوەستە پێیەوە ».[507] ئەوەی پەیوەندی بە مۆدێلی لیبرالیەوە هەیە بە هۆی جەخت کردنی لەسەر بازاڕ وای کردووە کە پرسی سۆلیدارێتی کۆمەلاّیەتی نێوان هاوولاّتیان و دادپەروەری کۆمەلاّیەتی خستۆتە دەرەوەی بایەخە سیاسیەکانی خۆی و سەرەڕای ئەمە بە جەخت کردنەوەی لەسەر مافی نیگەتیڤ وا دەکات هاوولاّتیان ناچالاك بن، کەواتە « ئەم مافە خودیانە مافی نێگەتیفن کە پەراوێزێکی لاوەکی دەبەخشێت و لە چوارچێوەی ئەمەدا خاوەن مافەکان ئازادن لە هەموو

---

٥٠٥. یورغن هابرماس، سەرچاوەی پێشوو، ل٢١٩.

٥٠٦. سی. بی. مك فرسون، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٢.

٥٠٧. محمد الأشهب ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٩١.

زۆره ملێیەکی دەرەکی».[508] ئەمە سەبارەت بە مافە سیاسییەکانیش ڕاستە و زەمینەیەکی یەکسانە بۆ دروست بوونی بڕیار لە سەر چارەنووس و دەرفەتی بەشداری لە کۆی پرۆسەی دیموکراسی دا لە ڕێگای دامەزراوەکانەوە.

**ب- تێڕوانینی دیموکراسی لیبرالی بۆ ماف:**

بە پێی تێڕوانینی لیبرالی، مانای هەموو سیستەمێکی یاسایی لەوەدایە کە لە هەموو حاڵەتەکان دا ڕێگە بە دیاری کردنی مافە موستەحەقەکان دەدات بۆ ژمارەیەك لە تاکەکان.[509] بەڵام دەبێت ئاماژە بەوە بکرێت کە جەخت کردن لەسەر ماف و رای تاك لە ژیانی خۆی و بەشداری خۆویستانەی لە کاروباری کۆمەڵایەتی دابەو مانایە نییە کە دەوڵەت ڕێگە دەدات بەرژەوەندی و رای زۆرینە لە بەرانبەر رای تاك دا زیانی پێبگات.[510] بەڕای هابرماس پێگەی هاووڵاتیان بەهۆی مافی تاکەکەسی دیاری دەکرێت کە لە بەرانبە دەوڵەت و هاووڵاتیەکانی تر دا هەیەتی. تا ئەو کاتە کە تاکەکان بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان لە چوارچێوەی ڕێسای یاسایی دا بەدەست بێنن حکومەت پارێزگاریان لێ دەکات. لەم تیۆرە دا سیستەمی یاسایی لە مافە خودییەکانەوە هەڵدەسەنگێنرێت. لە روانگەی لیبرالیەکانەوە، ژمارەیەکی زۆر لە مافەکان هەمیشە بنجینەکانی خۆیان لە یاسایەکی بەرزتر دا دەدۆزنەوە، جا ئەمە بە نیسبەت سیاسەتەوە چ لە عەقڵێکی باڵاوە بێت یان لە وەحیەوە. « لە تیۆری لیبرالی دا بنەماکانی ماف و شەرعیەت رەگی لە ناو "مافی باڵاتر"ی عەقڵی یان سیاسی *Transpolitik Reason* دایە»[511] واتە سروشت ئەم مافانەی بە تاکەکان بەخشیوە. کەواتە مافەکان لە روانگەی لیبرالیەوە لەسەر بنەمای هەندێ پرەنسیپی جەوهەری و نەگۆڕ دادەمەزرێن، و لە هەندێ حاڵەت دا هەمان مافە سروشتیەکانن و لە چوارچێوەی دەستوور دا دادەڕێژرێن کە سنووری نێوان ئەرك و مافی هاووڵاتیان لەگەڵ دەسەڵاتی سیاسی و لەگەڵ یەکتر دا دیاری دەکات.

---

٥٠٨. یورغن هابرماس ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢١٩.

٥٠٩. هەمان سەرچاوە، ل ٢٢٠.

٥١٠. حاتم قادری، اندیشەی سیاسی در قرن بیستم، نشر سمت، تهران، ١٣٨٥(٢٠٠٦)، ل ٢٧-٢٨.

٥١١. د.منصور انصاری ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٢٢.

## ج- سروشتی دروست بوونی ئیرادەی سیاسی

له تێڕوانینی لیبرالی، له بنەڕەت دا سیاسەت کورت دەکرێتەوە بۆ ململانێ له پێناو داگیرکردنی ئەو شوێنانەی که دواتر ڕێگه به تاکه سەرکەوتووەکان دەدا له دەسەلاتی ئیداری دا ڕۆڵ بگێڕن. له پانتایی گشتی و پەرلەمان دا سەیرورەی دروست بوونی را و ئیرادەی سیاسی له رکابەری نێوان بکەرەکانەوه دروست دەبێت که به گشتی پابەندن به کردەی ستراتیژی وئامانجیان لێی پارێزگاری کردنه له شوێنگەکانی دەسەلات، لێرەدا سەرکەوتن له شەڕەکه بەو رەزامەندییه دەپێورێت که هاوولاتیان به ژمارەیەك کەسایەتی و بەرنامەی دەبەخشن و ئەمەش به پشت بەستن به پرۆسسی دەنگدانی گشتی یەکلایی دەکرێتەوه.[٥١٢] له تیۆری لیبرالی دا رادەی سەرکەوتن لەسەر بنەمای تەئیدکردنی بەرنامەی حزب و گروپەکان دەبێت و بونیادی بازاڕ وەك مۆدێلێك بۆ گرانتی دادپەروەری به سەر بونیادی سیاسی دا پیاده دەکرێت و دەتوانین بلێین به پێی هاوکێشەکانی بازاڕ سیاسەت هاوسەنگ دەکرێت. لێره دا پێوەری سەرکەوتنی سیاسەت و کارگێڕی گشتی به پێی حساباتی قازانج و زیان لێك دەدرێتەوه و له هەر هەلبژاردنێك له نێوان لایەن و حزبه سیاسیەکان، ژمارەی دەنگەکان رکەبەرایەتیەکه یەکلایی دەکاتەوه، ئەمەش پشت به کردەی ستراتیژی دەبەستێ به مانا هابرماسیەکەی واته لەم پرۆسسه دا گرنگ به دەست هێنانی زۆرترین ژماره وسەرکەوتنه نه شێوازی کردەوەکه و چۆنیەتی پەیوەندییەکه. هەربۆیه له پانتایی گشتی و پەرلەمان دا سەیرورەی دروست بوونی رای گشتی و ئیرای سیاسی به رکەبەرایەتی له نێوان هەموو بکەرەکان دیاری دەکرێت له رێگای کردەی ستراتیژیەوه که ئامانج لێیان پاراستنی پێگەی دەسەلاتی خۆیانه.[٥١٣] هەربۆیه «هەندێ له بیرمەندان، دیموکراسی به رکەبەرایەتی سیاسەتمەداره پیشەگەرەکانه بۆ بەدەست هێنانی رای هاوولاتیان لێك دەدەنەوه و هەندێکی تر پێیانوایه دیموکراسی سیستەمێکه که بڕیاره جەماعیەکان پاش تاوتوێ کردنێکی ورد و دوور و درێژ وەردەگیرێن و ئەم تێڕوانینه سەربەخۆیی تاکەکەسی و بەشداری هاوولاتیان بەرز دەنرخێنێ ».[٥١٤] کەواته به پێی تێڕوانینی

٥١٢. یورغن هابرماس، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٢٢١.

٥١٣. محمد الاشهب، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٩١.

٥١٤.د. محمد ضمیران، دمکراسی و حقوق انسانی از نظر هابرماس ، له رێکەوتی١٦/١٢/٢٠١٠ وەرگیراوه، ل ١له ٥

لیــبرالی جیاکردنــەوەی نێــوان جیهــازی دەوڵــەت و کۆمــەڵگا و دروســت بــوونی ئــیرادەی دیموکراتیانەی هاووڵاتیان کە تەنیا لە دەوڵەتی ماف دا پیادە دەبێت توخمێکە لـە توخمـەکانی دەستوور و دەبێ دەستوور دەسەلاتی دەوڵەتیش دیاری بکات.

**کۆڵگەی مۆدێلی لیبرالی دیاری کردنی چارەنووسی ئەو هاووڵاتیانە نییە کە راوێژ لەسەر ئەو بوارانە دەکەن کە پەیوەندی بە خۆیانەوە هەیـە، بـەڵکو ملکەچ بوونە بۆ نۆرمەکانی دەوڵەتی ماف لە کۆمەڵگایەکی ئابووری دا کە گرانتـــی رزگـــاربوونی گشـــتی *Public Salute* دەکـــات بـــە مانـــا ناسیاسیەکەی.[515]**

تیۆری لیبرالی لەسەر کەلێنی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگا دامــەزراوە، واتــە دەوڵــەت لــە رێگای سیستەمی بیرۆکراسی و رۆتــین و پشــت بەســتن بــە دەزگاکــان بــەردەوام دووری نێــوان هاووڵاتیان و دەسەلاتداران تۆخ دەکاتەوە، هــەر بۆیــە بــە رای هابرمــاس دیموکراســی لیــبرال ماهییەتی نێوانخودیی سیاسەت لەبیردەکات، لە جیاتی عەقلانیەتی پەیوەندیکاری پشــت بــە عەقلانیەتی ئامرازی دەبەستێت و جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە سیاسەت زۆر جیاوازە لە بازاڕ و ئابووری. بە پێی ئەم بۆچوونە دەوڵەت دەکەوێتە بەرانبەر کۆمەڵگا و لە رێگـای پارێزگـاری کردن لە مافە بنەڕەتیەکانی تـاك و سـەروەری یاسـاوە پەیوەنـدی نێـوان هاووڵاتیـان دیـاری دەکرێت. یەکێك لە لایەنە پۆزەتیڤەکانی لە مۆدێلی دیموکراسی لیبرالی ئەوەیە کـە تـاك وەك بکەرێکی سەربەخۆ دەمێنێتەوە بە پێچەوانەی مۆدێلی کۆمـاری کـە ئـیرادەی تـاك لـە نێـو ئیرادەی کۆ دا دەتوێنێتەوە.کە رەنگە ئەم (کۆ)یە دواتر لە فۆرمی هەندێ گروپی دەســەلات و بەرژەوەندیخواز دا خۆی بنوێنێت کە دوورە لە فەلسەفەی خۆی، واتە تاکەکان یان ئەندامــەکان لە هەمەکیەتی خۆیان دا.

## ٢- سیاسەت لە تێڕوانینی کۆماری دا

لە بەرانبەر مــۆدێلی لیــبرالی دا سیاســەت لــە روانگــەی کۆمارییــەوە، تــەنیا لەئــەرکی بەڕێوەبردنی گشتی و راگرتنی هاوسەنگەی نێوان بەرژەوەندییەکان دا کورت نابێتەوە، بــەڵکو

---

http://www.bazyab.ir/index.php?option=com_content&task=view&id=37917&Itemid=43

٥١٥. یورغن هابرماس، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٢٤.

به پێچەوانەوە لێرە دا دەوڵەت لە میانی سەیرورەی بەکۆمەڵایەتی کردن لە هەمەکیەتی خۆیدا دروست دەبێت، واتە کاتێ دەوڵەت لـە گوتـاری سیاسـی خۆیـدا پێناسـەیەکی ئـەخلاقی بـۆ هەمـــەکی یـــەکگرتووی هاووڵاتیـــان دەخاتـــەڕوو. لـــەم مۆدێلـــە دا وەك فـــۆڕمێکی تێڕامانکارانە(تأملی) بۆ سیاقی ژیانی ئـەخلاقی وێنـا دەکرێـت، ئـەو نێوەنـدەی کـە تێیـدا ئەندامانی جڤاکێکی سۆلیدار کە بە شێوەیەکی ڕەمەکی (عەفەوی) دروست بـووە، پەیوەنـدی دوولایەنەی نێوان خۆیان دەرك دەکەن، بەو سیفەتەی هاووڵاتی دەوڵەتن، هەربۆیە ئەمانـە بـە ئیرادە و ئاگاییەوە چوارچێوە و یاسا بۆ هەلومەرجی دانپیانانی دوولایەنە دادەڕێژن لـە پێنـاو دامەزراندنی پەیوەندیەك لە نێوان خاوەن مافە ئازاد و یەکسانەکان.[٥١٦]

لـەم مۆدێلـە دا دروسـت بـوونی چوارچـێوەی سیاسـی پەیوەنـدی بـە زەرورەتێکـی ئەخلاقیەوە هەیـە کـە یـەکانگیری نێـوان ئەندامـەکان دەهێنێتـە ئـاراوە کـە لـە پرۆسـەی گەشەپێدانی کۆمەڵایەتی دا دێتە بەرهەم، یاسا و مافەکان پەیوەندییان بە یاسـایەکی بـاڵاوە نییە بەڵکو گوزارشت لە ئیرادە و هۆشیاری تاکەکان دەکاتەوە لە هەمەکییەتی خۆیان دا، هەر وەك لە بەشی یەکەم دا لە باسی گەشەگەرایی دا بە درێژی ئاماژەمان بۆ کردووە. لە ڕوانگەی کۆماریەوە پانتایی گشتی سیاسی و ژێرخانەکەی کە لە کۆمەڵگای مەدەنی پێك دێت، ئەمـە دەلالەتێکی ستراتیژی بەدەست دێنێ. هەردووکیان وەك پانتایی ممارسە کردنی لێك تێگەیشـتن لە نێوان هاووڵاتیانیان لێکدەدرێنەوە کە گرانتی هێزی یەکانگیری (الانـدماج) و سـەربەخۆیی دەکات.[٥١٧] لەم مۆدێلە دا سیستەمی دیموکراسی هەڵدەستێ بە دروست کردنـی ڕای گشـتی و ئیرادە لە میانی چەندین قۆناغ لە نێو پانتایی گشتی دا کە تەنیا لـە سـەر بنـەمای ئـابووری بازاڕ ناوەستێت بەڵکو لە سەر بنەمای گفتوگۆی گشتی دادەمـەزرێت کـە لـە نـاو پەرلـەمان ئەنجام دەدرێت و بونیادێکی سەربەخۆیە بۆ لێك تێگەیشتن. کەواتـە لـە مـۆدێلی کۆمـاری دا دیموکراسی و پانتاییەکانی چالاکی سیاسی تەعبیر لە کردەی پەیوەندیکاری دەکـەن لـە پێنـاو بەدەست هێنانی لێك تێگەیشتن و داڕشتنی بەرژەوەنـدی هاوبـەش و ئەمـەش وا دەکـات بـە پێچەوانەی مۆدێلی لیبرالی لەسەر بنەمای سیستەمی بازاڕ دانەمەزرێت و کۆمەڵگای مەدەنی ڕۆڵێکـی گرنگـی تێـدا دەگێڕێـت، چـونکە هابرمـاس جـەخت لەسـەر ئـەوە دەکاتـەوە کـە

---

٥١٦. یورغن هابرماس، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢١٩.

٥١٧ . هەمان سەرچاوە، ل ٢١٩.

"دەسەڵات" دیموکراتیزە دەکرێت، بەڵام "پارە" نا.[518] بەڵام کێشەکە ئەوەیە کە هێشتا لە چوارچێوەی دەزگا رەسمیەکان دا ئەنجام دەدرێت.

### أ- روانگەی دیموکراسی کۆماری بۆ هاووڵاتی

\بە پێچەوانەی تێڕوانینی لیبرالی، مافە مەدەنیەکان و بە تایبەتی مافی بەشداری و مافی گوزارشتی سیاسی مافێکی نیگەتیڤ نین، بەڵکو مافی پۆزەتیڤن. «ئەم مافانە تەنیا گرانتی نەمانی هەموو جۆرە زۆرەملێییەکی دەرەکی ناکەن، بەڵکو گرانتی بەشداری لە کردەی جەماعی دەکەن کە بە بێ ئەمە هاووڵاتیان ناتوانن ئەو شتانە بە دەست بێنن کە ئارەزووی دەکەن: واتە خودەکان لە رووی سیاسیەوە بەرپرسیارن لە بەرانبەر خودە ئازاد و یەکسانەکان دا».[519]

لێرەدا یەکانگیری و پاراستنی ژیانی سیاسی جەماعی ئەولەویەتی پێ دەدرێت، واتە هاووڵاتیان بە پێی دانپیانانی کۆمەڵگا بە خاوەن ماف دادەنرێن و مافە مەدەنیەکان و بە پلەی یەکەم مافی بەشداری و مافی رادەربڕین مافی پۆزەتیڤن.[520] کەواتە بە پێی ئەم تێگەیشتنە تاك لە چوارچێوەی ژیانی بەکۆمەڵی سیاسی دا وەك خودێکی سەربەخۆ سەیری ناکرێت، بەڵکو پێناسەکەی بەندە بە دانپیانانی ئەندامەکانی ترەوە.

### ب- تێڕوانینی کۆماری بۆ ماف:

بە رای هابرماس مۆدێلی کۆماری لانیکەم روانگەیەك پێشکەش دەکات بۆ ماف کە بایەخێکی یەکسان دەدات بە کەماڵی تاك و مافە خودییەکەی و کەماڵی ئەو جڤاکەی کە تێیدا دەژی و تەنیا خودەکان دەتوانن بە شێوەیەکی دوولایەنە و بە سیفەتی تاك یان ئەندامی جڤاك یەکتری تێدا بناسن. روانگەی کۆماری مەشروعیەتی یاسا دەبەستێتەوە بە شێوازە رێکارییە دیموکراتیەکانی دروست بوونی ئەم یاسایانە، وێڕای پارێزگاری کردن لە یەکگرتوویی

---

٥١٨ .یورگن هابرماس، جهانی شدن و ایندەی دموکراسی-منظومەی پسا ملی، ت:کمال پولادی، نشر مرکز، چ ٣، تهران،١٣٨٤(٢٠٠٥)، ل ١١٨.

٥١٩ . یورغن هابرماس، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٢٠.

٥٢٠ . محمد الاشهب ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٩١.

ناوخۆیی نێوان مارسەی دیاری کردنی چارەنووسی گەل و هەژموونی ناکەسێتی یاساکان. لای کۆمارییەکان دواجار یاساکان هیچ نین جگە لە ئیرادەی سیاسی بالآدەست.

**بە پێی تێڕوانینی کۆمارییەکان ئامانجی هەموو جڤاکێك چاکەی هاوبەشە(خير المشترك) کە بەشێکی سەرکەوتنی هەوڵی سیاسی خۆی لە دیاری کردن، دامەزراندن، جێبەجێ کردن و پاراستنی کۆمەڵێك ماف (یان زاراوەیەکی کەمتر دیاریکراو واتە یاسا) دا دەدۆزێتەوە کە زۆرتر گونجاون لەگەڵ هەلومەرج و ئەخلاقی ئەم جڤاکە دا.**[521]

بەم جۆرە بۆمان دەردەکەوێت کە لە تیۆری کۆماری دا مافەکانی ئەندامانی کۆمەڵگا ناکەونە پێش دروست بوونی دەوڵەت، بەڵکو لە پرۆسسێکی دیموکراتی دا دەبێ گەلاڵە بکرێن لە میانی راوێژی بەردەوام لەسەریان و بەبێ رەزامەندی ئەندامەکان یاساکان شەرعیەت وەرناگرن و کەمالی ئەندامەکان واتە وەرگرتنی ئەو نۆرم و بەها دیاریکراوانەی کە لە جڤاك دا پەسندن و لە رێگای گەشەپێدانی کۆمەلآیەتیەوە تاکەکانی پێ پەروەردە دەکرێت. لە مۆدێلی کۆماری دا پێگەی هاوولآتیان و مافە سیاسیەکان، وەك مافی بەشداری لە کۆڕ و کۆبوونەوەی سیاسی و دەرفەتی بەشداری لە کردەی گشتی بۆ هاوولآتیان دابین دەکرێت بۆ ئەوەی بتوانن وەك بکەری بەرپرسیار و یەکسان و ئازاد هەڵسوکەوت بکەن.

**ج. سروشتی دروست بوونی ئیرادەی سیاسی:**

لە تێڕوانینی کۆماری دا دروست بوونی ئیرادەی سیاسی و رای هاوولآتیان لەسەر بونیادی بازاڕ market دانەمەزراوە. « بەڵکو لەسەر بونیادی سەربەخۆیی پەیوەندیکاری گشتی دامەزراوە کە بە ئاراستەی لێك تێگەیشتن دەچێت، هەر بۆیە سیاسەت بەمانای پیادەکردنی دیاری کردنی چارەنوسی هاوولآتیان، بازاڕ نییە بەڵکو پەیڤینە *Conversation*».[522] ئەمەش پشت بە دیالۆگی گشتی و کراوە دەبەستێ لە نێوان هێز و گروپە جیاوازەکان، ئەو حزبانەی هەوڵدەدەن دەسەلآتی دەوڵەت بگرنە دەست لەسەریان پێویستە پشت بە شێوازی راوێژ و گفتوگۆ ببەستن لە پانتایی گشتی دا بۆ خستنەڕووی بەرنامەکانیان.

---

٥٢١ . یورغن هابرماس، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٢٢٠-٢٢١.

٥٢٢ . هەمان سەرچاوە ، ل ٢٢١.

**بەم جۆرە بە رای هابرماس راوێژ هەنگاونانە بەرەو هەڵوێستێك سەبارەت بە هاوكاری كۆمەڵایەتی و بە تایبەتی سەبارەت بە ئیرادەی رازی بوون بەو ئەرگۆمێنتەی كە تەنیا ئەو داواكارییانە وەبەرچاو ناگرێت كە ئێمە گوزارشتیان لێ دەكەین، بەڵكو داواكاری ئەوانیتریش وەبەرچاو دەگرێت. راوێژ لەرێگای گۆڕینەوەی روانگە و تێڕوانینەوە دەبێت لەسەر بنەمای نیازپاكی.**[٥٢٣]

لە مۆدێلی كۆماری دا شەرعیەتی یاساكان بەرهەمی رێكاری دیموكراتیە. مافەكان لە نێو دەزگا و دامەزراوەكان و بە پرۆسسی یاسادانان تێپەڕ دەبن و پیادەكردنیشیان بە سەر كۆمەڵگا دا بە پارێزگاری كردن لەم پرۆسسە ئەنجام دەدرێت. لە تیۆری لیبرالی دا بە شێوەیەكی گشتی دەوڵەت ئەركی ناوبژیوانی نێوان بەرژەوەندیە دژبەرەكانی لەسەر شانە. ئەوە لە كاتێك دایە كە لە تیۆری كۆماری دا دەوڵەت و كۆمەڵگا وەك هەمەكێكی یەكگرتوو خاوەن ئەركی بەكۆمەڵایەتی كردن و ئەخلاقییشە كە خۆی لە گەشە پێدانی هاووڵاتیان دا دەبینێتەوە.

بەڵام لایەنی نیگەتیڤ لە روانگەی هابرماسەوە بریتیە لەوەی كە ئەم مۆدێلە زێدەڕۆیی دەكات لە ئایدیالیزم و پرۆسسی دیموكراتی دەخاتە ژێر فەزیلەتی هاووڵاتیان كە بە ئاراستەی رزگاربوونی گشتی دەڕوات. سەبارەت بە لێك تێگەیشتنی ئەخلاقی، سیاسەت تەنیا جەخت لەسەر شوناسی جەماعی ناكاتەوە. هەڵەیەكی تری ئەم مۆدێلە ئەوەیە كە لە شیكردنەوەكانی خۆیدا، گفتوگۆی سیاسی بە شێوەیەكی زێدەڕۆیانە بە ئامادەبوونی پرسی ئەخلاقەوە دەبەستێتەوە. چونكە لە روانگەی هابرماسەوە « ئامانجە گرنگە سیاسیەكان زۆربەی كات بەرژەوەندی و ئاراستە ئیكسۆلۆژی بەلاوە دەنێت كە لە هەمەكییەتی خۆیان دا شوناسی جڤاك پێك دێنن، ئەم ئاراستە و بەرژەوەندیانە بە شێوەیەكی بەرفراوان لە نێو خودی كۆمەڵگا دا دژایەتی دەكرێن و هەربۆیە پێویستی بە رێككەوتن هەیە ».[٥٢٤] بە واتایەك دەبێت یاسا لە رووی كۆمەڵایەتیەوە ئەركێكی هەماهەنككاری هەبێت و لە لایەكی ترەوە نۆرمەكانی رەفتاری كۆمەڵگا بخاتە بواری جێبەجێ كردنەوە. بەڵام ئەوەی لێرە دا گرنگی هەیە ئەوەیە كە نابێت یاسا و رێساكان بەرهەمی سیاسەتی تایبەتی بن بەڵكو دەبێ شەرعیەتی خۆیان لە

---

٥٢٣ . هەمان سەرچاوە، ل ٢٢١.

٥٢٤ . هەمان، ل ٢٢٢.

کۆدەنگی وەربگرن.[525] کەواتە هەندێ نۆرمی ئەخلاقی کە ملکەچی بەها و کلتوری تاکەکانی کۆمەڵگان لە توانایان دا نییە کە کێشە سیاسی و کۆمەلأتیەکان چارەسەر بکەن بـە تایبـەتی لە کۆمەڵگا پلۆرالیستیەکان دا کە فرەیـی ئـایینی و کلتـوری و زمـانی روانگـەی جیـاوازی ئەخلاقی دەخولقێنێ. دابەشکردنی بەرژەوەندییەکان لە رێگای رێککەوتن لە نێوان حزبەکانـدا پێویستی بە ئیرادەی هاوکاری هەیە بۆ گەیشتن بە دەرەنجامی مەعقول. بەلاٌم ئەم رێککەوتنـە لەو شێوازەی گفتوگۆی عەقلانٌی رزگاری نابێت کە دەسەلاٌت بێلایەن *Neutralize* دەکـات و لە کردەی ستراتیژی دووری دەخاتەوە. دادپەروەری رێککەوتنەکان پەیوەستە بـە هەلومـەرج و رێکاری عەقلانٌی کە ئەویش پاساوی عەقلانٌی دەوێت. ئەو مافـەی لـە رێگـای سیاسـەتەوە دادەمەزرێ بۆ ئەوەی شەرعی بێـت پێویسـتە لانیکـەم گونجـاو بێـت لەگـەڵ ئـەو پرەنسـیپە ئەخلاقیانەی کە بانگەشەی دروستی یونیڤێرسال دەکەن لەو دیوی جڤاکی یاسایی واقعیدا.[526]

ئەمەش دیسان سنوورێکی معیاری و بەهایی بەمانا هەمەکییەکەی دادەرێژێت کە لەسەر بنەمای ئەمە رادەی عەقلانٌی بوونی بەرژەوەندی لایەنەکان هەڵسەنگاندنی بۆ دەکرێت و ئەمە دیسان چوارچێوەی جولٌەی سیاسی و داخوازییەکان دیـاری دەکـات و دەبـێ هەموولایەنـەکان رێزی بگرن. ئەم گەورە کردنەوەی پرسە ئەخلاقیەکان بەو پێیەی کـە ئاراسـتەکاری گفتوگـۆی سیاسیە لە لایەن هابرماسـەوە رەد دەکرێتـەوە چـونکە ئـەوەی بـۆ ئـەو گرنگـە ئەولەویـەتی دادپەروەریە بە سەر خێر و چاکە دا[527]. یەکێك تر لە کەموکورپیەکانی ئەم تیۆرە ئەوەیـە کـە جگە لەوەی روانگەیەکی ئەخلاقی بۆ تاك و کۆمەڵگا هەیە لە هـەمان کـات دا پێناسـەیەکی دیاری کراو بە تاك دەبەخشێت ئەمەش رەنگە هەندێ مەیلی ئایـدۆلۆژی لێ بکەوێتـەوە یـان لانیکەم بە پێچەوانەی پرەنسیپەکانی خۆی کە کار بۆ دروست کردنی یەکانگیری کۆمەلأیـەتی و سۆلیدارێتی دەکات، کاریگەری نیگەتیڤی لەسەر ئەمە هەبێت بەتایبەتی لە کۆمەڵگا فـرە کلتور و ئایینیەکان دا.

---

٥٢٥ .د. محمد ضمیران، ل٤ لە ٥.

٥٢٦ . هەمان سەرچاوە، هەمات لاپەڕە.

٥٢٧. محمد الأشهب ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٩٣.

## تەوەری دووەم: مۆدێلی دیموکراسی راوێژگەری

هابرماس وەك خستنەڕووی مۆدێلی ئەلتەرناتیڤ بۆ هەر دوو مۆدێلی لیبرالی و کۆماری، پاش رەخنەگرتن و راستکردنەوەی بەشێك لە رەهەندە تیۆریەکەیان تیشك دەخاتە سەر ئەوەی کە ئەگەر چەمکی رێکاری بۆ سیاسەتی راوێژگەری بکەینە ناوەندێکی نۆرماتیڤ بۆ تیۆری دیموکراسی، ئەوا جیاوازییەکان جارێك سەبارەت بە تێڕوانینی کۆماری کە وەك جڤاکێکی ئەخلاقی سەیری دەوڵەت دەکات و جارێکی تر لەهەمبەر روانگەی لیبرالی کە پێیوایە دەوڵەت پاسەوانی کۆمەڵگایەکی ئابوورییە ئاشکرا دەبێت.[٥٢٨]

### أ. تێڕوانینی دیموکراسی راوێژگەری بۆ سیاسەت:

بە رای هابرماس ماهیەتی بوونی دەوڵەت لە پاراستنی مافە تاکەکەسیە یەکسانەکان دا نییە بەڵکو ماهیەتی بوونی دەوڵەت لە پاراستنی پرۆسسی دروست بوونی راو ئیرادەیە *Opinion and Will Formation* کە تێیدا هاوولاّتیە ئازاد و یەکسانەکان دەگەن بە ئاستێك لە تێگەیشتن کە لە سەر بنەمای ئەمە ئامانج و نۆرمەکان لە بەرژەوەندی هەموو تاکە یەکسانەکان دەبێت. هەروەها ئاماژە بەوە دەکات کە چەمکی سیاسەتی راوێژگەری گرنگیەکی ئەمپریکی وەرناگرێت تەنیا ئەو کاتە نەبێت کە هەڵدەستین بە سەنگ و بایەخ بەخشین بە فرەیی شێوازەکانی پەیوەندیکاری کە بە هۆیەوە ئیرادەی جەماعی دروست دەبێت، ئەویش تەنیا بەهۆی لێك تێگەیشتنی ئەخلاقی سەبارەت بە شوناسی جەماعی نابێت، «بەڵکو بە هۆی دابەشکردنی بەرژەوەندی و رێککەوتنی عەقلانی بەمانا غائیەکەی دەبێت لە رێگای هەڵبژاردنی ئامرازی گونجاو و بە پشت بەستن بە پاساوی ئەخلاقی و پشکنینی یەکگرتوویی (تماسك) یاسایی».[٥٢٩]

لێرە دا بۆمان دەردەکەوێت کە مۆدێلی راوێژگەری دەرفەتی ئەزموونی بەدەست دێنێت و فرەیی فۆرمەکانی پەیوەندیکاری وەبەرچاو دەگرێت کە لەمیانی دا ئیرادەی گشتی دروست دەبێت کە تەنیا لەسەر تێگەیشتنی ئەخلاقی بۆ شوناسی جەماعی پێك نایەت، بەڵکو لەسەر بنەمای هاوکێشەی پێشووی بەرژەوەندی و ئەو گوشارانەی کە دەخرێنە سەر هەڵبژاردنی

---

٥٢٨. یورغن هابرماس، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٢٣.

٥٢٩ .سەرچاوەی پێشوو ، ل ٢٢٢.

عەقلانی بە پێی سنووری کۆتایی ئەو ئامرازانەی کە لەبەر دەست دان لە لایەن سەلماندنی ئەخلاقی و تەجانوسی دادوەری.[530] کەواتە « رێکارە دیموکراتییەکانی مۆدێلی راوێژگەری پەیوەندییەکی ناوخۆیی لە نێوان دانوسان و گفتوگۆ سەبارەت بە دادپەروەری دروست دەکات، هەروەها ئەم رێکاریەتە دیموکراتییە رێگە بە گریمانەکردنی ئەوەش دەدات کە لە هەلومەرجێکی ئەوتۆ دا دەشێت دەرەنجامی مەعقول و مونسف بۆ هەمووان بەدی بێت».[531] کەواتە ئەرگۆمێنی مۆدێلی راوێژگەی ئەوەیەکە لە رەوتی وتووێژێکی ئازاد و لۆژیکی نێوان بەشدارە سەربەخۆ و ئازادەکان دا دەشێ کۆدەنگی لەسەر ئەو کارە بەدەست بێت کە بڕیارە بەشێوەیەکی یاسایی و دادپەروەرانە و لۆژیکی ئەنجام بدرێت.[532] ئەم پرۆسەسە سیاسیە واتە سیاسەتی دروست بوونی را و ئیرادەی دیموکراتی لە میانی هەڵبژاردنی گشتی و کاری پەرلەمانی لە روانگەی لیبرالییەوە تەنیا لە میانی رێککەوتن و چەسپاندنی دادپەروەری دەبێت سەبارەت بە بەرژەوەندییە جیاوازەکان و لە تێڕوانینی کۆماریش دا لە رێگای لێك تێگەیشتن دێت دەربارەی شوناسی جەماعی. بەلام سیاسەتی راوێژگەری یان دیموکراسی رێکاری یان گفتوگۆیی لە سایەی ئەم دوو مۆدێلە دا توخمەکانی خۆی لە هەر دوو لا وەردەگرێت و لە ناو چەمکی رێکاری ئایدیالی بۆ راوێژ و بڕیار لێکیان گرێ دەدات.

## ب. وێنای دیموکراسی راوێژگەری بۆ ماف و ئازادی:

لە مۆدێلی دیموکراسی راوێژگەری دا کە پشت بە هەندێ رێکاری ئەوتۆ دەبەستێ کە لە لایەن هەمووانەوە گفتوگۆی لەسەر کراوە و پەسند کراوە کە تێیدا شێوازی گەیشتن بە ماف و ئازادییەکان هیچ پێش گریمانەیەك جگە لە دیالۆگی بەردەوام لە پێناو رێککەوتن و دواجار کۆدەنگی قبولّ ناکات و تاکەکان وەك بکەری سەربەخۆ لە کۆمەڵگا دا دەتوانن بەشداری بکەن لە داڕشتنی بڕیارەکان سەبارەت بە چارەنووسی خۆیان. **هەر بۆیە دەبینین مەشروعیەتی میکانیزمەکانی هەڵبژاردن لەسەر بنەمای یاسا دادەمەزرێت، و بەم جۆرە هابرماس خوێندنەوەیەکی نوێی بۆ یاسا هەیە، بە واتایەکی تر یاسایەك شەرعیەتی هەیە کە لە**

---

٥٣٠. مالفی عبدالقادر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٤٥.

٥٣١. یورغن هابرماس، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٢٢٣.

532 .Steven Whealty, Deliberative Democracy and Minorities, EJIL,Vol.14,No.3-507-527,2003,P.4.

**ڕەوتێکی پەیوەندی و لێك تێگەیشتنی ئازاد، ڕەزامەندی و پشتگیری هەموو هاوولاّتیانی بەدەست هێنا بێت و لە بنەڕەت دا یاسا ئەوە دەخوازێت کە یاساکان تەنیا لە شوێنێك دا بخرێنەڕوو کە پاش ڕاوێژی گشتی و گفتوگۆی لۆژیکی لە نێو هاوولاّتیان سەبارەت بەوەی دەبێت ئەنجام بدرێت کۆدەنگی دروست بکرێت.**[٥٣٣]

> **بەڕای هابرماس تیۆری گفتوگۆ کە لە پرۆسسی دیموکراتی دا ڕێکارەکانی بەهێزترە لە مۆدێلی لیبرالی و لاوازییەکەی کەمترە لە مۆدێلی کۆماری وسوود لە هەردوو مۆدێل وەردەگرێ. شوێنگەیەکی گرنگ دەبەخشێت بە پرۆسسی دروست بوونی را و ئیرادەی سیاسی بەلاّم بەبێ ئەوەی[وەك مۆدێلی کۆماری] بە جۆرێك لە دەستووری دەولّەتی ماف تێبگات کە شتێکی لاوەکییە: لە ڕوانگەی ئەوەوە مافە بنەڕەتیەکان و پرەنسیپەکانی دەولّەتی ماف، وەك وەلاّمێکە کە لە بەدەزگایی کردنی پێداویستیەکانی پرۆسسی دیموکراتی لەمەڕ پەیوەندیکاری دێتە ئاراوە.**[٥٣٤]

کەواتە دەبێت بەشێك لە ڕێکارە دیموکراتیەکان لە ناو دەستوور دا جێگیر بکرێن و پێویستە کۆی ڕێسا و ڕێوشوێنە یاساییەکان بەرەنجامی گفتوگۆی خودە ئازادەکان و یەکسانەکان بێت و دواجار لە ناو کۆمەلّگا دا لە شێوەی دەزگا و دامەزراوەکان دا ڕەنگ بداتەوە و بشێت بۆ بەردەوامی پرۆسسی دیموکراتی بەکار بهێنرێتەوە.

### ج. دیموکراسی راوێژگەری و پرۆسسی دروست بوونی را و ئیرادە:

بەپێی ئەم تیۆرە بەدیهاتنی سیاسەتی راوێژگەری پەیوەست نییە بەو مەرجەوە کە کۆمەلێك لە هاوولاّتیان دەتوانن بە شێوەیەکی جەماعی هەلّسوکەوت بکەن، بەلّکو چاوەڕوانی ئەوەی هەیە کە ڕێکارە گونجاوەکان بەدەزگایی بکرێن. تیۆری گفتوگۆ بەیارمەتی چەمکی هەمەکیەتی کۆمەلاّیەتی چەقبەستوو بە دەوری دەولّەت دا کار ناکات، کە خۆی لە ماکرۆ-

---

٥٣٣. جلال حاجی زاده، بازنمایی دموکراسی رایزنانه در اندیشەهای سیاسی هابرماس ،ل ٢ لە ٦.لەم سایتەی خوارەوە لە ڕێکەوتی ٢٠١٠/١٢/١٦ وەرگیراوە

http://www.helwist.com/Nuseran/Celal%20Hacizade/11%20%207%20%20Habermax.htm

٥٣٤. یورغن هابرماس، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٢٤.

خـــود Macro-Subject دا دەبینێتـــەوە (وەك چـــینی كۆمەڵایـــەتی، گـــەل، گروپێكـــی ئەخلاقی...هتد) هەروەها ناچێتە خانەی نۆرمی دەستووری كـە بەشـێوەیەكی نائاگایانەیـە و بەپێی مۆدێلی بازاڕ، دەسـەڵات و بەرژەوەندییـەكان رێـك دەخـات و دابەشـیان دەكـات. بـە شێوەیەكی گشتی ئەم تیۆرە خۆی دوور دەخاتەوە لە شێوازەكانی بیركردنەوەی نـاو فەلسـەفەی ئاگایی.[٥٣٥] چونكە كاتێ ئامرازی رێكخستنی پانتایی كۆمەڵایەتی گۆڕانی بەسەر دادێت و لە ئامرازێكەوە بۆ یەكی تر دەگۆڕێت دەرفەتی خود- رێبەری دیموكراتیانەی كۆمەڵگا لە دەسـت دەچێت.[٥٣٦] بەتایبەتی كاتێ گۆڕانەكە لە دەسەڵاتەوە بۆ بازاڕ بێت و پەیوەندییـەكان بـە پێـی مۆدێل و لۆژیكی بازاڕ رێكبخرێن كە هەمان كـردەی سـتراتیژی ئامانجـدارە. بـەم جـۆرە لـە مۆدێلی راوێژگەری یان رێكاری دا خودی تاك لەناو شوناسـی كـۆ دا لـەناو ناچـێت بـەردەوام دەتوانێت پارێزگاری لە ناسنامەی تایبەتی خۆی بكات و لە لایەكی تریشەوە تەنیا پشـت بـە كردەی ستراتیژی نابەسترێت و ئامانجی پرۆسسی سیاسی تەنیا گەیشـتن نییـە بـە سـەركەوتن، بەڵكو پرۆسسێكی نێوانخودی بەردەوامە سەبارەت بە بەها بەخشین بە نۆرم و یاساكان لە پێناو بە شەرعی كردنیان، چونكە لە فەلسەفەی خودیی یان ئاگـایی دا دیـاری كردنـی چارەنووسـی هاوولاتیانی هەموو كۆمـەڵگا دەشێت لەلایەن خودی تاكەكەسی یـان گروپێـك دەسـت نیشـان بكرێت و بەم جۆرە یان كۆمـەڵێك كەس وەك بكەری جەماعی نوێنەرایەتی گشت دەكـەن یـان بكەرە تاكەكان بە شێوازێكی مەجازی دەسەڵات دەگرنە دەسـت. لەبەرانبـەر ئەمـەدا تیـۆری گوتار پشت بە"نێوانخودی باڵا*Super Subjective*"دەبەستێ لە پرۆسسـی لێـك تێگەیشـتن كە لە لایەكەوە لە شێوەی وتووێژی بەدەزگایی كراوی گروپە پەرلەمانییەكان ئەنجام دەدرێـت و لە لایەكی ترەوە لە ناو تۆڕی پەیوەندیكاری دا لـە پانتـایی گشـتیی سیاسـی دا، بـەم جـۆرە مۆدێلی راوێژگەری **«بە شێوازێكی گونجاوی چاودێری دیموكراتیانـە دادەنرێـت»**.[٥٣٧] كەواتـە دیموكراسی راوێژگەری هابرماس هەم پێویستی بە پەیوەندیەكی زمانی- لێـك تێگەیشـتنی و گفتوگـۆی عـەقلانی هەیـە و هـەم نیازمەنـدی جۆرێـك لـە كـردەی پەیوەندیكارانەیـە كـە

---

٥٣٥. هەمان، ل ٢٢٤.

٥٣٦. یورگن هابرماس، جهانی شدن و ایندەی دموكراسی-منظومەی پسا ملی، ل ١١٨.

537. Steven Whealty,lbid., p. 29.

تایبەتمەندییەکانی بەرژەوەندی مەعریفی لە خۆیدا هەڵگرتبێت.[٥٣٨] لە ناو ئەم تۆڕانەدا، واتە لە پانتایی گشتی سیاسی و دەزگاکانی کۆمەڵگای مەدەنی دا را و ئیرادەی عەقلانی دروست دەبێت، سەبارەت بە پرسە گرنگەکانی کۆمەڵگا و بەم جۆرە هابرماس دیموکراسی لە تیۆری گفتوگۆ گرێ دەدات کە لە خودی خۆیدا لە پەیوەندیکاری یان کردەی پەیوەندی جیا نابێتەوە و گفتوگۆکارەکان بۆ دروست کردنی هەماهەنگی لەمەڕ بەرنامەی کارەکانیان لە میانی کارلێکی نێوانیان لەسەری رێکدەکەون.

کۆمەڵگای مەدەنی لە نموونەی "نێوانخودی"دا بەو پێیەی بنکەی کۆمەلایەتی پانتاییە گشتییە سەربەخۆکانە، لە کردەی ئابووری و کارگێڕی گشتی جیا دەکرێتەوە و هەروەها «لە رووی نۆرماتیڤیشەوە ئەم رێگایە بۆ تێگەیشتن لە دیموکراسی بە شێوەیەکی لۆژیکی بەرەو زەرووڕەتی دووبارە دابەشکردنەوەی هەر سی سەرچاوەکە: دارایی، دەسەلاتی کارگێڕی و سۆلیدارێتی دەچێت».[٥٣٩] بەرای هابرماس ئەم سەرچاوانە دەبنە هۆی دابین کردنی پێداویستیەکانی کۆمەڵگا هاوچەرخەکان وەك یەکانگیری (الاندماج) و رێکخستن و دەبێت لە پانتایی گشتی دا هێزی یەکانگیری کۆمەلایەتی بۆ سۆلیداریتی بەرفراوان بکرێت لە رێکارەکانی دروست بوونی را و ئیرادەی بە دەزگایی کراوی دەوڵەتی ماف و یاسا دا و ئەم هێزە دەتوانێ لە بەرانبەر هێزەکانی تری وەك هێزی پارە و دەسەلاتی کارگێڕی دا خۆی رابگرێت. بەپێی تێڕوانینی لیبرالی دروست بوونی ئیرادەی دیموکراتی ئەرکی "بەشەرعی کردنی"پیادە کردنی دەسەلاتی سیاسی لەسەرشانە و دەرەنجامەکانی هەڵبژاردن رێگا دەدات بە داگیرکردنی دەسەلاتی حکومی. حکومەتیش لە بەرانبەر گەل و پەرلەمان دا بەرپرسیارە. بەلام لە روانگەی کۆماریەوە دروست بوونی دیموکراتیانەی ئیرادە ئەرکێکی گرنگی هەیە ئەویش بریتیە لە دروست کردنی کۆمەڵگا بەو سیفەتەی جڤاکێکی سیاسیە و لە هەموو ماوەیەکی هەڵبژاردن دا سەرلەنوێ یادەوەری (الذاکرة) ئەم دامەزراندنە دەژیەتەوە. لە تیۆری گفتوگۆ دا شتەکە پەیوەندی بە نوێنەرایەتیەکی ترەوە هەیە: رێکار و پێداویستی پەیوەندیکاری پەیوەست بە دروست بوونی را و ئیرادە بە شێوەیەکی دیموکراتی کە وەك دابەشکەر، بایەخێکی گەورەی هەیە بۆ بەعەقلانی کردنی گوتار *Rationalization*

٥٣٨. جلال حاجی زادە، ل ٤ لە ٦.

٥٣٩. یورغن هابرماس، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٢٥.

*discursive* که له سەر بنەمای گفتوگـۆ دادەمـەزرێت و لـە سـایەی ئـەو دا ئـەو بڕیارانـە دادەڕژرێن که له لایەن حکومەت و ئیرادەی پەیوەست به یاسا و دادپەروەریەوە دەرچـووە[٥٤٠] و «ئەگەر کۆدەنگی تـەنیا بـە بەشـداری هاوولاٌتیـان لـە گفتوگۆیـەکی ئـازاد بێتـە دی، ئـەوا هەرچەشنە ئاستەنگێك که کۆتوبوند بخاتە سـەر ئـەم گفتـو گـۆ ئـازادە ئـەوا دەبێتـە هـۆی سەرهەلّدانی پەیوەندی کاری شێواو».[٥٤١] له هەردوو مۆدێلەکـە دا گرنگیـەکی تایبـەتی بـە پرسی سەروەری دراوە که هەردووکیان له دوو کۆشه نیگای جیاوازەوە دەگەڕێنەوە بۆ گەل، لـە تیڕوانینی کۆماری دا گەل به هێزەوە ئامادەیە و خاوەن سەروەرییە و له بنچینە دا به کەسی ناسپێرێت وهیچ کەسێك نوێنەرایەتی ناکات وەك لای ڕۆسۆ بـە دیـار دەکـەوێ. لـە مـۆدێلی لیبرالی دا تیڕوانینێکی واقعبینانـەتر بـۆ سـەروەری دەخرێتـە ڕوو، « لـە دەولّـەتی مـاف و دیموکراسی دا دەسەلاٌتی دەولّەت که مولّکی گەله پیادە ناکرێت تەنیا له ڕێگای هەلّبـژاردن و راپرسی و به پشت بەستن به ئۆرگانی تایبـەت بـە یاسـادانان و دەسـەلاٌتی جێبـەجێ کـردن و دادپەروەرییەوە نەبێت».[٥٤٢] به پێی تیڕوانینی تیۆری گفتوگۆ، کۆمەلّگا له سەر بنەمایـەکی ناناوەندی (لامرکزی) دامەزراوە و پەرە به پانتایی گشتی سیاسی دەدات و بەپشت بەستن بـە دیالۆگ، را و ئیرادە دروست دەکات که له سیاقی "نێوانخـودی"دا راڤـە دەکرێـت. دەسـەلاٌت بەرهەمی کارلێکی نێوان ئەو ئیرادانەیە که دەولّەتی ماف و پانتایی گشتی بارگاوی کـراو بـە کلتور،"بەدەزگایی کردووە". ئەو پانتاییانەی که به نۆرەی خۆیان بنچـینەیان هەیـە لـە نێـو کۆلّگەکانی کۆمەلّگای مەدەنی که مسافەیەك جیایی دەکاتەوە لـە دەولّـەت و ئـابووری.[٥٤٣] «جیاوازی سەرەکی ئەم جۆرە دیموکراسیە لەگەلّ مۆدێلەکانی تر ئەوەیە که لـە پانتـایی گشـتی دا لەسەر بنەمای عەقلاٌنیەتی پەیوەندیکاری و گفتوگـۆی ئـازاد دادەمـەزرێ کـە لـە هـەموو جـۆرە شێواندنێکی عەقلاٌنیەتی ئامرازی و مەعریفەی تەکنیکی رزگار کـراوە».[٥٤٤] بێگومـان روانگـەی نۆرماتیڤ بۆ سیاسـەتی راوێژگـەری سـەبارەت بـە جڤـاکی یاسـایی مـۆدێلێکی بـۆ پێگەیانـدنی

---

٥٤٠. هەمان سەرچاوە، ل ٢٢٥.

٥٤١. ابوالنور حمدی ابوالنور حسن، سەرچاوەی پێشوو، **ل ١٩٦.**

٥٤٢. یورغن هابرماس ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٢٦.

٥٤٣. هەمان سەرچاوە ، ل ٢٢٦.

٥٤٤. جلال حاجی زادە، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣اله٦.

کۆمەڵایەتی دەوێت کە لەسەر بنەمای گفتوگۆ دامەزرابێت، بەڵام ئەم مۆدێلە بە جۆرێك بەرفراوان نابێت کە هەموو کۆمەڵگا بگرێتەوە کە سیستەمی سیاسی گرتۆتە خۆی وەك سیستەمێکی رێکخەر کە لەسەر بنەمای دەوڵەتی ماف و یاسا دامەزراوە. تێڕوانینی دیموکراتیانەی تیۆری گفتوگۆ جەخت لەسەر ئەو بیرۆکەیە دەکاتەوە کە سیستەمی سیاسی نە لە لوتکەی کۆمەڵگا دایە و نە لە ناوەندی کۆمەڵگا، بەڵکو لەناو سیستەمە چالاکەکانی تری کۆمەڵگا دا تەنیا سیستەمێکە بۆ کردەوە.[٥٤٥] لێرەدا هەست بە گەشبینییەکی زۆری هابرماس دەکرێت سەبارەت بە وەکیەکی سیستەمەکان لە حالێك دا ئەگەر سیستەمی سیاسی و ئابووری لە ناوەندیش بن ئەوا بێگومان بەهێزترینن. بەم جۆرە بۆمان دەردەکەوێ کە دیموکراسی راوێژگەری سنووری مۆدێلی لیبرالی دەبەزێنێ، ئەو مۆدێلەی کە تەنیا بە خستنەڕووی هەندێ رێوشوێن بۆ گرانتی کردنی سازشی دادپەروەرانەی بەرژەوەندییە دیاریکراوەکان دەوەستێتەوە. لەگەڵ ئەمە دا دیموکراسی راوێژگەری پیاچوونەوە بە مۆدێلی کۆماریش دەکات.[٥٤٦] رێکاری دیموکراتی راوێژگەری پەیوەندییەکی ناوەکی لە نێوان دانوسان و گفتوگۆ لەمەڕ دادپەروەری دروست دەکات کە هەر ئەم رێکارە دیموکراتیانە رێگە دەدات بۆ گریمانە کردنی ئەوە کە لە هەلومەرجێکی ئاوا دا دەتوانین دەرئەنجامی مەعقول و دادپەروەرانە بۆ هەمووان بە دەست بێنین کە جیاوازە لە روانگە بۆ چاکە و خراپە.

> **سیاسەتی راوێژگەری چ بە پێی رێکاری سیستەماتیکی دروست کردنی راو ئیرادەی بەدەزگایی کراو بێت یان تەنیا بە شێوەیەکی ناسیستەماتیك لە رێگەی تۆڕکانی پانتایی گشتیی سیاسی هاتبێتە ئاراوە، ئەوا سیاسەتێکە پەیوەستە بە سیاقاتی جیهانی ژینی *world-life* گونجاو و بەعەقلانی کراو.**[٥٤٧]

شێوازی پەیوەندیکاری کە لە رێگای راوێژی پەیوەست بە پانتایی چالاکی هاووڵاتیان، واتە ئەو کلتورە سیاسیەی کە لەسەر بنەمای ئازادی و پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی دامەزراوە، لە رووی سیاسیەوە ئازادە بەتایبەتی ئەو کۆڕ و کۆمەڵانەی کە رای گشتی دروست دەکەن و بەشێکی زۆری سەرچاوەکانیان پشت بە ئیرادەی سەربەخۆی تاکەکان دەبەستێت و رێگە بە

٥٤٥. یورغن هابرماس ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٢٦..
546. Jürgen Habermas, Between Facts and Norms.op. Cit., p 299.
٥٤٧. یورغن هابرماس، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٢٦.

دەسوەردانی ناوەندە سیاسیە رەسمیەکان نادەن یان هەوڵ دەدەن بیگەیەننە کەمترین رادە. هەر سی مۆدێلەکە لەسەر بنەمای تیۆری رەخنەیی لەمەڕ کۆمەڵگا دامەزراوە و بەم جۆرە هابرماس جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە کۆمەڵگا تەنیا کۆیەکی بەرهەم هێنان نیە کە هەڵدەستێ بە تێر کردنی پێداویستیەکان (وەك تێڕوانینی مارکس) بەڵکو کۆمەڵگا لەسەر بنەمای پاراستنی بەهای کلتوری و ئەخلاقی دادەمەزری هەر بەو جۆرەی کە پارێزگاری لە بەرهەم هێنان دەکات.[548] بە جۆرێکی تر جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە کۆمەڵگا تەنیا لەسەر بناغەی کار دانامەزرێ بەڵکو لەسەر بنەمای بەشداری و کارلێکیش دروست دەبێت کە پەیوەندی نێوان من و ئەویتر دیاری دەکات و ئەمەش لەمیانی رەوشی پەیوەندیکاری دەبێت کە تێیدا زەمینەی قسە و کردەوە کراوەیە. کەواتە بۆمان دەردەکەوێ کە لە روانگەی تیۆری راوێژگەریەوە کە پشت بە رێکارە دیموکراتیەکان دەبەستێ لە چوارچێوەی سیستەمێکی سیاسی پەیوندیکاری دا بۆ دیاری کردنی چارەنووس و دروست بوونی را و ئیرادە پشت بە دیالۆك و گفتوگۆی بەردەوام لە نێوان خودەکان دەبەسترێ و لێرەدا تەنیا باشترین ئەرگۆمێنت سەنگی مەحەکە بۆ ئەوەی دروستی بانگەشەکە دیاری بکات. لەم مۆدێلە دا ئازادی پۆزەتیڤە و لەگەڵ دادپەروەری و یەکسانی دا پەیوەندییەکی تەواوکاری لە نێوانیان دایە و کۆمەڵگای مەدەنی و پانتایی گشتی رۆڵی گرنگی تێدا دەگێرن. پەیوەندی نێوان مافی هاووڵاتی بوون و ئازادی پشت بەوپێش گریمانەیە دەبەستێ کە هاووڵاتیە ئازاد و یەکسانەکان راوێژ لەگەڵ یەکتر دەکەن بۆ ئەوەی ژیانی هاوبەشی خۆیان نەك هەر بەهۆی یاسای دانراو بەڵکو بەشێوەیەکی مشروعیش رێك بخەن.

لێرەوە پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە دیموکراسی راوێژگەری لە فۆرمە رێکارییەکەی دا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە لیبراڵ دیموکراسی بەهەر دوو ئاراستەی کۆماری و لیبرالیەوە ناتوانێ پارێزگاری لە ماهییەتی دیموکراسی بکات و پێویستی بە ریفۆرمە و ئەمەش مەرجی کۆتایی خۆی لە کردەی پەیوەندیکار دا دەبینێتەوە کە دان بە ئۆتۆنۆمی تاکەکان دەنێت لە پرۆسسی دروست بوونی را و ئیرادە و بڕیار دان لەسەر چارەنووس. هەربۆیە دیموکراسی رادیکاڵ لەمپەرێکی دیموکراتیانە لە بەردەم دەستدرێژی ئیستعماریانەی سیستەم بۆسەرجیهانی ژین دروستدەکات. لای هابرماس دیموکراسی دەشێت بەدەزگاییی کردنی عەقلانی را و ئیرادەی لێ

٥٤٨. مالفی عبدالقادر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٤٥.

بکەوێتەوە بەهۆی سیستەمێك لە یاسا کە گرانتی بەشداری یەکسان بۆ هەمووان دابین دەکات و دەبێ بەرەنجامی بەکارهێنانی گشتی عەقڵ بێت و دواجار دەوڵەتی ماف ویاسایی دیموکراتی لێ بێتە بەرهەم. کەواتە کۆمەڵگا لە دووتوێی دیموکراسی رێکاریی دا دەبێتە جڤاکێکی یاسایی خۆ-رێکخەر و لەم نێوەدا رێکارە یاساییەکان تەنیا کاتێ مەشروعن کە دەربڕی بەرژەوەندی گشتی بن و شەرعیەتی خۆیان لە ئیرادەی هەمووان و لە مشتومڕیکی کراوە بە دەست هێنابێت.

بەم جۆرە دەتوانین بڵێین لە دیموکراسی راوێژگەری دا سیستەمێکی سەقامگیری پڕ لە زانیاری بە پێش مەرج وەردەگیرێت و لەم نێوەدا پشت بە هەندێ سەرچاوەی گرنگی فەلسەفی دەبەستێ وەك گرێبەستی کۆمەڵایەتی و تیۆری رەخنەیی و هزری پۆست لیبراڵ و هەوڵ دەدات ئاستی پەیوەندی تاك و دەسەڵات خاڵی بێت لە هەموو جۆرە زۆرەملێ و هەژموونێك و رەوشێکی مەعقول بۆ دادپەروەری بخولقێنێت کە نایەکسانی تائەو رادیە قبوڵ بکرێ کە زیان بە بەرژەوەندی گشتی نەگەیەنێت و ناوەند و پێگەی کۆمەڵایەتی نەبێتە پێش مەرج، بەڵکو بەهرە و توانا پێوەری ئەفزەلیەت بێت و ئەمەش لە کۆمەڵگایەکی باش-رێکخراوی هاووڵاتیان دا بەدی دێت.

# باسی چوارەم

## شەرعیەتی دیموکراتی و مەنزومەی پۆست نەتەوە یی

لە روانگەی هابرماس دەوڵەتی سـەرمایەداری وەك پێشـكەوتووترین جـۆری سیسـتەمی لیبرالی دیموكراتی لە نێوان دوو ئاراستەی دژبەر دا توشی قەیران دەبێت. لـە لایەكـەوە دەبـیَ هەوڵی بەرفراوانكردنی توانستی بەرنامە و پلانە رێنمایكەرەكانی دەوڵەت بـدات بەمەبەسـتی ئاراستەكردنی بازاڕ و ئابووری و لە لایەكی تریشەوە وەك یەكێك لە پرەنسـیپەكانی لیبرالیـزم دەبیَ سنووری ئازادی تـاك و بـازار نەبـەزێنیَ، چـونكە لـە بنـەمادا لەسـەر تاكگـەرایی و كۆمەڵگای مـەدەنی دامـەزراوە و وەك سیسـتمەمێكی دژی پلانرێـژی ناوەنـدی لـە پانتـایی تایبەتی دا خۆی پێناسە دەكات، «هەربۆیە دەوڵەت لە نێوان دەسوەردان و نكۆڵی ناچارەكی لە دەسوەردان تووشی قەیران دەبێت».[٥٤٩] لە سەردەمی پۆست نەتەوەیی و لاواز بوونی دەوڵـەتی مۆدێرن و گۆڕانی فۆرمەكانی دەسوەردان گرفتێكی تر بۆ شەرعیەتی دیموكراتی دێتەپێش كـە پەیوەستە بە كاریگەری بڕیار و سیاسەتەكان لە دەرەوەی سنووری دەوڵەت.

### تەوەری دووەم: قەیران لە دەوڵەتی رێكخراو *State-regulated* دا

#### ١. پارادۆكسی سەرمایەداری پێشكەوتوو:

هابرماس ئاماژە بەوە دەكات كـە هـەر لـە چـارەگی كۆتـایی سـەدەی نـۆزدە لـە ولاّتـە سەرمایەداریە پێشكەوتووەكان دوو ئاراستە پـەرەیان سـەند: ***یەكـەم،*** گەشەسـەندنی چـالاكی دەسوەردنگەرایانەی دەوڵەت كە دابین كردنی سەقامگیری سیستەمی لەسەر شان بـوو. ***دووەم،***

---

٥٤٩. یورگن هابرماس ، بحران مشروعیت — تئوری دولت سرمایەداری مدرن، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٤٩.

پەیوەندی دوولایەنەی نێوان توێژینەوە و تەکنەلۆژیا کە وای لە زانستەکان کرد ببێتە هێزی یەکەمی بەرهەم هێنان.[550] بەم جۆرە دەوڵەت بۆ پێش گرتن لە هەندێ قەیرانی بەهێزی ئابووری ناچارە دەسوەربداتە ئەم بوارە و لە لایەکی تریشەوە پشت بە تەکنەلۆژیای پێشکەوتوو ببەستێ وەك هێزی بەرهەمهێنەر و لێرە دا هێزی کاری مرۆیی پاشەکشێ دەکات و ئەمەش هاوکات بوو لەگەڵ سەرهەڵدانی زاراوەی "سەرمایەداری پێشکەوتوو یان دەوڵەتی ڕێکخراو *State-regulated*" کە ئاماژەیە بۆ دوو دیاردە:

« *یەکەمیان*، بۆ پرسی چەقبەستنی ئابووری *Economic concentration* – سەرهەڵدانی کۆمپانیای نەتەوەیی و پاش ئەویش فرە ڕەگەز- و ڕێکخستنی بازاڕی کالاّ، سەرمایە و هێزی کار، *دووەمیان*، هێمایە بۆ دەسوەردانی دەوڵەت لە بازاڕ دا».[551]

لە بنەڕەتیش دا جیاوازی سیستەمی سەرمایەداری ڕێکخراو لە سەرمایەداری لیبرال دەرکەوتنی دامەزراوەی مۆنۆپۆلی گەورە و بەرەو نەمان چوونی ڕکەبەرایەتی بوو.[552] بەم جۆرە دەوڵەتی ڕێکخراو دەچێتە ناو کۆی ژیانی ئابووری و سیاسی و کۆمەلاّتی و ئەمەش دژی پرەنسیپە سەرەکیەکانی خۆیەتی کە شەرعیەتی لێوەرگرتووە. دەوڵەت لەڕێگای پشتیوانی کردن لە مۆنۆپۆلی مەزنی ئابووری لایەنگری چینێك دەکات و سنووری بڕیارە گشتیەکان بەرتەسك دەکاتەوە و لە بێلایەنی لادەدات. و« ئیدی ژیانی گشتی وەك بوارێك بۆ گفتوگۆ و هەڵبژاردن سەیری ناکرێت، بەڵکو وەك کێشەی تەکنیکی لێی دەڕوانرێت کە لە ڕێگای عەقلاّنییەتی ئامرازییەوە بە هۆی پسپۆریەکانییەوە چارەسەر دەکرێت».[553] بەم جۆرە بەردەوام زۆرینەی هاوولاّتیان لە بەشداری لەبڕیار و دیاریکردنی چارەنووسی خۆیان دورە پەرێز دەخرێن و وەفاداری هاوولاّتیان بۆ دەسەلاّتی سیاسی و شەرعیەتی دیموکراتی سیستەم لاواز و بەرەو قەیران دەچێت. بەڕای ماکس ڤیبەر بە دوو ڕێگەی سەرەکی دەشێت شەرعیەتی سیستەمێك دابین بکرێت:[554]

---

٥٥٠. یورغن هابرماس، العلم والتقنية كأيدولوجيا، ت: د. الياس حاجوح، سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٨.

٥٥١. یورگن هابرماس، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٠.

٥٥٢. حسینعلی نوزری، بازخوانی هابرماس، سەرچاوەی پێشوو، ل٥٥٣.

٥٥٣. ایان کریب، سەرچاوەی پێشوو، ل٣١٤.

٥٥٤. بول ریکور، محاضرات في الأيدولوجيا و اليوتوپيا، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٦٩.

I. دەکرێ دابین کردنەکە خودیی بێگەرد بێت، لە میانی ئەوەی کە

١.هەستەکی بێت، کە بەرەنجامی تەسلیم بوونی سۆزداری بێت یان

٢.عەقلانی بەهایی بێت، کە بڕوا بوون بە مسداقیەتی ڕەها بۆ سیستەم دابینی دەکات بەو پێیەی گوزارشتە لەو پەڕی بەهاکانی شێوازی ئەخلاقی، ئیستاتیسکی یان هەر جۆرێکی تر، یان

٣. دینی بێت، بڕوا بەرزگاربوون دابینی دەکات کە پشت بە وزەی سیستەم دەبەستێ .

II. بەڵام دەتوانرێت شەرعیەت بۆ سیستەمێك دابین بکەین لە میانی حالەتی سوودمەندبوون.

بەم جۆرە پەیوەندی لە نێوان دەسەڵات و شەرعیەت لە سێ فۆرم دا دیاری دەکات :[555]

١.دەسەڵاتی کاریزمی *Charismatic Authority* کە شەرعیەتی خۆی لە وەفاداری (ولاء) بۆ پیرۆزی یان پاڵەوانێتی وەردەگرێ.

٢. دەسەڵاتی نەریتی *Traditional Authority* کە شەرعیەتی خۆی لە ئیمانێکی قوڵ بە پیرۆزی نەریتە کۆنەکان وەردەگرێت.

٣.دەسەڵاتی یاسایی *Legal Authority* کە شەرعیەتی خۆی لە ڕێکارە یاساییەکان وەردەگرێت.

جۆری سێیەم سەرەتای گەڵاڵەبوونی شەرعیەتی دیموکراتیە لە دەوڵەتی مۆدێرن دا کە یەکێك لە سیما سەرەکیەکانی بیرۆکراسیەت و ڕێکخستنی ژیانی گشتیە کە پشت بە یاسا مەدەنیەکان دەبەستێت.

### أ. دەرکەوتەکانی قەیران:

هابرماس ئاماژە بە ئەگەرەکانی قەیران دەکات کە تایبەتە بە سیستەمی لیبرالی دیموکراتی و لە قۆناغی جیاواز دا سەرهەڵدەدەن و فۆرمەکانیان تا ئەو کاتە ی تەقینەوەی

---

٥٥٥. یاسر قنصوە ،الشرعیة الدیمقراطیة في العالم الحدیث (مرجعیات واعدة.. تطبیقات مراوغة)، ل ٢ لە

١٣. لەم سایتەی خوارەوە لەرێکەوتی ٢٠١٠/٩/١١ وەرگیراوە:

http://www.altasamoh.net/Article.asp?Id=538

-Max Weber, The Theory of Social and Economic Organization, Trans. by A. M. Henderson and T. Parsons, Oxford Univ. Press،, 1947, p. 328.

سیاسی روودەدات — واتە ئەو خاڵەی کە سیستەمی سیاسی شەرعیەتی خۆی لە دەست دەدات — جیاوازە و دەڵێت لەوانەیە لە کاتێك دا قەیران رووبدات کە هەر کام لەم ژێر سیستەمانە sub-systems ( واتە ئابووری ، سیاسی -کارگێڕی و کۆمەڵایەتی-کلتوری) نەتوانن "چەندایەتی پێویست" (الكمية الازمة) بەرهەم بێنن کە پشکی ئەوانە لە هەموو [سیستەمەکە] دا.[٥٥٦] واتە هەر کاتێ یەکێك لەم ژێرسیستەمانە نەتوانێ ئەرك و چالاکیەکانی خۆی ئەنجام بدات و خواستەکانی سیستەم بە گشتی دابین بکات و بەردەوام بوون و مانەوەی سیستەم بخاتە ژێر مەترسیەوە، ئەوا هێمایە بۆ بوونی قەیران. هەر بۆیە دەتوانین بڵێین « قەیران بۆ وەسف کردنی کۆمەڵگایەك بەکار دێت کە لەگەڵ پرسی "سنووورداری مانەوە *Survival limits*"دا رووبەڕووە».[٥٥٧] بەرای هابرماس کاتێ یەکانگیری کۆمەڵایەتی دەکەوێتە بەر مەترسیەوە دەتوانین باسی قەیران بکەین، واتە کاتێ ئەندامانی کۆمەڵگا گۆڕانە بونیادییەکان وەك شتێکی قەیراناوی بۆ بەردەوام بوونی ژیانی خۆیان ئەزموون بکەن و هەست بەوە بکەن کە شوناسە کۆمەڵاتیەکەیان کەوتۆتە بەر هەڕەشە.[٥٥٨] بەڕای هابرماس بارودۆخی سیستەم بەجۆرێکە کە هەموو هەوڵێك بۆ کۆنترۆڵ کردنی قەیران لە ژێر سیستەمێك، دەبێتە هۆی گۆڕانی فۆرم و جێگۆڕکێی دژایەتیە ناوەکیەکان بەرەو ژێر سیستەمێکی تر. وەك بەخشینی بوجەی دەوڵەت بۆ پارێزگاری کردن لە سەرمایەی تایبەتی لە کاتی قەیرانی ئابووری دا و لە بەرانبەریش دا کەم بوونەوەی خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی و ئەمەش "کورتهێنانی(عجز) شەرعیەت *legitimation deficit*" زیاد دەکات.[٥٥٩] ئەم حاڵەتە لە کاتی سەرهەڵدانی قەیرانی دارایی جیهانی٢٠٠٨ لە ویلایەتە یەکگرتووەکان بەرچاو کەوت کە دەوڵەت لە لایەکەوە لە رێگای پێدانی یارمەتی ماددی پشتی کۆمپانیا گەورەکانی گرت و لە لایەکی ترەوە بە هەزاران هاوولاتی کەوتنە سەر شەقام.

**ب. رەهەندەکانی شەرعیەت:**

---

٥٥٦. مایکل پیوزی ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٢٧.

٥٥٧. حسینعلی نوذری،سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٠٣.

٥٥٨. پیتر میلر، سوژە ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٠٦.

٥٥٩. مایکل پیوزی، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٧.

بەبڕوای هابرماس لەناوچوونی لەسەرەخۆی پانتایی گشتی وەك بواری گفتوگۆی ڕەخنەیی-عەقلانی و بەشداری سیاسی چالاك، کاریگەرییەکی بەرچاوی لەسەر شەرعیەتی سیستەمی سەرمایەداری داناوە. هەرچۆنێ بێت سەرمایەداری پێویستی بە بەدەست هێنانی شەرعیەت و ڕەزامەندی زۆرینەی هاوولاتیانە بۆ ئەوەی لانیکەم بتوانێت تاڕادەیەك پاساو بۆ مانەوە و ڕەوایەتی خۆی بێنێتەوە. بەرای (ڤیبەر) دەسەلاتی عەقلانی کاتێ شەرعییە کە لانیکەم ئەم دوو مەرجەی هەبێت: أ) سیستەمە نۆرماتیڤیەکەی بەشێوەیەکی ئەزموونی داڕێژرابێت. ب) مەرجەعە یاساییە پەیوەندیدارەکان دان بە یاسایی بوونی[٥٦٠] دا بنێن. بە واتایەکی تر، هەندێ ڕێکاری شکلی ڕاست بۆ داڕشتن و بەکارهێنانی یاساکان بوونیان هەبێت. [٥٦١] واتە دەسەلاتی عەقلانی لە رووی چاوگی شەرعیەتەوە بەوە لە دەسەلاتی کاریزمی و نەریتی جیا دەکرێتەوە کە پشت بە پرەنسیپی یاسامەندی دەبەستێ و تەنانەت نۆرمە کار پێکراوەکانیش بەشێوەیەکی عەقلانی دیاری دەکرێن. کەواتە شەرعیەت بە مانای بەڵگە و ئەرگۆمێنتی گونجاو رازیکەرە بۆ سەلماندنی بانگەشەی راست و بەرهەق بوونی سیستەمێکی سیاسییە لە روانگەی هاوولاتیانەوە، بە واتایەکی تر هەرکاتێ سیستەم بتوانێ بیسەلمێنێ توانای ئەوەی هەیەکە جیاکاری و هەلاواردن ناکات لە بەرێوەبردن و رێکخستنی کۆی کۆمەڵگا، دەبێتە سیستەمێکی خاوەن شەرعیەت. هەربۆیە «شەرعیەت دەلالەت لە خواستی سیستەمی سیاسی دەکات بۆ دانپیانان پێی وەك سیستەمێکی راست و دادپەروەر، کەواتە شەرعیەت لای هابرماس واتە بەهای دانپینان بە سیستەمێکی سیاسی».[٥٦٢] تەشەنەسەندنی سیستەمی کارگێڕی بەناو پانتایی تایبەتی دا و دەسوەردانی دەوڵەت، پەیوەستە بە پرسی بەرنامەڕێژی خۆشگوزەرانی کۆمەلایەتی و کۆنترۆڵ و دەبێتە هۆی کاریگەری سیاسەت لەسەر ژیانی خەڵکی

---

٥٦٠. جیاوازی هەیە لە نێوان شەرعیەت Legitimacy و مەشروعیەت یان یاسامەندی legality، (لەبنەڕەت دا واتە گونجانی رەفتار یان رەوشێکی دیاریکراو لەگەڵ یاسا دا) دەشێت کردەیەك یاسایی بێت بێ ئەوەی شەرعی بێت وەك دەقی یاسایی (نا ئەخلاقی)، هەروەها دەکرێت رەفتارێك شەرعی بێت بێ ئەوەی یاسایی بێت وەك شۆڕش دژی سیستەمی ستەمکار کە دیارە لە یاسا دا دیاری نەکراوە. د. شیرزاد النجار ، سەرچاوەی پێشوو،ل ١٠٠ و یاسر قنصوە، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢لە ١٣.

٥٦١. یورگن هابرماس ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٢٠٨.

٥٦٢. د.شیرزاد النجار، سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٤.

ئاسایی و ئەمەش خواستی هاوولاّتی بۆ بەشداری لە بڕیار دێنێتە ئاراوە، هەروەك ئاماژەی بۆ کرا ئەمەش پێچەوانەی دەوڵەتی رێکخراوە کە پشتی چینێك دەگرێت و لە دارِشتنی بڕیار پشت بە تەکنۆکرات و شارەزاکان دەبەستیّ و لە ناهاوسەنگی وەفاداری زۆرینە و بەرژەوەندی چینێك قەیرانی شەرعیەت سەرهەڵدەدات.

**کەواتە کاتیّ قەیران روودەدات کە بونیادی سیستەمی کۆمەلاّیەتی ئیمکاناتی کەمتر لە رادەی پێویست دەستەبەر دەکات بۆ درێژەدان بە مانەوەی سیستەم ، لێرە دا وەك پشێوی بەردەوام*persistent disturbances* لە رەوتی یەکانگیری سیستەم *system integration* باسی قەیران دەکرێت.** [٥٦٣]

بەرِای هابرماس تەنیا کاتیّ یەکانگیری سیستەم هەرِەشە لە مانەوەی سیستەم دەکات کە پرسی یەکانگیری کۆمەلاّیەتی لە ئارادابێت.[٥٦٤] واتە نابێت یەکانگیری کۆمەلاّیەتی بکرێتە قوربانی یەکانگیری سیستەم. لێرە دا دەردەکەوێت «شەرعیەت سەقامگیری سیستەمی سیاسی و جیهازی دەسەلاّتی لە ئەستۆیە».[٥٦٥] لەو کۆمەڵگایانە دا کە گەیشتوونەتە پلەیەك لە جیابوونەوەی بونیادی *differentiated societies* سیستەمی سیاسی (وەك ناوەندی جیای کۆنترۆڵ) بە بەراورد لەگەڵ سیستەمی کۆمەلاّیەتی- کلتوری و سیستەمی ئابووری، دەکەوێتە شوێنگەیەکی بەرزترەوە.[٥٦٦] ئەمەش یەکێکە لە جیاوازییەکانی هابرماس لەگەڵ (مارکس) چونکە لە فەلسەفەی مارکسیزم دا ژێرخانی ئابووری سەرخانی سیاسی و کلتوری و کۆمەلاّیەتی دیاری دەکات، بەلاّم لەگەڵ دەرکەوتنی لاوازی ئەرکی بازارِ کە لە میکانیزمەکانی رێنماییەوە سەرچاوە دەگرن، ئایدۆلۆژیای ئالّوویّری دادپەروەرانەی بۆرژوازی هەرەس دێنێت. بەرِای هابرماس ئەو بازارِەی ناتوانین وەك فەرمانگە حکومییەکان دیموکراتیزەی بکەین بە شێوەیەکی بەرچاو ئەرکی رێنمایی بوارەکانی ژیان بەدەستەوە دەگرن کە تا ئیستا نۆرماتیڤ بوونە، واتە لە رێگای فۆرمی سیاسی یان

٥٦٣. یورگن هابرماس ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥١.

٥٦٤. هەمان سەرچاوە، ل ٥٣.

٥٦٥. د.شیرزاد النجار، سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٣.

٥٦٦. یورگن هابرماس ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٥٦.

پێش سیاسی ئاڵۆزی پەیوەندییان بەیەکەوە هەبووە.[٥٦٧] بەم جۆرە کاریگەری سیاسەت لە سەر ئابووری و بەرەنجامەکانی ئازادی بازاڕ ، کاریگەری نەرێنی لەسەر دیموکراتیزە بوونی ژیانی کۆمەڵایەتی دادەنێت.

هەوڵدان بۆ گونجاندنەوەی سیستەمی ئابووری لەگەڵ سیاسەت (کە بە جۆرێك لە جۆرەکان دەبێتەهۆی سەرلەنوێ بە سیاسی بوونەوەی *repoliticizing* پەیوەندییەکانی بەرهەم هێنان) بەیارمەتی دیموکراسی شکلی کێشەی نەبوونی شەرعیەت چارەسەر دەکرێت.[٥٦٨]

بەم جۆرە ئەگەری چوار جۆر قەیران لە ئارادایە کە سەرچاوەیان جیاوازە. سیستەمی ئابووری قەیرانی ئابووری بەرهەم دێنێ، بەلاّم سیستەمی سیاسی قەیرانی عەقلانیەت و شەرعیەتی لێدەکەوێتەوە، ئەوە لە کاتێك دایە کە سیستەمی کلتوری-کۆمەلاّیەتی قەیرانی پاڵنەری لەگەڵ خۆیدا دێنێت کە هاوکات قەیرانی شوناسیشە.

## ٢. پۆلێن کردنی جۆرەکانی قەیران:

بەرای هابرماس لە کۆمەڵگا پێشکەوتووە سەرمایەدارییەکان دا ئەگەری تووش بوون بە کێشەی شەرعیەت لە ئارا دایە، چونکە گەشەی ئابووری لەسەر بنەمای ئامانجە تایبەتیەکانی زیادکردنی سوود کار دەکات نەك بەرژەوەندی گشتی ئەوە لە کاتێك دایە کە سیستەمی سیاسی بەردەوام پێویستی بە بۆچوو *Inputs* ی وەفاداری هاوولاّتیان هەیە، بەلاّم لە خزمەت چینێکی دیاریکراو دایە، واتە« لە روانگەی سامانی تایبەتی لە بەرانبەر هەژارای گشتی دا »[٥٦٩] دامەزراوە.

| سەرچاوەی قەیران | قەیرانی سیستەم | قەیرانی شوناس |
|---|---|---|

٥٦٧. یورگن هابرماس، پایەهای پیشا سیاسی دولت قانونی دمکراتیك، ت:منوچهر صالحی، لەم سایتە لەرێکەوتی ٢٠١٠/٩/١٥ وەرگیراوە:
- http://www.manouchehr-salehi.de/My%20archiv/My%20Translationsarticle/Habermas-1.htm

٥٦٨. یورگن هابرماس ، بحران مشروعیت ، سەرچاوەی پێشوو ل ١٠٤.

٥٦٩. هەمان سەرچاوە ، ل ١٦٦.

| سیستەمی ئابووری | قەیرانی ئابووری | -------- |
| --- | --- | --- |
| سیستەمی سیاسی | قەیرانی عەقلانّیەت | قەیرانی شەرعیەت |
| سیستەمی کۆمەلاّیەتی – کلتوری | --------- | قەیرانی پالّنەر |

سەرچاوە: یورگن هابرماس ، سەرچاوەی پێشوو ل ١٢٠.

**أ. قەیرانی ئابووری:** هابرماس وەك بنچینەی سەرەکی رێکخستنی سەرمایەداری لیبرالی و پێشکەوتوو سەیری پەیوەندی نێوان کاری کرێگرتە و سەرمایە دەکات. کۆمەلّگا لە جیاتی ئەوەی بە شێوەیەکی عەقلانّی لەگەلّ بەرژەوەندی گشتی یان جەماعی دا هەمامەنگ بێت، بە چەشنێکی ناعەقلانّی لەگەلّ کەلّەکەبوونی سەرمایە و لەئاکام دا لەگەلّ بەرژەوەندی تایبەتی ژمارەیەکی کەم دا هەماهەنگە.[٥٧٠] پێدەچێت ئەمەش جیاوازییەکی تری هابرماس و مارکس بێت کە دژایەتی ناوەکی، سەرمایەداری ناڕووخێنێ بەلّکو تووشی قەیرانی دەکات و لە ژێرسیستەمێکەوە بۆ یەکی تر دەچێت. کەواتە دەولّەت هەولّ دەدات ئابووری و بازاڕ ئاراستە بکات، ئەوە لەکاتێك دایە کە سیستەمی سەرمایەداری لەسەر ئازادی و دەسوەرنەدان لە بازاڕ دامەزراوە. لە لایەکی تریشەوە دەبێ وەفاداری جەماوەریش بەدەست بێنێ. چونکە پێویستی بە شەرعیەتی دیموکراتی هەیە، قەیرانی ئابووری لە نێو سیستەمی ئابووری دا سەرهەلّدەدات و کێشمەکێشی سیاسی لێ دەکەوێتەوە.

**ب. قەیرانی عەقلانّیەت:** لە لایەکەوە سیستەمی سەرمایەداری لەسەر خاوەنداریێتی تایبەتی دامەزراوە و لە لایەکی ترەوە پێویستی بە بەشداری هاوولاّتیان هەیە بۆ بەخشینی شەرعیەت کە لە رێگای بەشداری دەزگای وەك حزب و رێکخراوەکان ئەم شەرعیەتە دروست دەکەن. « ئەمەش هاوولاّتی پاسیڤ دێنێتەئاراوە کە تەنیا مافی هوتاف دانی هەیە».[٥٧١] هابرماس لە توێژینەوە هاوبەشەکانی لەگەلّ (کلاوس ئوفە) پێیوایە « "قەیرانی عەقلانّیەت"و"کورتهێنانی عەقلانیەت"دەربڕی سنووردارییە لە بەرهەم هێنانی ئیدارییانەی

---

٥٧٠. مایکل پیوزی ، سەرچاوەی پێشوو، ، ل ١٢٤.

٥٧١. یورگن هابرماس ، سەرچاوەی پێشوو ،ل ١٠٥.

بڕیاری عەقلانی و نیشانەی شکستی عەقلانیەتی فەرمییە وەك ئامرازی ڕێکخستنی کۆمەلآیەتی».[٥٧٢]

زیاد بوونی دەسوەردانی دەولّەت دەبێتە هۆی سەرهەلّدانی قەیرانی عەقلانیەت و بەهۆی قەرزاربوونی بەردەوام دەولّەت دێتە ئاراوە لە پێناو جێبەجێ کردنی ئەکەکانی دا کە دەبێتە هۆی دروستبوونی هەلآوسان و قەیرانی دارایی کەلّەکە بوو دواجار کێشەکان خۆیان لە بێ توانایی دەولّەت لە گونجاندنی بەرژەوەندی جیاواز و دژبەرەکانی سەرمایەداری تایبەتدا دەمێنێتەوە.[٥٧٣] کەواتە سەرچاوەی شەرعیەت لە سیستەمی سیاسی دا بۆچووی وەفاداری تاك و پابەندییە یاسایی و سیاسیەکانیەتی، بەلآم سیستەم لە دەرچوو دا رەچاوی بەرژەوەندی تایبەتی دەکات.

**ج. قەیرانی شەرعیەت:** ئەگەر دەولّەت نەتوانێت ڕێگای شیاو بدۆزێەوە بۆ گونجاندنی بەرژەوەندییە دژبەرەکانی ئەو هاولآتیانەی کە حوکمیان دەکات ، ئەوا لەم حالّەتەدا لە چاویاندا شەرعیەتی خۆی لەدەست دەدات.[٥٧٤] کەواتە « قەیرانی شەرعیەت لەدەولّەتی بۆررژوازی دا بۆیە سەرهەلّدەدات چونکە کۆمەلّگای بۆرژوازی مۆدێرن بنەما چینایەتیەکان کۆتایی پێ ناهێنێت، بەلّکو بە شێوەیەکی جەوهەری گوزارشت لە بنەمای چینایەتی کۆمەلآیەتی و ئابووری دەکات».[٥٧٥] هابرماس پێیوایە پێویستی شەرعیەت لە پانتاییەکی گشتی دا کە لە رووی بونیادییەوە لە سیاسەت خراوە *depoliticized* دوو ئەرك دێنێتە ئاراوە: ***یەکەم،*** تایبەتگەرایی مەدەنی *Civil privatism* واتە خۆبواردنی سیاسی *Political abstinence* ئەمەش وادەکات تاك لە ناو سیستەم دا بە دوای پاداشی وەك کاتی فەراغەت و ئیش و پارەدا بگەڕێت. ***دووەم،*** لەسیاسەت خستنی بونیادیی، خۆی پێویستی بە پاساو هەیە و ئەمەش لە تیۆری نوخبەگەرایی دیموکراتی یان سیستەمی تەکنۆکراتی دا دەستەبەر دەبێت.[٥٧٦] واتە هەمیشە هەولّ دەدرێت پانتایی گشتی لە رەهەندی

٥٧٢. مایکل پیوزی ، سەرچاوەی پێشوو، ،ل ١٢٨.

٥٧٣. ایان کریب، سەرچاوەی پێشوو، ل٣١٦.

٥٧٤. هەمان سەرچاوە، هەمان لاپەڕە.

٥٧٥. د.شیرزاد النجار، سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٦.

٥٧٦. یورگن هابرماس ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٠٥-١٠٦.

سیاسی دابماڵرێت  و مەدەنیەت وەك ناسیاسی بوون و خۆدوورخستنەوە لە سیاسەت راڤە دەکرێت و ئەمەش بەشێوەیەکی بونیادی ئەنجام دەدرێت، واتە لە رێگای ئەو تیۆرانەی کە پێیانوایە پێویست ناکات هاوولاٌتی لە دارشتنی بریاری سیاسی دا بەشداری چالاك و راستەوخۆی هەبێت بەلٌکو ئەمە ئەرکی نوخبە و تکنۆکراتەکانە. بەم جۆرە « قەیرنی شەرعیەت لە خالٌێك دا وەك هەرەشە دەردەکەوێت کە سۆلیداریێتی کۆمەلاٌیەتی کە لە رووی ئایدۆلۆژیەوە تۆکمە و مەشروعە، بەلاٌم وەك دەسەلاٌتێکی رووت و ئاشکرا رووی راستەقینەی خۆی دەربخات». [577] هەر وەك ئاماژەی بۆ کرا شەرعیەتی دیموکراتی کە خەسلٌەتی دەولٌەتی مۆدێرنی لیبرالە پەیوەستە بە رەزامەندی هاوولاٌتیان، بەلاٌم هەرکاتێ ناهاوسەنگی بکەوێتە نێوان ئەرکەکانی دەولٌەت و وەفاداری و چیتر تاکەکەکان ئینتمایان بۆ سیستەمی سیاسی نەبێت وەك سیستەمێکی دادپەروەر ئەوا تووشی قەیران دەبێت و لەوێشەوە قەیرانی شوناس سەرهەلٌدەدات، چونکە شوناس لەسەر یەکانگیری کۆمەلاٌیەتی دامەزراوە.   پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە سیستەمێکی بە زەبروزەنگ کە پشت بە هێزی زۆرەملێ و ئامرازەکانی توندوتیژی دەبەستی لە بنەرەت دا نیگەرانی شەرعیەت نییە،« شەرعیەتی ئەم سیستەمە لانیکەم لە روانگەی خۆیەوە ، شتێکی ناوەکی و خۆپاساودەر و خۆسەلمێنەرە». [578] چونکە لە بنەرەت دا لەسەر شەرعیەتی دیموکراتی  واتە رەزامەندی هاوولاٌتیان دانامەزری، بەلٌکو هەندێ جار پشت بە ئایدۆلۆژیا و ئەفسانە دەبەستێ و هەندێ جاری تریش لە رێگای ترس و تیرۆر و گەندەلٌی، ملکەچی و بێدنگی  بۆ سیستەم وەك شەرعیەت لە قەلٌەم دەدات.

**د. قەیرانی پالٌنەری** *Motivation*: زۆرداری دەولٌەت و زیادبوونی کۆنترۆلٌی چینی تەکنۆکرات واتە کۆنترۆلٌی پێویست بۆ ئیدارە کردنی قەیرانەکانی تر، کاریگەری دەبێت لەسەر لاوازی پالٌنەری (الدافعیة) ی خەلٌك بۆ بەشدارییەکی چالاك و بەرهەمدار لە سیستەمدا لە پێناو وەرگرتنی بریار. [579]

چونکە  ئەمانە بە دەزگا دیموکراتییەکانی وەك رێکخراو و سەندیکا و حزبەکان و دواجار پرۆسسی هەلٌبژاردن دەسپێردرێت، بەلاٌم لە راستی دا تاك لەناو قەفەسی ئاسنینی بیرۆکراسی

---

٥٧٧. مایکل پیوزی ، سەرچاوەی پێشوو،  ، ل١٣٠.

٥٧٨. حسینعلی نوزری، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٤٣.

٥٧٩. ایان کریب، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣١٦ — ٣١٧.

به مانا ڤەیبەرییەکەی تووشی خەمساردی و رەشبینی دەبیت لە پرۆسسی سیاسی هەر بۆیە کێرڤی هاندەری لای هاوولاتیان دادەبەزێت.

**قەیرانی پەیوەست بە دەرچوو *Output* کە لە هەردوو سیستەمی ئابووری و سیاسی بوونی هەیە، لە سیستەمی کۆمەلاّیتی- کلتوری دا وەك پشێوی (اختلال) تایبەت بە بۆچوو *Input* دەردەکەوێت و دەبێتە هۆی لە دەست چوونی شەرعیەت، چونکە یەکانگیری کۆمەلاّیەتی کۆمەلّگا پەیوەستە بە دەرچووی *Output* ئەم سیستەمە و بە شێوەیەکی راستەوخۆ پەیوەندی بەو پالّنەرانەوە هەیە کە وەك شەرعیەت بە سیستەمی سیاسی دەدرێت.**[٥٨٠]

هابرماس ئاماژە بەوە دەکات کە قەیرانی شەرعیەت و قەیرانی پالّنەری بەتەواوی تێکچرژاون، چونکە قەیرانی شەرعیەت دەشێت لە شکستی 'مانای کردە پالّنەرەکان *action-motiving meaning*' واتە قەیرانی پالّنەریەوە بێتە ئارا. قەیرانی شەرعیەت بەتەواوی دەتوانێت هەڕەشەی لەبەریەك هەلّوەشان لە دەزگای دەولّەت بکات، یان رەوتێکی پاشڤەچوون بەرەو سەرکوتی ستەمکارانە بخولّقێنێ.[٥٨١] چونکە هەر کاتێ تاك پالّنەری جدی نەما بۆ بەشداری لە شەرعیەت بەخشین بە سیستەمی سیاسی، ئەوا قەیرانی شەرعیەت سەرهەلّدەدات و ئەمەش لە هەندێ حالّەت دا تەقینەوەی سیاسی واتە رووخانی دەولّەتی لێ دەکەوێتەوە، چونکە هاوولاّتی دەگاتە ئەو بڕوایەی کە بەشداری ئەو شتێکی ساختەیە وهیچ بەهایەکی نییە و ناچێتە ناو کۆی پرۆسسی سیاسی و هەر بۆیە هەولّی رووخاندنی سیستەم دەدات و لە هەندی حالّەتیشدا بە سەرکوتکردنی هاوولاّتیان کۆتایی دێت. بەلاّم (زیگمونت باومن) رەخنە لەم تێڕوانینە دەگرێت وپێیوایە ئەمە قەیرانی پالّنەری نییە بەلّکو بەرەنجامی پەراوێزخستنی رێژەیی پەیوەندی سەرمایە- کارە لە هەناوی سیستەمی سەرمایەداری دا کە پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا و سەرمایەگوزاری بووەتە هۆی بەزیادەسەیرکردنی هێزی کار.[٥٨٢] هابرماس بەشێوەیەکی دەمارگرژ و جەبرگەرایانە یان ماشینی سەیری قەیران ناکات و بە وردی ئەوە روون دەکاتەوە کە هیچ رێگایەك بۆ پێش بینی کردنی جۆر، فۆرم و بە شێوەیەکی بنبڕ

٥٨٠. یورگن هابرماس ، سەرچاوەی پێشوو ، ل١٢٥.

٥٨١. مایکل پیوزی ، سەرچاوەی پێشوو، ، ل ١٢٨.

٥٨٢. زیگمونت باومن، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٩.

دەرەنجامەکانی قەیران بوونی نییە.[583] چونکە هەر لە بنەڕەت دا ئاماژە بە ئەگەرەکانی سەرهەڵدانی قەیران و جیگۆرکێیان دەکات و حەتمیەت و قەدەرگەرایی لە ئارادا نییە. کەواتە بۆ ئەوەی سیستەمێکی سیاسی ببێتە خاوەن شەرعیەتی دیموکراتی و شوناس و یەکانگیری کۆمەلایەتی بپارێزێت، پێویستە هاوسەنگی نێوان وەفاداری و بڕیارە سیاسی و کارگێڕییەکان دابین بکات و ئەمەش لە ڕێگای دیموکراسی شکلیەوە نابێت بەڵکو پەیوەندییەکی تۆکمەی بە دیموکراسی راوێژگەریەوە هەیە. کەواتە دەتوانین بڵێین دەوڵەتی مۆدێرنی نەتەوەیی پشت بە شەرعیەتی دیموکراتی دەبەستێ کە بریتیە لە ئەرگۆمێنتی رازیکەر بۆ سەلماندنی دروستی و ڕەوایی سیستەمی سیاسی. بەلآم هابرماس لە هاناوی سیستەمی سەرمایەداری پێشکەوتوو ئاماژە بە فۆڕمەکانی قەیران دەکات کە بریتیە لە ناهاوسەنگی بۆچووی *inputs* بەشداری هاوولآتیان و رەزامەندییان لە هەمبەر سیستەم و دەرچووی *outputs* سیستەم بۆ داخوازییەکانیان، هەربۆیە قەیرانی ئابووری و عەقلآنیەت و شەرعیەت و پاڵنەری سەرهەڵدەدات کە هەڕەشە لە کۆی سیستەم و یەکانگیری و سۆلیدارێتی کۆمەلآیەتی و بەشدار سیاسی دەکات.

## تەوەری دووەم: بەجیهانیبوون و ئاییندەی دیموکراسی

### ١. لاوازبوونی مۆدێلی دەوڵەت – نەتەوە:

چەمکی شەرعیەتی دیموکراتی لەگەڵ سەرهەڵدانی دەوڵەتی مۆدێرن هاتۆتەئاراوە.« لەسەرەتاکانی سەدەی شازدەوە ئەوروپا گۆڕانکاری ریشەیی بەخۆوە بینی. بەرچاوترین گۆڕانکاری، سەرهەڵدانی دەوڵەتی نەتەوەیی *Nation-State* خاوەن سەروەری بوو، کە بە لیبرالیزمی سیاسی جیا دەکرێتەوە و داکۆکی لە پرەنسیپی ئازادی دەکرد».[584] لێرەشەوە پرەنسیپی سەروەری دەگەرێتەوە بۆ پەیماننامەی وێستفالیا و سەرهەڵدانی سیستەمی دەوڵەتی

٥٨٣. هەمان سەرچاوە، ل ١٢٥.

٥٨٤. د.شیرازد احمد النجار، سەرچاوەی پێشوو، ص٨٠.

مۆدێرن لە ساڵی ١٦٤٨.[585] «سەروەری لە فۆرمە نوێیەکەی دا بریتییە لە بانگەشەیەکی بە تەواوی جیای سیاسی بۆ کۆنترۆڵی حەصری بەسەر رووبەرێك خاکی دیاریکراو دا».[586] لە دیدی هابرماسەوە هەر لەسەرەتاوە دەوڵەتی مۆدێرن کە لە پێداویستی بەڕێوەبردنی ناوەندیی دارایی و لەگەڵ جوڵەی بازاری ئابووری نیشتمانی و هەرێمی تازە گەشەسەندوو پێکهاتبوو، پێویستی بە زانیاری کارمەندی راهێنراو هەبوو لەرووی یاساییەوە... بەم جۆرە بەعەقلانی بوون بەمانا ڤیبەرییەکەی سەری هەڵدا، واتە راهێنان و تواناسازی سەروەری بیرۆکراسی دەوڵەتی مۆدێرن.[587] هەر بۆیە هابرماس بنیاتنانی پرۆسسی دیموکراتی دەوڵەت- نەتەوە لە چوار رووی گرنگەوە شی دەکاتەوە: سەرهەڵدانی دەوڵەتی مۆدێرن لە فۆرمی دەوڵەتی کارگێڕی و باجگر ( و هاوکات بەرهەم هێنانی بڕیاری مولزمەمی دەستەجەمعی) (أ)،چەسپاندنی سەروەری بەسەر هەرێمێکی جوگرافی دیاریکراو دا (ب) و لەگەڵ فۆرمێکی دیاریکراوی دەوڵەت- نەتەوە (ج) کە پاشان بە شێوەیەکی دیموکراتی بەرەو دەوڵەتی یاسایی و کۆمەڵایەتی گەشەی سەند(د).[588] ئەم دەوڵەتە بۆ بەڕوەبردنی کاروبواری گشتی پشت بە باج و داهاتی هاوولاتی دەبەستێ و بڕیاری مولزم دەردەکات و ئەم بڕیارانە لە چوارچێوەیەکی دیاریکراوی جوگرافی دا کاراییان هەیە، لە رووی شوناسیشەوە نەتەوە و دەوڵەت هاوتا بوون و پاشان ئەم مۆدێلە بەرەو دەوڵەتی یاسایی و کۆمەڵگای عەقلانی هەنگاوی نا. هەر لەم مۆدێلە دایە کە شەرعیەتی دیموکراتی سەرهەڵدەدات کە سەرچاوەکەی بۆ سەروەری گەل دەگەڕێتەوە و بریتییە لەرەزامەندی و پابەندبوون بۆ دەسەڵاتێکی سیاسی لە چوارچێوەی کۆمەڵگایەکی دیاریکراو دا. کە لە روانگەی هابرماسەوە

---

٥٨٥. Glenn p.Hastedt,American foreign policy-past ,present, future, Jemes Madison University, 2006,p.7.

٥٨٦. بول هيرست و جراهام طومبسون، ماالعولمة؟ الأقتصاد العالمي و امكانات التحكم، ت: د. فالح عبدالجبار، دراسات عراقية، بيروت، ٢٠٠٩، ل ٤٣٥.

٥٨٧. يورغن هابرماس، العلم و التقنية كأيدولوجيا، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣٧.

٥٨٨. يورگن هابرماس، جهانی شدن و آيندەی دمکراسی – منظومەی پسامِلی،ت: کمال پولادی، نشر مرکز، ض ٣، تهران، ١٣٨٤(٢٠٠٥)، ل٩٦- ٩٧. سەرچاوەکە بە ئینگلیزی:
Jürgen Habermas, The Postnational Constellation -Political Essays ,translated by Max Pensky, Polity Press, Cambridge, Massachusetts,2001,pp. 61- 62.

**کۆمەڵگا وێنای کۆبوونەوەی ژمارەیەك تاك لەخۆدەگرێ کە لە سایەی یاسایەکی عەقلانی یەکیانگرتووە بۆ ئەوەی مافەکان بە یەکتر ببەخشن. بەلاّم مەرجی جێبەجێ بوونی سەرکەوتوانەی یاسایی دانراو و مولزەم پێویستی بەوەیە کە سنووربەندی کۆمەلاّیەتی کۆمەڵگای سیاسی و سنووربەندی قەڵەمڕەوی جوگرافی ژێر کۆنترۆلی دەوڵەت هاوجووت بێت.**[٥٨٩]

واتەتەنیا کاتێ بڕیارەکان ئەگەری جێبەجێ بوونیان هەیە کە دەسەلاّتی سیاسی بتوانێ ئوتوریتەی خۆی بەسەر سنوورێکی دانپیانراوی جوگرافی سیاسی دا بسەپێنێ. دەوڵەت-نەتەوە بونیاد وپێکهاتەیەکی سیاسییە و بە سیستەمێکی سیاسی دادەنرێت کە سەروەری بەسەر هەرێمێکی تایبەتی دا هەیە کە بە سنوور دیاریکراوە و تەنیا کاتێ دەتوانین بڵێین دەوڵەتی خودموختار و سەربەخۆمان هەیە کە "سنوور"ی هەبێت، چونکە دەزگای سیاسی نەتەوە جووتە لەگەڵ سنوور دا.[٥٩٠] حکومەتی نەتەوەیی کاتێ دروست بوو کە"سنوور" لەجیاتی "سەرحەد" هاتەئاراوە.[٥٩١] کەواتە سنوور بریتیە لە شەرعیەت و دانپیانانی نێودەوڵەتی بە سەروەری دەوڵەتێکی دیاریکراو دا، لەسەردەمی دەوڵەت نەتەوە دا وەك پیرۆزی مامەڵە لەگەڵ سنوور دا دەکرا. لە روانگەی هابرماسەوە خۆ ــ بەڕێوەبردنی دیموکراتی واتە گۆڕانی دانیشتووانی ولاّت بۆ نەتەوەیەك لە هاوولاّتیان کە حاکمن بەسەر چارەنووسی خۆیان دا. دەوڵەتی مۆدێرن بونیاتنانی سیمولیکی "گەل" دەگۆڕێ بۆ دەوڵەت- نەتەوە. کەواتە دەوڵەتی مۆدێرن بە هۆی یاسای مۆدێرنەوە دروست دەکرێت و لە هەمان کات دا پشت بە گەشەسەندنی ئاگایی نەتەوەیی دەبەستێ وەك بناغەی کلتوری سۆلیدارێتی مەدەنی.[٥٩٢] هەربۆیە دەتوانین بڵێین

---

٥٨٩. هەمان سەرچاوە، ٩٨.. ٦٣ Jürgen Habermas, The Postnational Constellation,op.cit., P.

٥٩٠. آنتونی گیدنز، چشم اندازهای جهانی،(ئایینده جیهانییەکان) ت: محمد رضا جلائی ثور، طرح نو، تهران، ١٣٨٤(٢٠٠٥)، ل ٨٥.

٥٩١. آنتونی گیدنز، راه سوم — بازسازی سوسیال دمکراسی(رێگای سێیەم- بنیاتنانەوەی سۆسیال دیموکراسی)،ت:منوچهر صبوری کاشانی، شیرازە، تهران، ١٣٧٨(١٩٩٩)، ل ١٤٤.

٥٩٢. یورگن هابرماس،جهانی شدن و ایندەی دمکراسی، سەرچاوەی پێشوو ٩٩-١٠٠. . Ibid ٦٤.

نەتەوە گۆتارێکی سیاسیە کە دەشێت وەك بەشێك لە کلتوری سیاسی گەلاڵە بکرێت، کـە لـە هەندێ حاڵەت دا کلتوری زۆرینە وەك کلتوری گشتی سیاسی دەناسرێت.

لە ئەوروپا پاش جەنگی دووەمی جیهانی پرۆسسی دیموکراتی بەو جۆرەی لەم چوار خاڵەی سەرەوە باس کرا بە شێوەیەکی کەم تا زۆر تۆکمە بەدەزگایی کرا و بەسەدان دەوڵـەت نەتـەوە سەریان هەڵداوە. بەڵاّم لە حـەفتاکانی سـەدەی بیسـتەوە لـە لایـەن هێـزی بەجیهانیبوونـەوە کەوتۆتە ژێر گوشارەوە. [593] هابرماس پێیوایە دەوڵەتی لیبرالی رۆژوایی ئێستا لە قەیرانێکی بێ وێنە دا دەژیت کە خۆی لەو دابڕانە دا دەبینێتەوە کە لـە نێـوان پێکهاتـە نەتەوەییەکـەی (تەبایی دەوڵەت ونەتەوە) و پێکهاتە سیاسـیە رێکارییەکـەی (پرەنسـیپی هـاووڵاّتی بـوونی گشتگیر) دا هاتۆتە ئاراوە. [594] چونکە هەر لەسەرەتای سەرهەڵدانی دەوڵـەت- نەتـەوە، تـەبا نەبووە بەڵکو لە رێگای گوتـاری ناسیۆنالیسـتی نەتـەوە و کلتورێـك وەك نەتـەوەی دەوڵـەت دیـاریکراوە نـەك تێکەڵەیـەك لـە کلتـور و شوناسـی نەتـەوە و پێکهاتـە جیاوازەکـان. لـەم سۆنگەیەوە لە چارەگی کۆتایی سەدەی بیستەم و لەگەڵ دەرکەوتنی"بـەجیهانیبوون" کۆڵەگـە سەرەکیەکانی دەوڵەت- نەتەوە تووشـی لاوازی هـاتووە و چـیتر تاکـە ئەکتـەر ی سیاسـەتی جیهـانی و بانگەشـەکاری سـەروەری نییـە و « بـەجیهانیبوون بۆتـە هـۆی لەناوەندخسـتنی دەسەلاّتی دەوڵەتی نەتـەوەیی و بـە نەتـەوەکانی تـری دەبەخشـێتەوە (بـۆ نموونـە بـەریتانیا دەسەلاّتێکی زیاتر بە سکۆتلەند و ویلز دەدات)». [595] هەربۆیە باس لە دەوڵەتی پۆست مۆدێرن دەکرێت کە ئەرکە دەرەکی و ناوەکییەکانی گۆڕانی بونیادیان بەسەر دا هاتووە و ئاماژە بـەوە دەکرێت «دەوڵەتی نـوێ وەلاّمیکـە بـۆ گـۆڕانی کۆمـەڵگایی *Societal Change* پۆسـت مۆدێرن و هەم پەرچەکردارە لەبەرانبەر پرۆسسە دەرەکییەکانی بەجیهانیبوون». [596] سـەروەری دەوڵەت بە هۆی بازارە جیهانیەکان و ئامرازە نوێیەکانی پەیوەنیگرتن کەم بۆتـەوە، بـەڵاّم تـا

---

٥٩٣. هەمان سەرچاوە، ١٠٠-١٠١.. Ibid ٦٥-٦٦.

٥٩٤. عبد الله السيد ولد أباه ،المواطنة في عصر ما بعد الدولة الوطنية -مفهوم المواطنة الدستورية لدى هابرماس، ل ١اله ٨. لەم سایتە لە رێکەوتی ٢٠١٠/٨/١٢ وەرگیراوە: http://www.altasamoh.net/Article.asp?Id=459

٥٩٥. آنتونی گیدنز ،چشم اندازهای جهانی، سەرچاوەی پێشوو ل ٦٤.

٥٩٦. جان ار. گیبینز و بوریمر، سیاست پست مدرنیتە، ت: منصور انصاری، گام نو چ٢، تهران، ١٣٨٤(٢٠٠٥)، ل١٥٥.

ئێستاش ڕۆڵی ناوەندی  ڕاگرتنی (ضبط) دانیشتووانی لەبەر دەست دایە، چونکە مرۆڤەکان لە پارە و کالاّ و هزر کەمتر دەجولێن.[597] کەواتە سـەرەڕای لاوازبـوونی توخمـەکانی دەوڵـەت — نەتەوە واتە سنوور و سەروەری، هێشتا بە بـەراورد لەگـەڵ ئەمانـە تـوخمی هـەرێم لـە ڕووی واقعیەوە بە نەگۆڕی ماوەتەوە، بەلاّم لە سەردەمی فەزای مەجازی دا شوێن ماناکانی گۆڕاوە.

## ٢. بەجیهانیبوون *Globalisation*:

بەرای ( ئەنتۆنی گیدنز) بەجیهانیبوون واتە "پشت بەیەکبەسـتن *Interdependence* " کە ڕووداوەکانی هەر دوو لای جیهان کاریگەری لەسەر یەکتر دادەنێن و "پەیوەندیکردنی خێرا *Instantaneous Communication* " سەرەکیترین فاکتـەری ئـەم پشـت بەیەکبەسـتنە جیگۆرکێکەرەیە *commutative*.[598] لە سەردەمی بـە جیهـانی بـوون دا بانگەشـەی ئـەوە دەکرێت « زەمەنی جیـاوازی هـەرێمی و نەتـەوەیی تێپـەڕیوە، جیـاوازی کلتـور و نـەریت و بونیادەکان بۆتە بەشێك لە ڕابردوو، پێکگەیشتن و تەوژمی گۆڕانی هەموو شـتێ بـۆ ئـەویتر، بازاڕ بەرەو یەکگرتوویەکی گشتگیر پاڵ دەنێت».[599] هەندێ لە بیرمەندان پێیانوایە شـاری گلۆباڵ *Global City* یان دەوڵەت- شار *City-state* جێگەی دەوڵەت نەتەوە دەگرێتـەوە و بە سەدان دەوڵەت شار دێتە ئاراوە.[600] (بێك) پێیوایە لـە سـەردەمی بـە جیهـانی بـوون دا (شوێن) لە ژیانی کۆمەلاّیەتی و سیاسی و کاری سیاسی داماڵراوە و لـە سـۆنگەی شـوێنەوە ئەمانە دەرك ناکرێت و ئەمە شوناسیش دەگرێتەوە و جڤاك لـە سـەردەمی گـەردوونی دا لـە پەیوەست بوون بە شوێن "ڕزگاری"بووە و «ئێستا هیچ پەوەندیەکی دیاریکراو لە نێوان شـوێن و کلتور دا نییە».[601] کەواتە سەرەڕای جولەی ئەستەمی مرۆڤ  بە بەراورد لەگـەڵ شـتەکانی تر، شوێن لە یادەوەری (الذاکرة) دا دەجولێت، واتە کلتـورە جیاوازەکـان شـوێنی جیـاواز لـە

---

٥٩٧. بول هیرست و جراهام طومبسون، ، ل ٤٣٦.

٥٩٨. آنتونی گیدنز، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٥٨تا٦٣.

٥٩٩. أرمان ماتلار، التنوع الثقافي و العولمة ، ت:د.خليل احمد خليل، دار الفارابي، بيروت، ٢٠٠٨، ل ١٣٠-١٣١.

٦٠٠ . هەمان سەرچاوە، ل ٧٨-٧٩.

٦٠١. بول هیرست و جراهام طومبسون، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٤٥٢.

یادەوەری دا دروست دەکەن، هەر بۆیە هەندێ لە رەخنەگران پێیانوایە بەجیهانیبوون پرۆسسی گەشەپێدانێکی نایەکسانە، کە هەم یەکپارچاساز و هەماهەنگ خوازە و هەم پارچەپارچەکار و وێرانکار، ئەم پرۆسسە فۆرمێکی نوێی پشت بەیەکبەستنی دوولایەنە و یەکانگیری جیهانی دێنێتە ئاراوە کە شوێنێك بۆ"ئەویتر"نامێنێتەوە.[٦٠٢] بەلاّم (دەڤید هیلّد) ئەرگۆمێنت دەخاتەڕوو کە فرەنەتەوەیی بوون *Multinationalization* ی چالاکیە دیموکراتیەکانی پێشوو، وێڕی بەجیهانیبوون و بە نێوتۆڕبوون *Inter-meshing* ی بڕیاروەرگرتن، هێزی دەولّەت-نەتەوەی مۆدێرنی داڕووخاندووە.[٦٠٣] لە روانگەی هابرماسەوە پرسە گرنگەکە ئەوەیە کە ئایا بەجیهانیبوون بە نۆرەی خۆی کاریگەری لەسەر بناغەی کلتوری سۆلیدارێتی مەدەنی دادەنێت یان نا بەو جۆرەی کە لە هەلومەرجی دەولّەت-نەتەوە دروست دەبێت. ئایا چارەنووس و ئاییندەی دیموکراسی پاش دەرکەوتنی مەترسیەکان لایەن بەجیهانیبوون بۆسەر دەولّەتی نەتەوە چییە؟ ئایا شەرعیەتی دیموکراتی کە تایبەتە بە بونیادی دەولّەتی مۆدێرنی یاسایی چی بەسەردێت؟

سەبارەت بە هەلّوێست وەرگرتن لە بەرانبەر بەجیهانیبوون دەتوانیین ئاماژە بە چوار ئاراستە بکەین:[٦٠٤]

١. ئاراستەیەك کە توند خۆی بە پرەنسیپەکانی دەولّەتی نەتەوەییەوە گرتوە و دژی بزاڤی بەجیهانیبوونە لە سۆنگەی داکۆکی کردن لە شوناسی تایبەتی نەتەوەوە.

٢. ئاراستەیەك کە قەیرانی دەولّەت نەتەوە بە دەرفەتێکی باش دەزانێت بۆ ئەنجام دانی چاکسازی جەوهەری لە تێڕوانینی لیبرالی بۆ سیستەمی دیموکراسی مۆدێرن، واتە بێلایەنی دەولّەت لە بەرانبەر هەموو وێنایەك بۆ چاکەی گشتی و هونەرەکانی ژیانێکی نایاب.

٣. ئاراستەی بانگەشە کردن بۆ نەمانی دەولّەتی نەتەوەیی و بەسەرچوونی قۆناغەکەی و دروست کردنی ئیمپراتۆریەتەکان وەك فەزایەکی کراوە کە نە دلّی هەیە نە ناوەند.

---

٦٠٢. رابرت آودی و مارشال برمن و ئەوانیتر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٢٧.

٦٠٣. جان ار. گیبینز و بوریمر، سەرچاوەی پێشوو، ل١٦١.

٦٠٤. عبد الله السيد ولد أباه ، سەرچاوەی پێشوو ،ل ٢ لە ٨.

٤. ئاراستەیەکیش کە هابرماس تەبەنی دەکات و بنچینەی دیموکراسی بۆ گرێبەستی ئازادی نێوان تاکەکان دەگێڕێتەوە، کە ژیانی جەماعی خۆیان لەسە بنەمای ئەو رێکخستنە رێکاریانە دادەمەزرێنن.

هەر چوار ئاراستەکە دان بەو فشارە گەورەیە دادەنێن کە لە لایەن بەجیهانیبوونەوە خراوەتە سەر دەوڵەت-نەتەوە، بەلاَم رێوشوێنی جیاواز بۆ دەربازبوون پێشنیار دەکەن. بەرای هابرماس یەکەمین پرسیار پەیوەستە بە پرسی بەردەوامی کارایی بەڕێوەبردنی کاروباری گشتی وەك ئامرازی دەسوەردانی کاریگەر لە رەوتی کاروبارەکان دا لە لایەن کۆمەڵگای دیموکراتیەکانەوە. داڕووخانی ژینگە و متمانەنەبوون بە توانستی بەرزە تەکنەلۆژیا *High-tech* ریسکی نوێی هێناوەتە ئاراوە کە گوێ ناداتە سنوورە نەتەوەییەکان.[٦٠٥] واتە ئایا ئیدی دەزگای ئیدارە و حکومەت دەتوانێت بەتەنیا رووبەڕوی کۆمەڵێك تەحەدی ببێتەوە کە لەسەروو هێز و ئیرادەی ئەوەوەیە، وەك گەرم داهاتنی گۆی زەوی و بارانی ئەسیدی و کونبوونی ئۆزۆن یان قاچاغی ماددە هۆشبەرەکان و چەك و کارەساتە سروشتیەکانی وەك تسۆنامی و بوومەلەرزە.

لە جیهانێك دا کە بەردەوام لە رووی ئابووری و کلتووری و ژینگەییەوە تێك دەچرژێت بەردەوام دەرفەتی کەمتر دەبێت کە بڕیارە مەشروعەکانی دەوڵەتێك لەگەڵ بەرژەوەندی تاك و ناوچەکانی تر دا هەماهەنگ بێت و کاریگەریان لەسەری دانەنێت. ئەمە لەسەر ئاستی فەرمی و لە ئاستی هەرێمی و نێودەوڵەتیش دا هەندێ قەوارەدەرکەوتوون کە حوکمی ئەودیو دەوڵەت- نەتەوەیان بەدەستەوەیە و لە زۆر بوار دا لە دەوڵەت بەهێزترن. وەك بانکی نێودەوڵەتی و ئاژانسی وزەی ئەتۆم و رێکخراوە جیهانییەکانی وەك ئەمینستی ئینتەرناشناڵ و هیومن رایتس وۆچ. بە تێگەیشتنی هابرماس ئەو راستیە کە پێویستە پرۆسسی دیموکراتی بەردەوام لە کلتوری سیاسی هاوبەش دا سەقامگیر بکرێت، دەلالەت نییە لە پرۆژەی حەسریی بەدیهێنانی تایبەتخوازی نەتەوەیی ، بەڵکو دەلالەت لە چەمکی لەخۆگری خود- یاسادانەری دەکات کە هەموو هاوولاَتیان بێ جیاوازی لەخۆ دەگرێت، وێڕای ئەوەی ناچاریان ناکات بۆ وەکیەکی (تماثل) لە کۆمەڵگایەکی یەکانگیر دا.[٦٠٦] شوناسی نەتەوەیی تەنیا کاتێ دەتوانێ

٦٠٥. یورگن هابرماس، سەرچاوەی پێشوو .١٠٥ .Ibid.p ٦٨.

٦٠٦. هەمان سەرچاوە، ل١١١-١١٢. .Ibid .٧٣

کاریگەری پۆزەتیڤی هەبێت کە دوالیزم یان یکانگیری چەندلایەنە تەحەمول بکات.[٦٠٧] بەرای هابرماس پێویست ناکات کە سیستەمی دیموکراتی بە شێوەیەکی خۆڕسك رەگی لە نێو"نەتەوە"دابێت وەك جڤاکێکی پێش- سیاسی کە لەسەر بنەمای چارەنووسی هاوبەش دامەزراوە. بەڵکو هێزی دەوڵەتی دەستوری لە توانستی یەکانگیری کۆمەڵایەتی دایە کە لەسەر بنەمای بەشداری سیاسی هاووڵاتیان دامەزراوە. لە روانگەیەکی گشتی و دوورمەودا دا تەنیا ئەو فۆرمە لە پرۆسسی دیموکراتی شەرعیەتی هەیە و دەتوانێ سۆلیدارێتی هاووڵاتیانی خۆی دابین بکات کە بتوانێ تەرخان کردن و دابەشکردنی دادپەروەرانەی مافەکان دابین بکات.[٦٠٨] بە گشتی بەجیهانیبوون کاریگەری دوولایەنەی یەکە سیاسیەکان لەسەر یەکتر و کەمبوونەوەی رۆڵی کلتوری زاڵی نەتەوەیی و نەتەوەی پێش سیاسی و گۆڕانی شەرعیەتی دیموکراتی لێ کەوتوەتەوە. بەجیهانیبوون کاریگەری دادەنێت لەسەر حوکمی یاسا و کارایی و سەروەری دەوڵەت و شوناس و شەرعیەتی دیموکراتی دەوڵەت- نەتەوە. بە بڕوای هابرماس تەنیا کاتێ دەتوانین بە شێوەیەکی ژیرانە رووبەڕووی تەحەدییەکانی بەجیهانیبوون ببینەوە کە مەنزومەی پۆست نەتەوەیی بتوانێت بە سەرکەتوییەوە فۆرمی نوێی خود- سەرکردایەتی *Self-steering* دیموکراتیانەی کۆمەڵگا گەشە پێبدات.[٦٠٩]واتە ئیدی فۆرمی دەوڵەت نەتەوە ناتوانێت وەلامی خواستەکانی تاکی سەردەم بداتەوە و دەبێ لە ئاستی جیهانی دا سەرکردایەتی دیموکراتی کێشەکان ئاراستە بکات و جۆرێك لە کۆمەڵگای جیهانی بێتە ئاراوە کە یەك مەرجەعی یاسایی هەبێت و لەم نێوە دا « یەکگرتن و پەیوەندیکاری نوێ بنەمای کۆمەڵکای مەدەنی جیهانی دروست دەکات و ئامرازەکانی پەوەندیگرتنی جیهانی بەشدارن لە هێنانە ئارای کۆمەڵێك کلتوری کۆسمۆپۆلیتی».[٦١٠] بەم جۆرە بە جیهانی بوون لە دوو بەرە دا خۆی دەبینێتەوە: ١) بەجیهانیبوون لەسەرەوە *Globalisation from above* واتە لە رێگای بەرنامەی سیاسی دەوڵەتەکان و ٢) بەجیهانیبوون لە خوارەوە *from blow Globalization* واتە لە ژێر کاریگەری رێکخراوە ناحکومیەکان *NGO* وگرووپەکانی تری

---

٦٠٧ . آنتونی گیدنز، راه سوم، سەرچاوەی پێشوو ،ل ١٤٤.

٦٠٨. یورگن هابرماس، سەرچاوەی پێشوو، ل ١١٥-١١٧. .Ibid.p ٧٧-٧٦.

٦٠٩. هەمان سەرچاوە، ل١٣٢. .Ibid.p ٨٨.

٦١٠. بول هیرست و جراهام طومبسون، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٤٥١.

کۆمەڵگای مەدەنی.[611] لێرە دا ئیدی شوناس و کلتـوری نەتـەوەیی وەك یەکـەی جیاکـەرەوە لاواز دەبێت و بەشداری لەشار کلۆباڵەکان و رادەی بەهێزی ئەکتەرەکان رۆلی هەیـە، ئەمـەش بەمانای لەناوچوونی جیاوازییەکان نییە بەڵکو رەنگە تێکەڵەیەك بێت لە هەموویان. لە نێوان لۆکاڵی بوون و شوناسی تایبەتی و نەتەوەیی و بـە جیهـانی بـوون دا بـاس لـە سـەرهەڵدانی بەجیهانیبوونی خۆجێهی *Glocalisation*[612] دەکرێت. بەلاّم گەورەترین کێشـەی بـەجیهانی بووون بالاّدەستی لۆژیکی بازاڕ و ئابوورییە بەسەر کۆی بوارەکانی ژیانی مرۆڤایەتی دا، هـەر بۆیە هابرماس ئاماژە بەوە دەکات «ئەگەر ژێرخانی ژیانی گشتی و تایبـەتی بدرێتـە دەسـت هێزی خۆرێکخەری بازاڕ ئەوا توشـی لەبەریـەك هەڵوەشـان و وێـران بـوون یـان لـە ناوچـوون دەبێت».[613] سیاسەتی سەپاندنی بازاڕی ئازاد مەترسیەکی گەورەیە چونکە دەبێتە هۆی هاتنە ئارای جیاوازی ئەتنی و تاوانی رێکخراو و بەرزبوونەوەی ئاستی زیان گەیاندنی بە ژینگـە.[614] ئەگەر ئەو راستیەش بزانین کە «ئایدیالیزەکردنی بازاڕی ئـازاد بـۆ بـە کاربردنی(استـهلاکی) دەرەکییە».[615]چونکە زلهێزە ئابوورییەکان بە ئاسانی رێگە بە هاتوچۆی کـالاّو شمـەکی بیـانی نادەن وەك ئەوەی بۆ دەرەوەی خۆیان بانگەشەی بۆ دەکـەن، بـەلاّم ئەگـەر پێویسـت بێـت لـە ئاستی لۆکاڵی لە چوارچێوەی دەوڵەت دا بازاڕ کـۆنترۆڵ بکرێـت ئـەوا لـە ئاسـتی جیهـانیش پێویستە.

**بلاّوبوونەوەی دیموکراسی جیهانی یەکێکە لە هەلومەرجەکانی رێکخستنی کاریگەری ئابووری جیهانی و هێرش کردن بۆسەر نایەکسانی ئابووری جیهانی و کـۆنترۆڵ کردنـی ئەگـەری هەڕەشـەکانی ژینگـە، خـەبات لـەدژی**

٦١١. آنتونی گیدنز، چشم اندازهای جهانی، سەرچاوەی پێشوو ،ل ٦٦.

٦١٢. أرمان ماتلار ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٣٠.

٦١٣. یورگن هابرماس، سەرچاوەی پێشوو، ٧٨..١١٨ Ibid.p.

٦١٤. بومدین بوزید(اعداد و تنسیق)، فلسفة العدالة في عصر العولمة، منشورات الأختلاف، الجزائر، ٢٠٠٩، ل ١٩٣.

٦١٥. أرمان ماتلار ، سەرچاوەی پێشوو ،ل ١٥٦.

**فیندەمێنتالیزمی بازاڕ لە ئاستی لۆکاڵی دا و ئازادکردنی بۆ فـەرمانڕەوایی کردن بەسەر بازاڕی جیهانی دا هیچ مانایەکی نییە.**[٦١٦]

هەر وەك ئاشكرایە كۆمپانیا فرە رەگەز و سـنووربڕەكان ئەكتـەری سـەرەكی بـە جیهـانی بوونن کە سەرەکیترین ئامانجیان بەدەست خستنی قازانجە و زۆرترین زیان بە ژینگەی جیهـانی دەگەیەنن و کێشەی گەورەی ئیکۆلۆژیان دروست کردووە، بۆیە پێویستە لەسەر ئاستی جیهانی بەهەمان لۆژیك واتە جولانەوە لـەبان دەولـەت مامەلـەیان لەگەلـدا بکرێـت، سیسـتەمێکی یاسایی گشتگیر تر دابڕیژرێت.

### أ. یەکێتی ئەوروپا:

دەتوانین وەك یەكێك لە مەنزومە پۆست نەتەوەییەكان سەیری یەكێتی ئەوروپا بكەین. لای (گیدنز) «یەکێتی ئەوروپا وەك بەشێك لە سیستەمی دووجەمسەری دەستی بەکار کرد، بـەلام ئەمرۆ دەبێ وەلامێك بۆ بـەجیهانیبوون دەرکـی بکـەین».[٦١٧] هابرمـاس وەك وەلامێـك بـۆ سەردەمی پۆست نەتەوەیی و بەجیهانیبوون دوو پرۆژە پێشکەش دەکات: یەکـەم؛ بریتیـە لـە دەولەتی فیدرالی دیموکراتی ئەوروپا و دووەمیان؛ ئەفراندنی پانتاییەکی گشتی گەردوونی کـە بەهای دیموکراسی و تەشریعاتی جیهانی حوکمی بەسەر دا بکـەن.[٦١٨] لەبـەر ئـەوەی یـەکێتی ئەوروپا کیانێکی سیاسی و ئابووریە ودەتوانێ ببێتە مۆدێلێك بۆ کیـانی پۆسـت نەتـەوەیی و دەتوانێ سەروەری بان نیشتمانی و دەزگای بان نەتەوەیی دروست بکات و پرۆژەیـەك بێـت بـۆ دیموکراسی لەسەردەمی بەجیهانیبوون دا. بەلام هەندێ ئەمە رەد دەکەنەوە و پێیان وایـە کـە یەکێتی ئەوروپا پرۆژەیەکی نوێیە کە هیچ سوودێکی بۆ مۆدێلە سیاسیەکانی پێش خۆی نییـە لە رێنمایی گەشە و بەرزبونەوەدا و جیاوازییەکی گەورە هەیـە لـە ئـەدای ئـابووری و نۆرمـە کۆمەلایەتیەکانی و لە وێشەوە بەرژەوەندی سیاسـی ئـەو ولاتانـەی کـە یەکێتیەکـەیان پێـك هێناوە.[٦١٩] واتە ئەمانە جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە ئەو ولاتانەی کە یەکێتیەکەیان پێك

---

٦١٦. آنتونی گیدنز، راه سوم، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٦٣.

٦١٧. هەمان سەرچاوە، ل ١٥٧.

٦١٨. عبد الله السید ولد أباه ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٦له٨.

٦١٩. بول هیرست و جراهام طومبسون، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٣٩٢.

هێناوە، لە رووی گەشەی سیاسی و کلتوری و کۆمەلآیەتیەوە چونیەك نین و زۆر جیاوازن. لێرەدا هابرماس چوار هەلۆێست لەیەکتر جیا دەکاتەوە کە بە پێی پشتیوانی کردن لە دیموکراسی پۆست نەتەوەیی لە یەکدی جیاوازن:[٦٢٠] ١.رەشبینەکان سەبارەت بە یەکگرتنی ئەوروپا 2 *Euroskeptics*.لایەنگرانی ئەوروپا وەك بازاڕی هاوبەش 3 *MarketEuropeans*.لایەنگرانی فیدرالیزمی ئەوروپا *Eurofedralists* 4.داکۆکیکاران لە "حوکمڕانی جیهانی" *Global Governance*.

ئەم چوار هەلۆێستە وەلآمی کۆمەلێك پرسیارە کە هابرماس ئاماژە بە چواریان دەکات:[٦٢١]

أ. تێزی پەیوەست بە کۆتایی هاتنی کۆمەلگای پشت بەستوو بە کار. ب.ململانێی کۆنی نێوان دادپەروەری کۆمەلآیەتی و کارایی بازاڕ. ئەمە لە بیرۆکەی یاسای گرێبەست وەرگیراوە. واتە مامەلە لەهەلومەرجێکی یەکسان بە رەزامەندی هەر دوو لایەن ئەنجام دەدرێت. بەڕای هابرماس ئەم تێڕوانینە بۆ یەکسانی ئیشکالیە و هەم لەگەل چەمکی تاکەکەسی ئەخلاقی خاوەن ئیرادە وهەم لەگەل تاکی هاوولآتی کۆمارێك کە بە پێی مافی یەکسان لە کردەی گشتی خود- یاسادانەری *Self-legislation* بەشداری دەکات.[٦٢٢] ج. یەکێتی ئەوروپا دەتوانێت سەرەتایەك بێت بۆقەرەبووکردنەوەی ئەو سەلاحیاتانەی کە دەولەت- نەتەوە لە دەستی داوە؟ د. ئایا کۆمەلگای سیاسی لەو دیو سنوورە نەتەوەییەکان دەتوانێت ببێتە خاوەن شوناسێکی جەماعی و هەربۆیە دەتوانێ مەرجەکانی شەرعیەتی دیموکراتی جێبەجێ بکات؟(بێك)[٦٢٣] دەلێت لە سەردەمی بەجیهانیبوون دا گەڕان بۆ دیموکراسی نەتەوەیی لە وەهمێك زیاتر نییە، و دیموکراسی لە ئەوروپا بوونی نییە تەنیا کاتێ نەبێت کە بە هەموو سنوورەکانی دا بەرفراوان

---

٦٢٠. یورگن هابرماس، سەرچاوەی پێش، ل١٣٣..٨٩ Jürgen Habermas, op.cit., p.

٦٢١. هەمان سەرچاوە، ١٣٣-١٣٤. . ٨٩-٩٠ Ibid.

٦٢٢. یورگن هابرماس، سەرچاوەی پێشوو، ١٣٨-١٣٩.. ٩٣-٩٤ Ibid.

٦٢٣. ئولریش بیك Ulrich beck (1944- ) بەرێوبەری ئەنیستیتوتی زانستەکۆمەلآیەتیەکانی زانکۆی میونیخە و لە هەمان کات دا لە London School of Econoic وانە دەلێتەوە ئەندامی لیژنەیەکی حکومییە کە بایەخ بە کاروباری ئاییندەیی هەر دوو هەرێمی باڤاریا و ساکسنی ئەلمانیا دەدات. بەرهەمەکانی بە ئەلمانی بریتین لە:- مندالآنی ئازادی ١٩٩٧.- ئاییندەی کار و دیموکراسی ١٩٩٨.

بێت و دەبێ هزری سیاسی نوێ بەهێز بکرێت و حزبی ئەوروپی و هاووڵاتی ئەوروپی لەسەروو کیانە سیاسیەکانی ئەوروپا دروست بکرێت.[٦٢٤] گیدنز ئاماژە بەوە دەکات کە دەبێ لە ئاستێکی بەرزتر لە دەوڵەت نەتەوەش دا دیموکراتیزە کردن لە ئارا دابێت و باسی بە دیموکراتی کردنی یەکێتی ئەوروپا دەکات وەك پێشەنگێك لە حوکمڕانی و بەڕێوەبردن لە ئاستێکی بەرزتر لە نەتەوە و رایوایە ئێستا یەکێتی ئەوروپا سەرەڕای گرنگی خۆی دیموکراتی نییە و دەبێ بۆ دیموکراتیزە کردنی خۆی و گرنگیدان بە دیموکراتیزە کردنی ئەندامەکانی هەوڵ بدات.[٦٢٥] لە روانگەی ئەوانەوە هاووڵاتی ئەوروپی دەبێ لەو دیو سنوورە نەتەوەییەکانەوە خۆی وەك ئەندامی کیانێکی سیاسی هاوبەش بناسێ، دەبێ نەتەوەی ئیرادییانە دروست بکرێ نەك تەنیا پشت بە گەلی پێش سیاسی ببەسرێت.

### ب- دیموکراسی جیهانی و نیشتمانیەتی دەستوری:

لە روانگە هابرماسەوە لایەنگرانی "دیموکراسی جیهانی" بە دوای سێ ئامانج دا دەگەڕێن: ***یەکەم،***دروست کردنی رەوشێکی سیاسی نوێ بۆ "هاووڵاتیانی جیهانی"کە ئیدی ئەندامێتیان لە رێکخراوی جیهانی دا لە سەر بنەمای نەتەوایەتیان نەبێ، بەڵکو بە هۆی بوونی نوێنەرایەتیانە لە پەرلەمانێکی جیهانی دا کە لە رێگای هەڵبژاردنی راستەوخۆ بۆ دەزگایەکی بەرزتر لە ئاستی نەتەوەیی ئەنجام دەدرێت. ***دووەم،***دروست کردنی دادگای تاوان بە سەلاحیاتی ئاساییەوە کە ئەحکامەکانی بۆ حکومەتە نەتەوەییەکانیش ئیلزامی بێت. ***سێیەم،*** گۆڕینی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ هۆبەیەکی راپەڕاندن (تنفیذي) بەسەلاحیەتەوە.[٦٢٦] ئەمانە نەك هەر لەرووی تیۆرییەوە بەڵکو لە رووی کردەیشەوە دەیانەوێت حکومەتی جیهانی خاوەن دەزگای یاسایی بن وەك نمونەی یەکێتی ئەوروپا، بەڵام ئەمە لەبنەڕەت دا پشت بە هاووڵاتی هوشیار دەبەستێ کە خواستەکانی خۆی لە ئاستی جیهانی دەخاتەڕوو. لە سیستەمی دیموکراسی پێشکەوتوو دا جەماوەر خودان نفوزە بۆ کاریگەری لەسەر دەوڵەت و دەوڵەتەکانیش دەتوانن کاریگەرییان هەبێت لەسەر سیاسەتی جیهانی و ئەم

---

٦٢٤.أولریش بك، سەرچاوەی پێشوو ،ل ١٩٨.

٦٢٥. آنتونی گیدنز، چشم اندازهای جهانی، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٥١-١٥٢.

٦٢٦. یورگن هابرماس، سەرچاوەی پێشوو،ل ١٥٦.. ١٠٧. Ibid.p

نفوزەش زیاد دەکات بە زیادبوونی زانیاری و هاندەری کۆمـەڵگای مـەدەنی جیهـانی کـە لـە ڕێکخراوە ناحکومییە فرە ڕەگـەزەکان پێکهـاتووە.[٦٢٧] کەواتـە دیموکراسـی جیهـانی لەسـەر بنەمای دیموکراسی دەوڵەتە ئەندامەکان دێتە ئاراوە و دەبێت بەردەوام ئەم پرۆسسە گەشەی پێ بدرێت. گیدنز باسی "دیموکراتیزە کردنی دیموکراسی" دەکـات و پێیوایـە تەنانـەت لـە وڵاتـە دیموکراتیەکانیش پرۆسسی بە دیموکراسی کردن هێواش بۆتـەوە و هێشـتا گەنـدەڵی دارایـی و باڵادەستی پیاو بەسەر پانتایی ژیانی سیاسی دا یان زاڵبوونی پارە بەسەر دەسەڵات دەبینرێـت کە ئاستی بەشداری سیاسی دابەزاندووە.[٦٢٨] لە ڕووی سیاسیەوە هابرماس پێشنیاری مـەرجی هاووڵاتی جیهانی دەکات- لە سەردەمی بەجیهانیبوون دا- کـە لـە سـەر بنـەمای سـنووری نیشتمانی و تیۆرە شۆڤینیەکان بۆ تاك دانامەزرێت، بەڵکو سنووری نیشتمان دەبڕێت و هەموو هەسارەکە لە خۆ دەگرێ. بۆ ئەوەی دان بە بیرۆکەی دەزگا سنووربڕەکان دا بنرێت و شتێك لە دیموکراتیەتی هاووڵاتی جیهانی لە ڕووی سیاسیەوە فۆرمەلە بێت وهێز وەربگرێت، پێویسـتی دامەزراندن و بەهێزکردنی کۆڵەگەکانی سیاسەتی نـوێ دێتـە ئـارا: واتـە بزوتنـەوە و حزبـی نەتەوەیی بۆ هاووڵاتی جیهانی. دەوڵەتی دیموکراتی نوێ ونەتەوەیی جیهانی پەیوەنـدی لەگـەڵ ڕووبەرێکی سیاسی زۆر بەرفراوانتر دا هەیە کە ئیدی ناتوانین بـە"دەرەکی" وەسـفی بکـەین، نەتەوەی جیهانی پێویستی بـە دیموکراسـی جیهـانی هەیـە کـە لـە ئاسـتی جیهـانی دا کـار بکات.[٦٢٩] واتە ئیتر کۆی هەسارە وەك یەکەیەکی یەکگرتووی دیموکراتی لەقەڵـەم بـدرێت کـە تێیدا ماف و ئەرکەکان دابەش دەکرێن و حکومڕانی یاسایی بگرێتـەخۆ. هابرمـاس پێیوایـە ئەگەر هاووڵاتیانی جیهانی بیانـەوێت لـە ئاسـتی گلۆبـاڵ دا خۆیـان ڕێکبخـەن و فـۆرمێکی نوێنەرایەتی هەڵبژاردنی دیموکراتی دابهێنن، دەبێ لەخۆ- تێگەیشتنێکی یاسایی - ئەخلاقیان هەبێت کە "مافی مرۆڤ" چوارچێوەکەی بێت.[٦٣٠] ئەمەش پەیوەستە بەو ڕەوتەی لە ئارا دایـە بۆ دروست کردنی "نەتەوەی جیهانی *Cosmopolitian* " کە ئاوێتەیەکـە لـە کلتورەکـان و پەیوەندی نێوان نەتەوەکان. لـە ڕوانگـەی هابرماسـەوە ئـەوەی گرنگـە چـۆن أ. شـەرعیەتی

---

٦٢٧. بول هیرست و جراهام طومبسون، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٤٧٠.

٦٢٨. آنتونی گیدنز، چشم اندازهای جهانی، سەرچاوەی پێشوو ل ١٥٠-١٥١.

٦٢٩. آنتونی گیدنز، راه سوم، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٥٢-١٥٣.

٦٣٠. یورگن هابرماس، سەرچاوەی پێشوو، ١٥٧. . Ibid.p ١٠٨.

دیمـوکراتی بڕیارەکـان دیـاری دەکرێـت و ب.پەیوەنـدی دەوڵـەت – نەتـەوە و رژێمـە بـان نەتەوەییەکان چۆن دەگۆڕێ بۆ دروست کردنی بەرژەوەندی دوولایەنە.[٦٣١] لێرەدا گرنگی گفتوگۆ و راوێژێکی کراوە سەبارەت بە پرسەکان دەربازبوون لـە چوارچـێوەی تەسـکی نەتـەوەیی کـە شەرعیەتی بڕیارە سیاسیەکانی تێـدا وەردەگیرێـت بـەرەو دیموکراسـی سـنووربڕ و دیموکراسـی هاوولاّتی جیهانی دێتەئارا، ئەمەش تەنیا چالاکی دەوڵەتەکان بەئاراستەیەکی جیهـانی لـەخۆ ناگرێت، بەڵکو دەبێ پرۆسسەکە بەرەو ناوخۆش بێت. لە کارلێکی دەزگایی و رێکاری یاسایی ئەم دووانە "حوکمڕانییەکی جیهانی" بێتەئاراوە.

کەواتە هابرماس لایەنگری سەرهەڵدانی سیاسەتی ناوخۆیی جیهانییە کە دەبێ لـە لایـەن هاوولاّتیان و رێکخراو و حزبەکانەوە پشتگیری بکرێت و لە پەیوەندی نێودەوڵەتیەوە بگۆڕێ بۆ سیاسەتی ناوخۆیی جیهانی. هابرمـاس پێشـنیاری نیشـتمانیەتی دەسـتوری *Patriotism Constitutional* دەکات بەو پێیەی زەمینەیەکی لەبارە بۆ دامەزراندنی شوناسێکی کـراوە لە سەر بنەما گەردوونیەکانی مۆدێرنە. تێپەڕاندنی شوناسی کلاسیکی دەوڵەت- نەتـەوە کـە لەسەر ئایین و زمان و مێژووی هاوبەش دامەزرابوو، دانانی کۆمەڵێك رێکاری ئەبستراکت بـۆ پەیوەندیکاری لەنێوان هەموو جیاوازییەکان لە پێناو پێکەوە ژیان دا.[٦٣٢] هاوولاّتی دەستووری پێویستی بە کلتوری نەتەوەیی نییە بەڵکو تـەنیا پێویسـتی بـە کلتـوری سیاسـی لیـبرالی و مەدەنی هەیە کە کلتورێکی تایبەتی دیاریکراو ناتوانێت قۆرغی بکات.[٦٣٣]

**کلتوری زۆرینە کە خۆی بەهاوتای کلتوری نەتـەوەیی دادەنێـت، ئەگـەر بیەوێت مل بۆ رەوشێك کەچ بکات کە هەموو هاوولاّتیان بەشێوەیەکی هاوتا خۆیان بە کلتوری سیاسی ولاّتەکەیان بناسێنن، دەبێ هەوڵی رزگاربوون بدات لە هاوشوناسی مێژوویی خۆی لەگـەڵ کلتـوری سیاسـی گشـتی دا. ئەگـەر جیاکردنەوەی کلتوری سیاسی گشتی لە کلتوری زۆرینە ، سەرکەوتوو بێت ئەوا سۆلیدارێتی هاوولاّتیان زیاتر بەرەو "نیشتمانیەتی دەستووری" بەرەو پـێش**

---

٦٣١. هەمان سەرچاوە، ل ١٦٠. ١١٠. Ibid.p.

٦٣٢. محمد الاشهب، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٣٠.

٦٣٣. عبد الله السيد ولد أباه ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦لة٨.

**دەچێت، بەلاّم ئەگەر ئەمە تێك بشكێ ئەوا ئەم كۆیە بەسەر وردە - كلتور دا دابەش دەبێت و بەرووی یەكتر دا دادەخرێن.**[634]

كەواتــە دوو رەوت دەبینرێــت كــە یــەكێكیان تێكەڵەیەكــە لــە كــۆی كلتــور و شوناســە زیندووەكان و ئەویتریشیان داخرانی كلتوریــە و بــەرەو پــەراوێز چــوونە، كــە ئەمــە زیــان بــە یەكانگیری مەدەنی جیهانی دەگەیەنێت. هابرماس پشت بە پرەنسـیپی هـاوولاّتی دەسـتووری دەبەستێت كە تەبایە لەگەڵ بیرۆكەی یونیڤێرساڵیزم كە سنووری سیاسەتی نەتەوەیی دەبەزێنێ وەك فەزای هەرێمایەتی (بۆ نموونە یەكێتی ئەوروپا) یـان پانتـایی نێودەوڵـەتی كـە پێویسـتە بگۆڕێت بۆ بوارێك كە لە لایەن رێسا و ئەخلاقیاتی مرۆیی كراوەوە رێكبخرێت.

بەرای هابرماس سۆلیدارێتی مەدەنی رەگی لە نێو شوناسی جـەماعی تایبـەت دا هەیـە، سۆلیدارێتی كۆسمۆپۆلیتی ناچارە دەبێ پشـت بـە یونیڤێرسـالیزمی ئـەخلاقی ببەسـتێت.[635] هەربۆیە دەتوانین ئاماژە بەوە بكەین كە لەسەردەمی بە جیهانی بوون و كێشە گلۆباڵـەكان دا شەرعیەتی دیموكراتی فۆرمی جیاواز وەردەگرێت لە چوارچێوەی مەنزومەی پۆست نەتەوەیی دا كە وادەكات  بڕیارەكان سنووری دەوڵەتی نەتەوە ببڕن، ئەمەش پێویستی بـە دروسـت بـوونی دەزگا و كیانی جیهانی و هەرێمی و پرەنسیپی ئەخلاقیاتی یونیڤێرساڵ هەیە بۆ شەرعیەت كە بەڕای هابرماس خۆی لە بنەما گەردوونیەكانی مافی مرۆڤ دا دەبینێتەوە.

بەم جۆرە دەبێ مافەكانی مرۆڤ لـە ئاسـتی هەسـارە بـەرفراوان بكرێـت و هابرمـاس بـە سەرچاوەی شەرعیەتی دیموكراتی مەنزوومەی پۆست نەتەوەیی دادەنێت كـە پێیوایـە دەشـێت سەرچاوەیەكی بەهێز بێت بۆ یەكخستنی گوتارە جیاواز و كلتـورە هەمـەجۆرەكان وپێویسـتە دەوڵەتەكان پشت بە دیموكراسی دەستووری ببەستن و هەموو تاكێك ئازاد بێت لە هاوولاّتی ئەو ولاّتەی دەیەوێت.

---

٦٣٤. یورگن هابرماس، سەرچاوەی پێشوو، ل ١١٢-١١٣.   . Ibid.p ٧٤.

٦٣٥. هەمان سەرچاوە،ل ١٥٨.. Ibid ١٠٨.

# سەرچاوەکان

## I. ئەنسکلۆپیدیا:


١. عبدالوهاب كيالي د.، **الموسوعة السياسية**، الجزء الثاني، المؤسسة العربية للدراسات و النشر، دار الهدى للدراسات و النشر، بيروت، ١٩٧٩.


## II. کتێبەکان:

### أ. کتێبە عەرەبیەکان:


٢. ابوالنور حمدي ابوالنور حسن، **يورجين هابرماس، الأخلاق و التواصل**، دار التنوير ، بيروت، ٢٠٠٩.

٣. أرمان ماتلار، **التنوع الثقافي و العولمة** ، ت:د.خليل احمد خليل، دار الفارابي، بيروت، ٢٠٠٨.

٤. اريك كيسلاسي، **الديمقراطية و المساواة** ، ت: جهيدة لاوند، معهد الدراسات الاستراتيجية، بغداد-بيروت،٢٠٠٦.

٥. آلان تورين، **ماالديمقراطية؟**، ت: عبود كاسوحة، منشورات وزارة الثقافة، دمشق، ٢٠٠٠.

٦. ألان تورين، **نقد الحداثة**، ت: أنور مغيث، المجلس الأعلى للثقافة، القاهرة ، ١٩٩٧.

٧. امام عبدالفتاح امام، **الاخلاق و السياسة**، المجلس الاعلى للثقافة، القاهرة، ٢٠٠١.

٨. أمانويل كانت، **تأسيس ميتافيزقا الأخلاق**، ت: د. عبدالغفار مكاوي، مراجعة د. عبدالرحمن بدوي، منشورات الجمل، كولونيا، ٢٠٠٢.

٩. ايان كريب، **النظرية الأجتماعية من بارسونز الى هابرماس**، ت: د. محمد حسين غلوم، مراجعة: د. محمد عصفور، سلسلة عالم المعرفة رقم ٢٤٤، المجلس الأعلى للثقافة، الكويت، ١٩٩٩.

١٠. بول هيرست و جراهام طومبسون، **ماالعولمة؟ الأقتصاد العالمي و امكانات التحكم**، ت: د. فالح عبدالجبار، دراسات عراقية، بيروت، ٢٠٠٩.
١١. بول ريكور، **الذات عينها كآخر**، ترجمة و تقديم و تعليق: د.جورج زيناتي، المنظمة العربية للترجمة، بيروت، ٢٠٠٥.
١٢. بومدين بوزيد(اعداد و تنسيق)، **فلسفة العدالة في عصر العولمة**، منشورات الأختلاف، الجزائر، ٢٠٠٩.
١٣. تشارلز تيللي، **الديمقراطية** ،ت: محمد فاضل طباخ، المنظمة العربية للترجمة،بيروت، ٢٠١٠.
١٤. جاكلين روس، **الفكر الاخلاقى المعاصر**، ت:د. عادل العوا، عويدات للنشر و الطباعة، بيروت،٢٠٠١.
١٥. جان مارك فيري، **فلسفة التواصل**، ترجمة عمر امهيبل، منشورات الاختلاف، الجزائر ٢٠٠٦.
١٦. جنفياف روديس لويس ، **ديكارت و العقلانية**، ت: عبدة الحلو ، منشورات عويدات ، بيروت- باريس،ط٤، ١٩٨٨.
١٧. جون ر. بورر و ميلتون جولدينجر (جمعها)، **الفلسفة و قضايا العصر**، ت: د.احمد حمدى محمود، الجزء الثانى،الهيئة المصرية العامة للكتاب، القاهرة، ١٩٩٠.
١٨. جون راولز، **العدالة كأنصاف**، ت: د. حيدر حاج اسماعيل، المنظمة العربية للترجمة، بيروت، ٢٠٠٩.
١٩. ديفيد هيلد، **نماذج الديموقراطية**، جزإن، ت: فاضل جتكر، معهد الدراسات الاستراتيجية،بيروت-بغداد، ٢٠٠٦.
٢٠. روبرت دال، **التحليل السياسي الحديث**، ت: د. علاء ابو زيد، مراجعة : د.على الدين هلال، مركز الأهرام للترجمة و النشر، ط ٥ بدون سنة.

٢١. رينه ديكارت، **تأملات ميتافيزيقية في الفلسفة الاولى**، ت:د.كمال الحاج ،منشورات عويدات، ط٤، بيروت-باريس،١٩٨٨.

٢٢. رينيه سرو، **هيغل و الهيغلية**، ت: د. ادونيس العكره، دار الطليعة للطباعة النشر، بيروت، ١٩٩٣.

٢٣. ستيفن ديلو، **التفكير السياسي و النظرية و المجتمع المدني**، ت: ربيع وهبة، مراجعة: علاء ابو زيد، المجلس الأعلى للثقافة، القاهرة، ٢٠٠٣.

٢٤. سپينوزا، **رسالة في اللاهوت والسياسة، ت**: د.حسن حنفي، مراجع: د. فؤاد زكريا، دار الطليعة، ط٤، بيروت،١٩٩٧.

٢٥. شيرزاد احمد النجار ، **دراسات في علم السياسة**، مطبعة وزارة الثقافة، اربيل، ٢٠٠٤.

٢٦. صامويل هانتنجتون، **الموجة الثالثة-التحول الديموقراطي فى أواخر القرن العشرين**،ت: د.عبدالوهاب علوب، مركز ابن خلدون للدراسات الأنمائية، القاهرة،١٩٩٣.

٢٧. عزالدين الخطابي ، **اسئلة الحداثة و رهاناتها- في المجتمع و السياسة و التربية**، منشورات الأختلاف ، الجزائر، ٢٠٠٩.

٢٨. عطيات ابو السعود ، **الحصاد الفلسفي للقرن العشرين** ، منشاة المعارف، الاسكندرية،٢٠٠٢.

٢٩. علاء طاهر، **مدرسة فرانكفورت من هوركهايمر الى هابرماس،** منشورات مركز الانماء القومى ،بيروت، بدون سنة.

٣٠. عمر مهيبل ، **اشكالية التواصل في الفلسفة الغربية المعاصرة**، منشورات الاختلاف-المركز الثقافي العربي، بيروت ، ٢٠٠٥.

٣١. عمر مهيبل ، **من النسق الى الذات**، منشورات الاختلاف ، الجزاير،٢٠٠٧.

٣٢. فالح عبدالجبار، **ما بعد ماركس** ، دار الفارابي، بيروت، ٢٠١٠.

٣٣. فردريش نيتشة ، **ماوراء الخير و الشر** ،ت: موسى وهبة ، الفارابى ، بيروت ، بدون سنة.

٣٤. الكسي دو توكفيل، **عن الديمقراطية في اميركا** ، ت: بسام حجار، جزء الثاني، معهد الدرسات الاستراتيجية، بغداد-بيروت، ٢٠٠٧.

٣٥. كولن فارلي، **مقدمة في النظرية السياسية المعاصرة**، ت: محمد زاهي بشير المغيربي و نجيب المجوب الحصادي، منشورات جامعة قاريونس، بنغازي، ٢٠٠٨.
٣٦. ليندا هتشيون، **سياسة مابعد الحداثية**، ت: د. حيدر حاج اسماعيل، المنظمة العربية للترجمة،بيروت، ٢٠٠٩.
٣٧. ماجد فخري، **ارسطوطاليس** ، المطبعة الكاثوليكية، بيروت، ١٩٥٨.
٣٨. محمد عابد الجابري ، **قضايا في الفكر المعاصر**، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ١٩٩٧.
٣٩. محمد نورالدين أفاية ، **الحداثة و التواصل في الفلسفة النقدية المعاصرة- نموذج هابرماس**، افريقيا الشرق ، ط٢ ، بيروت ، ١٩٩٨.
٤٠. منذر الشاوي، **الدولة الديموقراطية في الفلسفة السياسية و القانونية** ، شركة المطبوعات للتوزيع و النشر،بيروت، ٢٠٠٠.
٤١. ميشل ميتاس، **هيجل و الديموقراطية** ، ت: د. امام عبدالفتاح امام، التنوير للطباعة و النشر و التوزيع، بيروت، ٢٠١٠.
٤٢. هبرماس ، **القول الفلسفي للحداثة**، ت: د.فاطمة الجيوشي ،منشوات وزارة الثقافة في الجمهورية العربية السورية، دمشق ، ١٩٩٥ .
٤٣. هربرت ماركوزه، **العقل و الثورة** ، ت: الدكتور فؤاد زكريا، الهيئة المصرية العامة للتأليف و النشر، القاهرة، ١٩٧٠.
٤٤. هيجل، **اصول فلسفة الحق** ، ت: د. امام عبدالفتاح امام، الجزء الثاني، التنوير للطباعة والنشر و التوزيع، بيروت، ٢٠١٠.
٤٥. وليام ليلي، **مقدمة في علم الاخلاق**، ت: علي عبد المعطى محمد، منشأة المعارف، الاسكندرية، ٢٠٠٠.
٤٦. يورغن هابرماز ، **اتيقا المناقشة و مسألة الحقيقة**، ترجمة وتقديم: د. عمر مهيبل، الدار العربية و ناشرون و منشورات الأختلاف، الجزائر- بيروت، ٢٠١٠.

٤٧. يورغن هابرماس، **الحداثة وخطابها السياسي**، ت:د. جورج تامر، دار النهار للنشر، بيروت، ٢٠٠٢.

٤٨. يورغن هابرماس، **المعرفة والمصلحة** ، ت:حسن صقر، مراجعة: ابراهيم الحيدري، منشورات الجمل، كولونيا- المانيا،٢٠٠١.

٤٩. يورغين هابرماس ، **التقنية والعلم كأيدولوجيا– دراسة علمية** ، ت: د.الياس حاجوج، منشورات وزارة الثقافة في الجمهورية العربية السورية، دمشق،١٩٩٩.

٥٠. يورغين هابرماس، **التقنية والعلم كأيدولوجيا** ت: حسن صقر، منشورات منشورات الجمل، كولونيا، ٢٠٠٣.


**ب. كتێبه فارسيەكان:**


٥١. ارسطو، **اصول حكومت آتن** ، ت: باستانی پاریزی، نشر علم، چ٤، تهران، ١٣٨٣(٢٠٠٤).

٥٢. ارسطو، **سیاست** ، ت: د. حمید عنایت، شرکت سهامی کتابهای جیبی، چ٣، تهران، ١٣٥٨(١٩٧٩).

٥٣. استیون وایت ، **خرد، عدالت و نوگرایی- نوشته‌های اخیر یورگن هابرماس** ، ت: محمد حریری اکبری ، نشر قطره ،تهران، ١٣٨٠(٢٠٠١).

٥٤. افلاطون، **دوره اثار افلاطون**، ت: محمد حسن لطفی، جلد ٢، شرکت سهامی انتشارات خوارزمی،چ٣، تهران،١٣٨٠(٢٠٠١).

٥٥. آنتونی گیدنز، **جامعه‌شناسی** ، ت: منوچهر صبوری، نشر نی ، چ ١٦، تهران، ١٣٨٥(٢٠٠٦).

٥٦. آنتونی گیدنز، **راه سوم – بازسازی سوسیال دمکراسی** ،ت:منوچهر صبوری کاشانی، شیرازه، تهران، ١٣٧٨(١٩٩٩).

٥٧. آنتونی گیدنز، **چشم اندازهای جهانی**،ت: محمد رضا جلائی پور، گرح نو، تهران، ١٣٨٤(٢٠٠٥).

۵۸. اندرو لوین، **طرح ونقد و نظریه لیبرال دمکراسی** ، ت: د.سعید زیبا کلام، سازمان مطالعه وتدوین کتب علوم انسانی دانشگاهها، تهران، ۱۳۸۰(۲۰۰۱).
۵۹. ایو کوسه و استفن آبه، **واژگان مکتب فرانکفورت** ، ت: افشین جهاندیده، نشر نی، چاپ ۲، تهران، ۱۳۸۹(۲۰۱۰).
٦۰. بابك احمدی ، **مدرنیته و اندیشه‌ی انتقادی** ، نشر مرکز، چاپ ٦، تهران، ۱۳۸۵(۲۰۰٦).
٦۱. بابك احمدی ، **مارکس و سیاست مدرن** ، نشر مرکز، چاپی۳، تهران،۱۳۸۱(۲۰۰۲).
٦۲. تد بنتون و یان کرایب، **فلسفه‌ی علوم اجتماعی**، ت: شهناز مسمی و محمود متحد، مؤسسه‌ی انتشارات آگه، تهران،۱۳۸٤ (۲۰۰۵).
٦۳. توماس هابز، **لویاتان** ، ت: حسین بشیریه، نشر نی، چ۳، ۱۳۸۱(۲۰۰۲).
٦٤. تئودور و. ادورنو – **ماکس هورکهایمر،دیالکتیك روشنگری**،ت:مراد فرهادپور و امید مهرگان،گام نو،چاپ ۳ ، تهران،۱۳۸۷(۲۰۰۸).
٦۵. پیتر میلر ،**سوژه ،استیلا و قدرت** ، ت: نیکو سرخوش و افشین جهاندیده ، نشر نی، تهران ۱۳۸٤(۲۰۰۵).
٦٦. جان ار. گیبینز و بوریمر، **سیاست پست مدرنیته** ، ت: منصور انصاری، گام نو چ۲، تهران، ۱۳۸٤(۲۰۰۵).
٦۷. جان سیوارت میل، **حکومت انتخابی** ، ت:علی رامین، نشر نی، تهران، ۱۳۸٦(۲۰۰۷).
٦۸. حاتم قادری، **اندیشه‌ی سیاسی در قرن بیستم**، نشر سمت، تهران، ۱۳۸۵(۲۰۰٦).
٦۹. حسین بشیریه، **اندیشه‌های مارکسیستی** ، جلد اول، نشر نی، تهران، چاپ ۷،۱۳۸٦ (۲۰۰۷).
۷۰. حسین بشیریه، **لیبرالیسم و محافظه‌کاری** ، جلد دوم، نشر نی،چ۷، تهران، ۱۳۸٦(۲۰۰۷).
۷۱. حسینعلی نوزری، **بازخوانی هابرماس**، نشر چشمه ، تهران، ۱۳۸۱(۲۰۰۲).
۷۲. حسینعلی نوزری، **نظریه‌ی انتقادی مکتب فرانکفورت**، مؤسسة انتشارات آگه ، تهران، ۱۳۸٤(۲۰۰۵)
۷۳. د.منصور انصاری ،**دموکراسی گفتوگویی–امکانات دمکراتیك اندیشه‌های میخائیل باختین و یورگن هابرماس** ، نشرمرکز، تهران،۱۳۸٤(۲۰۰۵).

٧٤. ژان ژاك روسو، **قرارداد اجتماعی- متن و در زمینه متن** ، ژرار شومین، اندره سنیك، کلود مورالی، ژوزه مدینا، ت: مرتضی کلانتریان، مؤسسة انتشارات آگه، چ ٤، تهران، ١٣٨٥(٢٠٠٦).
٧٥. ژان فرانسوا لیوتار، **وضعیت پست مدرن – گزارشی دەربارە دانش** ، ت: حسینعلی نوزری، گام نو ، چ٢، تهران، ١٣٨١ (٢٠٠٢).
٧٦. رابرت آودی و مارشال برمن و ئەوانیتر، **پست مدرنیته و پست مدرنیزم** ، ت: حسینعلی نوزری، انتشارات نقش جهان، چ ٢، تهران، ١٣٨٠(٢٠٠١).
٧٧. رابرت هولاب، **یورگن هابرماس – نقد در حوزه عمومی** ،ت:د.حسین بشیریه ،نشر نی ، چاپ ٤ ،تهران ،١٣٨٦(٢٠٠٧).
٧٨. زیگمونت باومن، **اشارتهای پست مدرنیته** ، ت: حسن چاوشیان، انتشارات ققنوس، تهران، ١٣٨٤(٢٠٠٥).
٧٩. ژان فرانسوا لیوتارن، **پسامدرن برای بچەها**، ت: آذین حسین زادة، نشر ثالث، تهران،١٣٨٤(٢٠٠٥).
٨٠. سی. بی. مك فرسون، **سه چهره دموکراسی**، ت: مجید مددی، نشر دیگر، تهران، ١٣٨٢(٢٠٠٣).
٨١. شاهروخ حقیقی، **گذار از مدرنیته** ، مؤسسه انتشارات آگه، چ٣، تهران، ١٣٨٣(٢٠٠٤).
٨٢. گی ارمه، **فرهنگ و دیموکراسی**، ت: مرتضی ثافت، ققنوس، تهران، ١٣٧٦(١٩٩٧).
٨٣. فردریش نیچه، **فراسوی نیك و بد**، ت:داریوش اشوری ، شرکت سهامی خوارزمی، چاپ٣، تهران، ١٣٧٩(٢٠٠٠).
٨٤. کارل پوپر، **جامعه باز و دشمنان آن** ،ت: عزت الله فولادوند، انتشارات خوارزمی، چ٢، تهران،١٣٧٧(١٩٩٨).
٨٥. کلاوس مولر، **حاکمیت ، دموکراسی و سیاست جهانی**، ت: لطفعلی سمینو، نشر اختران، تهران، ١٣٨٤(٢٠٠٥).
٨٦. مایکل لسناف، **فیلسوفان سیاسی قرن بیستم** ، ت: خشایار دیهیمی، نشر کوچك، تهران، ١٣٧١(١٩٩٢) .

٨٧. مایکــل پیــوزی، **یــورگن هابرمـــاس**، ت: احمــد تــدین، انتشــارات هــرمس، تهــران، ١٣٧٩(٢٠٠٠).
٨٨. منصور میر احمدی، **اسلام و دمکراسی مشورتی**، نشر نی، تهران، ١٣٨٤(٢٠٠٥).
٨٩. منوچهر صالحی، **دمکراسی و جامعه مدنی**، انتشارات پژوهش ، هامبورگ،٢٠١٠.
٩٠. نصرالدین نانسی و حسین هرسیج، **پوپر و دموکراسی** ، انتشارات مهر قـائم، اصـفهان، ١٣٨٤(٢٠٠٥).
٩١. هیوبرت دریفوس، پل رابینوا، **میشل فوکو فراسوی سـاختگرایی و هیرمنیوتیـک** ، ت: حسین یریه، نشر نی، چ ٣، تهران، ١٣٨٢(٢٠٠٣).
٩٢. ویلیام اوث وایت ، **هابرماس- معرفی انتقادی** ،ت: لیلا جوافشانی و حســن چاوشـیان، نشر اختران ، تهران.
٩٣. یورگن هابرماس، **بحران مشروعیت – تئوری دولت سرمایەداری مـدرن** ، ت: جهـانگیر معینی، گام نو، تهران، ١٣٨٠(٢٠٠١).
٩٤. یورگن هابرماس ، **نظریه کنش ارتباطی-عقل و عقلانیت جامعـه**، جلد ١ ، ت: کمـال پولادی ، انتشارات مؤسسه ایران ، تهران ،١٣٨٤ (٢٠٠٥).
٩٥.یورگن هابرماس ، **نظریەی کنش ارتباطی - جهان زیسـت و نظـام** ، جلـد ٢، ت: کمـال پولادی، انتشارات مؤسسه ایران ، تهران ،١٣٨٤(٢٠٠٥).
٩٦. یورگن هابرماس، **جهانی شدن و آیندەی دمکراسی – منظومــەی پسـاملی**، ت: کمـال پولادی، نشر مرکز، چ ٣، تهران، ١٣٨٤(٢٠٠٥).
٩٧. یورگن هابرماس، **دگرگونی ساختاری حوزه عمومی - کاوشی در باب جامعه بوژوایی** ، ت: جمال محمدی، نشر افکار، چاپ ٣، تهران، ١٣٨٨(٢٠١٠).
٩٨.یوسف اباذری، **خرد جامعەشناسی** ، طرح نو، چ ٢، تهران، ١٣٨٧(٢٠٠٨).

## III. تێزی دکتۆرای بلاۆنەکراوە:

٩٩.شوان عمر خليل ، **العقلانية و الدولة القانونية- دراسة في الفكر الفيلسوف الالماني المعاصر يورغن هابرماس**، اطروحة الدكتوراة غير منشـورة، جامعـة صـلاح الـدين-اربيـل، كليـة قانون والسياسة، ٢٠٠٩.

١٠٠. محمد الأشهب ، **مذهب التواصل في الفلسفة النقدية ليورغن هابرماس** ، اطروحة الدكتوراه في الفلسفة، غيرمنشورة ، جامعة سيدي محمد بن عبدالله ، فاس ، السنة الدراسية ٢٠٠٦ -٢٠٠٧.

## IV. گۆڤار و رۆژنامەکان:

### بەعەرەبی:

١٠١. ابراهيم الحيدري ، **هابرماس الفيلسوف الألماني: هناك اورثودكسية متحجرة في الغرب كما في الشرق**، جريدة الشرق الأوسط، العدد ٨٣٦٥، ٢٣/اكتوبر/٢٠٠١.

١٠٢. حسن مصدق ، **أسس علم التواصل في الفكر الألماني المعاصر** ، مجلة العرب والفكر المعاصر، دار الأنماء القومي ، بيروت، العدد ١٣٠-١٣١.

١٠٣. رينر روشلتز، ماركس، **هابرماس و الديمقراطية الراديكالية** ، ت: سليم قندلفت، مجلة الفكر السياسي، مجلة فصلية تصدر عن اتحاد الكتاب العرب، العدد ٨، دمشق ، شتاء ٢٠٠٠.

١٠٤. ستيفان هابر، **هابرماس: سبل الديمقراطية الراديكالية**، ت: محمد سهمي، مجلة فكر و نقد، عدد ٢٩.

١٠٥. مالفي عبدالقادر، **مفهوم الديمقراطية عند هابرماس**، مجلة اوراق فلسفية، عدد ١٠،القاهرة، ٢٠٠٤.

١٠٦. يورغن هابرماس، **ثلاثة نماذج معيارية للديمقراطية**، ترجمة و تقديم: محمد الأشهب، مراجعة: د.عزالدين الخطابي، منشور في مجلة (ثقافات)، مجلة علمية محكمة تعني بدراسات الثقافية تصدرها كلية الآداب بجامعة البحرين، العدد ٢٢، سنة ٢٠٠٩.

### به فارسی:

١٠٧. جوشا كوهن، **مشورت و مشروعيت دمكراتيك** ، ت: سيد على اصغر سلطانى، فصلنامه فرهنگ انديشه، سال ٢، شماره ٥، بهار ١٣٨٢(٢٠٠٣).

١٠٨.يورگن هابرماس، **علم و تكنولوژى در مقام ايدئولوژى**، مجله ارغنون ،فصلنامه فلسفى ادبى فرهنگى، تهران، شماره ١ ١٣٨١(٢٠٠٣).
١٠٩.يورگن هابرماس، **سيطره عمومى** ، ت: هاله لاجوردى، فصلنامه فلسفى، ادبى، فرهنگى ارغنون، تهران، شماره ٢٠.

## V. **كتێبه ئينگليزييه‌كان:**

110. Adorno. Th. & Horkheimer. M., **Dialectic of Enlightenment**, N.Y, the Seabury Press,1972.

Articl:
Article:

111. Barber, Benjamin, **Jihad vs. McWorld**, New York. 1995.
112. Benhabib, Seyla (editor), **Toward a Deliberative Model of Democrati legitimacy**, in Democracy and diffrence ,contesting the boundaries of the Political , Princeton University Press, Princeton, New Jersey,1996.
113. Cohen Joshua, **Procedure and Substance** in Deliberative Democracy, in Democracy and Difference.
114. Cohen, Jean : « **Discourse ethics and civil society** » in volum. III, p : 209.
115. Colin Farrelly, **Introduction to Contemporary Political Theory**, SAGE Publications, London, Cromwell Press, Trowbridge, Wiltshire, SAGE Publications Ltd, 2004.
116. David Held ,**Models of Democracy**, Polity Press, Cambridge, UK, 1988.
117. Gatt ,Helena , **Democracy in Practice** ,Routledge, USA and Canada.

118. Glenn p. Hastedt , **American Foreign Policy-Past ,Present, Future**, Jemes Madison University, 2006.p7.
119. Green, Philip (ed), **Democracy –Key Concepts in Critical Theory**,NewJersey, Humanities Press, 1993.
120. Habermas, Jürgen ,**The Future of Human Nature** ,Polity press,Cambridge,UK,2003.
121. Habermas, Jürgen ,**The Structural Transformation of the Public Sphere** ,translated by Thomas Burger with the assistance of Frederick Lawrence ,MIT Press ,Fifth printing ,Massachusetts, USA ,1992.
122. Habermas, Jürgen ,**Theory and Practice** ,Translated by Jhon Viertel ,Beacon press , Boston.
123. Habermas, Jürgen, , ,**Three Normative Model of Democracy** ,Constellations Volume I, No I, 1994.. Published by Blackwell Publishers, I&9 Cowley Road, Oxford OX4 IJF, UK and Cambridge, MA 02142, USA.
124. Habermas, Jürgen, **Between Facts and Norms**, Contributions to a Discourse Theory of Law and Democracy, translated by William Rehg, The MIT Press, Cambridge, Massachusetts, Second printing, 1996.
125. Habermas, Jürgen, **Communication and the Evolution of Society**, Translated by Thomas McCarthy,Beacon Press,Boston,1979.
126. Habermas, Jürgen, **The Postnational Constellation -Political Essays** ,translated by Max Pensky, Polity Press, Cambridge, Massachusetts,2001.
127. Habermas, Jürgen, **the Theory of Communicative Action -Reason and the Rationalization of society** ,Volume1,Translated by Thomas McCarthy, Beacon Press, Boston,1984.
128. Horkheimer,**the Eclipse of Reason** ,Continun , New York, 1974.
129. Joseph Schumpeter, Capitalism, Socialism and Democracy,2nd ed, New York ,1947.

130. Kearney, Richard and Dooley, Mark, **Questioning Ethics**, Contemporary debates in philosophy, Routledge , London and New York, 1999.
131. Pusey, Michael ,**Jurgen Habermas** ,Routledge , New York and London , 2003.
132. Steven Whealty, **Deliberative Democracy and Minorities**, EJIL,Vol.14,No.3-507-527,2003,P.4.
133. Weber, Max, **the Theory of Social and Economic Organization**, trans. by A. M. Henderson and t. Parsons, Oxford Univ. Press،, 1947.

VI. **کتێبە ئەڵمانیەکان:**

134. Habermas, Jürgen, “**Drei Normative Modelle der Demokrate** ” in
Jürgen Habermas, Die Einbeziehang des Anderen: Studien Zur politischen Theorie, Suhrhump,f/m, 1996.
135. Habermas, Jürgen, **Strukturwandel der Öffentlichkeit**,F /M ,1990.
136. Jürgen Habermas, **Faktizität und Geltung**, Beitrage zur Diskurstheorie des Rechts und des demokratischen Rechtssaats, Suhrkamp, Frankfort, 1994.

## VII. ماڵپەڕی ئینەرنێت:

**وتـاری عربی:**

**١٣٣. ابراهيم الحيدری ، مدرسة فرانكفورت.. تأسيس نظرية نقدية للمجتمع ، لەم سایتەی خوارەوە:**
http://www.bohothe.blogspot.com/2010/03/blog-post_27.html .

١٣٤. احمد اغبال، **الليبرالية السياسية و مسألة العدالة لدى جـون راولـز** ، لـەم سـايتە لـە ڕێکەوتی ٢٠١٠/١٢/٢٧وەرگیراوە : le blog www.sohpia.mht

١٣٥. جۆشوا کۆهن ، ماڵپەڕی تایبەت لەسەر سایتی ویکی پیدیا:

(http://en.wikipedia.org/wiki/Joshua_Cohen_(philosopher

١٣٦. دانيلو مارتوشلي، **يورغن هابرماس – العقلنة و الديمقراطية**، ت: ابراهيم بومسهولي، ل ١٨لـة ٢٥ پێشتر له گۆڤاری فكر و نقد ژماره ٤١ بلاْو كراوەتەوە ، لەم سايتە خوارەوە لە رێكەوتی ٢٠١٠/١٢/٥وەرگيراوە:
.http://www.fikrwanakd.aljabriabed.net

١٣٧. عبد الله السيد ولد أباه ،**المواطنة في عصر ما بعد الدولة الوطنية -مفهوم المواطنة الدستورية لدى هابرماس** ، لەم سايتە لە رێكەوتی ٢٠١٠/٨/١٢ وەرگيراوە
.http://www.altasamoh.net/Article.asp?Id=459

١٣٨. عزالدين الخطابي، **الأخلاق والحرية بين ضرورة الواجب وعقلانية التواصل الديموقراطي (من كانط إلى هابرماس)**، لەرێكەوتی ٢٠١٠/١٢/٢٢ وەرگيراوە لەم سايتەی خوارەوە:
http://www.altasamoh.net/Article.asp?Id=587

١٣٩. محمد الحاج، **من كانط إلى كارل أتو آبل : نحو أخلاقية النقاش** ، لە رێكەوتی ٢٠١١/٢/٢٠ لەم سايتەی خوارەوە وەرگيراوە:
.http://melhaj.maktoobblog.com/644816%D9%85%D9%86

١٤٠. ياسر قنصوه ،**الشرعية الديمقراطية في العالم الحديث (مرجعيات واعدة.. تطبيقات مراوغة**، لەم سايتەی خوارەوە لەرێكەوتی ٢٠١٠/٩/١١ وەرگيراوە:
http://www.altasamoh.net/Article.asp?Id=538.

**وتاری فارسی:**

١٤١. جلال حاجى زاده، **بازنمايى دموكراسى رايزنانه در انديشەهاى سياسى هابرماس، لەم سايتەی خوارەوە لە رێكەوتی** 16/12/2010 وەرگيراوە:
http://www.helwist.com/Nuseran/Celal%20Hacizade/11%20%207%2
.0%20Habermax.htm

١٤٢. دتلف هوستر، **هابرماس و سياست** ، ت: پريش كوششى ، لەم سايتەی خوارەوە لە رێكەوتی ٢٠١٠/١٠/٢١ وەرگيراوە:
http://www.aftab.ir/articles/view/religion/philosophy/c7c1250177134
_jurgen_habermas_p1.php

١٤٣. رۆژنامەی فارسی اَفتاب :

http://www.aftab.ir/articles/view/religion/moral/c7c1132049730p1.php/29\12\2010

١٤٤. سيد محمد ناصر تقوى، **الگوهاى دمكراسى** ، لـەم سـايتەى خـوار ووەو لـە رێكـەوتى ٢٠١٠/٦/١
http://www.hawzah.net/Hawzah/Articles/Articles.aspx?LanguageID=1&id=88528

١٤٥. عوضعلي سعادت، **هابرماس در دگرگونى حوزه عمومى**، ل ٢ له ١٣. لـەم سـايتەى خوارەوەلە رێكەوتى ٢٠١٠/٧/٢٢ وەرگيراوە:
http://www.sociogroup.parsiblog.com/-315834.htm

١٤٦. مارتين ليت، **يورگن هابرماس و ديموكراسى مشورتى** ، ت: مهدى براتعلى پـور، لـەم سايتەى خوارەوە لە رێكەوتى ٢٠١٠/٩/٣ وەرگيراوە:
http://www.hawzah.net/per/magazine/nm/index.htm.

١٤٧. محمـــد ضـــميران د. ، **دمكراســـى و حقـــوق انســـانى از نظـــر هابرمـــاس**، لەرێكـــــــــــــــەوتى٢٠١٠/١٢/١٦وەرگـــــــــــــــيراوە:
http://www.bazyab.ir/index.php?option=com_content&task=view.&id=37917&Itemid=43

١٤٨. يورگن هابرماس، **پايەهاى پيشا سياســى دولـت قـانونى دمكراتيـك**، ت: منوچـهر صالحى، لەم سايتە لەرێكەوتى ٢٠١٠/٩/١٥ وەرگيراوە :
http://www.manouchehr-salehi.de/My%20archiv/My%20Translationsarticle/Habermas-1.htm.

١٤٩. يورگن هابرماس، **دين در عرصه عمومى** ، لە رێكەوتى ٢٨ نۆڤەمبەرى ٢٠٠٥ ئـەم وتارەى پێشكەش كردووە لە كاتى وەرگرتنى خەلاٚتى هولبێرگ لە نـەرويج. ل ٢ لـە ١١ لەم سايتەى خوارەوە وەرگيراوە ، لە رێكەوتى ٢٠٠٩/٧/٢٢ :
http://www.maghal.com/bank/?p =74

## وتارى ئينگليزى:

١٥٠. روبرت دال، ماڵپەڕى تايبەت لەسەر سايتى ويكى پێديا:
.http://en.wikipedia.org/wiki/Robert_Dahl

١٥١. سيلا بن حبيب ، ماڵپەڕی تایبەت لەسەر سایتی ویکی پیدیا:
http://en.wikipedia.org/wiki/Seyla_Benhabib

١٥٢. فرانك میشلمان ، لەسەر سایتی ویکی پیدیا:
http://en.wikipedia.org/wiki/Frank_Michelman

## کورتەیەك لە ژیاننامەی یورگن هابرماس

یورگن هابرماس لە ١٨ی تەمووزی ١٩٢٩ لە شاری دوسیلدۆرفی ئەڵمانی لە دایك بووە، یەکێکە لە گەورەترین تیۆریسیەنەکانی فەلسەفە و هزری کۆمەڵایەتی هاوچەرخ کە بواری کارکردنی بەشێکی گەورەی پانتایی زانستەکان و تیۆرە جیاوازەکان لەخۆ دەگرێت. لە ساڵی ١٩٦١ لە مالبۆر پلەی ئوستازی بە دەست هێناوە. تێزی دکتۆراکەی (کە لەساڵی ١٩٥٤ بلاّو کراوەتەوە) سەبارەت بە ناتەبایی "رەها" و "مێژوو" بووە لە هزری شیلینگ دا. لە نێوان ساڵەکانی ١٩٦١-١٩٦٤ وانەی فەلسەفەی لەهایدیبێرگ وتوۆتەوە، و لە نێوان سالاّنی ١٩٥٦تا ١٩٥٩ لەقوتابخانەی فرانکفۆرت یاریدەدەری ئادۆرنۆ بووە و پاش ئادۆرنۆ و هۆرکهایمەر ماوەیەك بوو بە سەرۆکی ئەنیستیتوتی توێژینەوەی کۆمەڵایەتی زانکۆی گۆتێ کە دواتر بە قوتابخانەی فرانکفۆرت ناسرا. لە ساڵی ١٩٦٤- ١٩٧١ ئوستازی کورسی فەلسەفە و کۆمەڵناسی بووە لە زانکۆی فرانکفۆرت پاشان بووە بە بەڕێوەبەری دەزگای ماکس پلانك لە سترانگبێرگ، تا ئێستا لە ژیان دا ماوە و دەیان توێژینەوەی زانستی و کتێبی فەلسەفی نووسیوە کە هەندێك لە بەرهەمە گرنگەکانی بریتین لە:

- قوتابی وسیاسەت، بەهاوکاری لەگەڵ ل.ف. فرید بورگ، ش.ئولەر و ف.فیلیتس، ١٩٦١.
- گۆڕانی بونیادی پانتایی گشتی بۆرژوازی، ١٩٦٢.
- تیۆر و پراکتیك ، ١٩٦٣.
- تیۆری زانستی شیکاری و دیالێکتیك، ١٩٦٣
- لۆژیك و زانستە کۆمەڵایەتییەکان، ١٩٦٧.

- مەعریفە و بەرژەوەندی، ١٩٦٨.
- پەیوەندی و پەرەسەندی کۆمەڵگا، ١٩٧٩.
- تیۆری کردەی پەیوەندیکاری، بەرگی یەکەم، عەقڵ و بە عەقلانی کردنی کۆمــەڵگا، ١٩٧١.
- قەیرانی شەرعیەت لە سەرمایەداری پێشکەوتوودا، ١٩٧٣.
- تیۆری کردەی پەیوەندیکاری، بەرگی دووەم، سیستەم و جیهانی ژین، ١٩٧٣.
- بەرەو کۆمەڵگایەکی عەقلانی، ١٩٨٤.
- لە نێوان فاکت و نۆرمەکاندا، ١٩٩٢.
- مەنزومەی پۆست نەتەوەیی، ١٩٩٨.

| فەرهەنگۆك | | |
|---|---|---|
| English | العربية | کوردی |
| Discourse ethics | اخلاقيات المناقشة | ئەخلاقی گفتوگۆ |
| Morality | أخلاقية | ئەخلاقیەت |
| Will / volition | إرادة | ئیرادە / ویست |
| Good will | إرادة الخيرة | ئیرادەی چاکەخوازی |
| Euro centrism | مركزية الأوربية | ئیرۆسەنتەریزم |
| Fairness | انصاف | ئینساف |
| Other | الآخر | ئەویتر |
| Emancipation | تحرر | ئازادبوون |
| Commodity Exchange | تبادل السلع | ئاڵوویری کاڵا |
| Idealism | مثالية | ئایدیالیزم |
| Object | موضوع | بابەت |
| Objectivism | موضوعية | بابەتیەتی |
| Well-ordered | ذات التنظم الجيد | باش – ڕێکخراو |
| Better argument | أفضل الحجة | باشترین ئەرگۆمێنت |
| Political domination | هيمنة السياسية | بالادەستی سیاسی |
| Validity claim | ادعاء الصلاحية | بانگەشەی دروستی |
| Idealization | أمثلة | بە ئایدیالی کردن |
| Globalization | عولمة | بەجیهانی بوون |
| Institulization | مأسسة | بەدەزگایی کردن |
| Stateification of Society | دولنة المجتمع | بەدەوڵەتی بوونی کۆمەڵگا |

| | | |
|---|---|---|
| Democratization | الدمقرطة | بەدیموکراتی کردن |
| Knowledge-constitutive interest | المصـــالح الموجهـــة للمعرفة | بەرژەوەندی مەعریفەساز |
| Emancipator Cognitive Interest | مصـــلحة المعرفـــة المتحررة | بەرژەوەندی مەعریفەی رزگاریخوازانە |
| High-tech | تكنلوجيا العليا | بەرزە تەکنەلۆژیا |
| Productivity | إنتاجية | بەرهەمداری |
| Reification | تشييء | بەشت کردن/بەشت بوون |
| Public use of reason | الاستعمال العمومي للعقل | بەکارهێنانی گشتی عەقڵ |
| Socialization | تنشئة الاجتماعية | بەکۆمەڵایەتی کردن |
| Societalization of the State | جتمعة الدولة | بەکۆمەڵگایی بوونی دەوڵەت |
| Modernization | تحديث | بەمۆدێرن کردن |
| Instrumentalization | استعمال الأداتي | بەئامرازکردن |
| Inputs | مدخلات | بۆچوو |
| Neutralize | محايد | بێلایەن |
| Transcendence | متعال / استعلائي | ترانسێندنتال/بەرزێتی |
| Communicative competence | كفاءة التواصلية | توانستی پەیوەندیکاری |
| Reflection | تفكرية / تأملية | تێرامانی |
| Theory of communication | نظرية التواصل | تیۆری پەیوەندیکاری |
| Critical theory | نظرية النقدية | تیۆری رەخنەیی |

| Theory of consciousness | نظرية الوعي | تیۆری ئاگایی |
|---|---|---|
| Protectionism | نزعة الحمائية | پاراستنگەرایی |
| legal protection | حماية القانونية | پاراستنی یاسایی |
| Rationally justifying | تبرير العقلاني | پاساوی عەقلانی |
| Public sphere | فضاء العمومي / مجال العام | پانتایی گشتی |
| Bourgeois public sphere | فضاء العمومي البرجوازي | پانتایی گشتی بۆرژوازی |
| Political public sphere | الفضاء العمومي السياسي | پانتایی گشتی سیاسی |
| Literary public sphere | الفضاء العمومي الأدبي | پانتایی گشتی ئەدەبی |
| Veil of Ignorance | ستار الجهل | پەردەی نەزانی |
| Conversation | تحاور | پەیڤین |
| Interpersonally Relation | علاقة بين الشخصية | پەیوەندی نێوان کەسی |
| Distorted communication | تواصل المشوه | پەیوەندیکاری شێواو |
| Pragmatic | تداولية | پراگماتیك |
| Principle of rule of law | مبدأ دولة الحق والقانون | پرەنسیپی دەوڵەتی ماف و یاسا |
| Discourse principle | مبدأ المناقشة | پرەنسیپی گفتوگۆ |
| Moral principle | مبدأ الأخلاقي | پرەنسیپی ئەخلاقی |
| Democratic process | عملية الديمقراطية | پرۆسسی دیموکراتی |

| | | |
|---|---|---|
| persistent disturbances | اضطرابات الدائمة | پشێوی بەردەوام |
| Positivism | الوضعية | پۆزەتیڤیزم |
| post-metaphysic | مابعـــــــــــد الميتافيزيقية | پۆست- میتافیزیکی |
| Culture industry | صناعة الثقافة | پیشەسازی کلتور |
| Pre-political | ما قبل - سياسي | پێش-سیاسی |
| Public body | جسم العام | جەستەی گشتی |
| Community | جماعة | جڤاك |
| Ideal communication community | جماعـــة تواصـــل مثالية | جڤاکی ئایدیالی پەیوەندیکاری |
| - world-life | عالم المعيش | جیهانی ژین |
| -Prejudice or-prejudgment | الحكم المسبق | حوكمی پێش وەختە |
| - Moral Judgement | حكم الأخلاقي | حوکمی ئەخلاقی |
| - Subject of right | صاحب الحق | خاوەن ماف |
| - Solipsism | توحدية / متوحدية | خۆپەرستی |
| - subject | ذات | خود |
| Self-steering- | القيادة الذاتية | خود- سەرکردایەتی |
| Self-legislation | تشريع الذاتي | خود- یاسادانەری |
| - self-determination | تحديد الذاتية | خود-بڕیاردەری |
| - Autonomy | إستقلالية | خودموختاری/ ئۆتۆنۆمی |
| - self-consciousness | وعي الذاتي | خودئاگایی |
| - Justice as fairness | عدالة كإنصاف | دادپەروەری وەك ئینساف |

| | | |
|---|---|---|
| Intersubjective acknowledgement | اعتراف البيذاتي | دانپیانانی نێوانخودی |
| Output | مخرجات | دەرچوو |
| Communicative power | سلطة التواصلية | دەسەلأتی پەیوەندیکاری |
| Social welfare state | دولـــة الرفـــاه الاجتماعية | دەوڵەتی خۆشگوزەرانی کۆمەلأیەتی |
| Democratic state governed by law | دولة الحق والقانون الديمقراطية | دەوڵەتی ماف و یاسای دیموکراتی |
| Institutionalized opinion and will formation | تشـــكيل مأســـس لرأي العام | دروست بوونی دەزگایانەی رای گشتی |
| Formation Will and Opinion | تكـــوين الأرادة و الرأي | دروست بوونی ئیرادە و ڕا |
| Validity | صلاحية | دروستی |
| Rightness of moral norms | صـــحة المعـــايير الأخلاقية | دروستی نۆرمە کۆمەلأیەتیتەکان |
| Property-Owning Democracy | ديمقراطيـــة ملكيـــة الملكية | دیموکراسی خاوەنداری موڵکایەتی |
| Deliberative Democracy | ديموقراطيـــــــــة التشاورية | دیموکراسی راوێژگەری |
| Procedural Democracy | ديمقراطية الأجرائية | دیموکراسی رێکاریی |
| Mass Democracy | الـــــديمقراطيات الشعبية | دیموکراسی جەماوەریی |
| Good life | حياة الجيدة او الخيرة | ژیانی خۆش یان چاك |

| | | |
|---|---|---|
| Authenticity | صدق | راستگۆیی |
| Interpretation | تأويل | راڤە |
| Original situation | وضعية أصلية | ڕەوشی سەرەکی |
| Ideal speech situation / ideal discourse situation | وضعية مثالية للكلام | ڕەوشی ئایدیالی قسە |
| Enlightenment | الأنوار / التنوير | ڕۆشنگەری |
| Agreement | اتفاق | ڕێککەوتن |
| Late capitalism | رأسمالية متأخرة | سەرمایەداری ئەم دواییە |
| Social solidarity | تضامن اجتماعي | سۆلیدارێتی کۆمەڵایەتی |
| Utilitarism | المنفعة | سوودگەرایی |
| Politics of acknowledgement | سياسة الاعتراف | سیاسەتی دانپیانان |
| Deliberative politics | سياسة التشاورية | سیاسەتی ڕاوێژگەری |
| Context of the life world | سياق العالم المعيش | سیاقی جیهانی ژین |
| Legitimacy | شرعية | شەرعیەت |
| Identity | هوية | شوناس |
| Postnational identity | هوية ما بعد الوطنية | شوناسی پۆست نەتەوەیی |
| Public Goods | خير العام | چاکە/ خێری گشتی |
| Common good | خير المشترك | چاکەی هاوبەش |
| Presupposition of argumentation | الافتراضات الحجاجية | گریمانەی ئەرگۆمێنت خوازی |
| Publicity | عمومية | گشتیەت |

| | | |
|---|---|---|
| Representative publicness | عمومية التمثيلية | گشتییەتی نوێنەرانە |
| Practical discourse | مناقشة عملية | گفتوگۆی/گوتاری کردەیی |
| Discursive | خطاب | گوتار |
| Rationality | عقلانية | عەقلانیەت |
| Substantive Rationality | عقلانية الجوهرية | عەقلانیەتی جەوهەری |
| Formal Rationality | عقلانية الشكلية | عەقلانیەتی شکلی |
| Cognitive-instrumental rationality | عقلانية المعرفية- الآداتي | عەقلانیەتی مەعریفی_ ئامرازی |
| Normatively regulated actions and expressive | عقلانية المعيارية و التعبيرية | عەقلانیەتی نۆرماتیڤ و تەعبیری |
| Objective mind | عقل الموضوعي | عەقڵی بابەتی |
| Communicative reason | عقل التواصلي | عەقڵی پەیوەندیکاری |
| Practical reason | عقل العملي | عەقڵی کردەیی |
| Instrumental rationality | عقلانية الغائية / الأداتية | عقلانیەتی ئامانجدار/ئامرازی |
| Categorical imperative | الأمر المطلق | فەرمانی ڕەها |
| Multiculturalism | تعددية الثقافية | فرەکلتوری |
| Speech | كلام | قسە |
| Labor | عمل | کار |
| Interaction | تفاعل | کارلێك |
| Action | فعل | کردە |

| | | |
|---|---|---|
| Communicative action | فعل التواصلي | کردەی پەیوەندیکاری |
| normatively regulated action | فعـــل التنظيمـــي المعيارى | کردەی رێکخستنی نۆرماتیڤ |
| Strategic Action | فعل الستراتيجي | کردەی ستراتیژی |
| dramaturgical action | فعـــل المســـرحي/ درامي | کردەی نمایشی/دراماتیکی |
| Purposive Action | فعل الفائي | کردەی ئامانجدار |
| Speech act | فعل الغوي | کردەی زمانی |
| Elocutionary act | فعل الكلام | کردەیی قسەیی |
| Consensus | إجماع | کۆدەنگی |
| Cosmopolitism | كســـموبوليتية /كونية | کۆسمۆپۆلەتیزم/گەردوونی |
| Republicanism | نزعة الجمهورية | کۆماریخوازی/کۆماری |
| Alienation | اغتراب | لەخۆ بێگانەبوون/ نامۆبوون |
| Inclusive | شمول | لەخۆگر |
| Depoliticized | لاسياسي | لەسیاسەت خراو |
| Understanding | تفاهم | لێك تێگەیشتن |
| Privacy Right | حق أو قانون الخاص | مافی تایبەت |
| Subjective right | حق ذاتي | مافی خودی |
| Public Right | حق العام / قـانون العام | مافی گشتی |
| Macro- subject | ذات الكبرى/ماكرو ذات | ماکرۆ-خود |

| Meaning | معنى / دلالة | مانا / دەلالەت |
|---|---|---|
| Condition of validation | شروط الصلاحية | مەرجەکانی دروستی |
| Cognitive | معرفي | مەعریفی |
| Ego | انا | من |
| Historicity | تاريخانية | مێژوویەتی |
| Deregulate | غير المنظم | ناڕێکخراو |
| Moral norms | معايير الأخلاقية | نۆرمە ئەخلاقیەکان |
| Valid norm | معيار الصالح | نۆرمی دروست |
| Constitutional patriotism | وطنية دستورية | نیشتمانیەتی دەستووری |
| Intersubjectivity | بيذاتية ، تذاوت ، بين الذاتية | نێوانخودی |
| Medium | وسط/وسيط | نێوەند/نێوبەند |
| Citizenship | مواطنة | هاووڵاتی بوون |
| Multicultural citizenship | مواطنة التعددية الثقافية | هاووڵاتی فرەکلتوور |
| Totality | كلي | هەمەکی |
| All affected | كل المعنيين بالأمر | هەموو پەیوەندیدارەکان |
| Hermeneutics | هرمنوطيقا | هیرمنیرتیك |
| Facticity | واقع الفعلي / العيانية | واقعی بەرچاو/ داکەوتی بەرهەست |
| Integration | اندماج/ تكامل | یەکانگیری |
| Universalism | كونية/كلية | یونیڤێرساڵی/هەمەکی/گەردوونی |

